**ناسنامەی کتێب**

**ناوی کتێب: لە عیشقەوە بۆ عیشق**

**جۆر: ڕۆمان**

**نووسینی: جاسم زاری**

**دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆک: محەمەد جەبار**

**چاپخانە: تاران**

**ساڵی چاپ: ٢٠٢١**

**تیراژ: ٥٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی(٠) ساڵی (٢٠٢١) ی پێدراوە.**

لەکۆتاییدا مەولەوی و سیروان گەیشتنە پاڵدامێنی[١] ئەو شاخەی ئەشکەوتەکەی لێیە، دەمەو بوولێڵ بوو[٢]، خەریک بوو ڕۆناکی ئاسمان ئۆغری دەکرد و لێزمە بارانی پاییزو تەم و مژێکی سەرسەختیش ئێوارەکەی تاریکترو تاریکتر دەکرد.

گەڵای دارەکان هێندە وەری بوون نزیک بوو قاچیان لەنێو ئاو و گەڵا وەریوەکان ون بێ.

سیروان بەدەنگێکی لەرزۆکەوە هاتە گۆ: مەولەوی توخودا با بگەڕێینەوە، بەخوا ئێرە زۆر ترسناکە، تۆ نازانی کە گەڕامەوە دایک و باوکم چۆن سەرکۆنەم دەکەن. ئاخر کاتەکە زۆریش درەنگە برا، دیارە تۆ هەست بە ترسناکی ئێرە ناکەی؟

+ نەخێر، چۆن دوای تەی کردنی ئەم هەموو ڕێیە دەگەڕێمەوە هەی ترسنۆک. لەوە دەچێ جنۆکەکان تۆیان ترساندبێ، بابە تۆ لەگەڵ مەولەوی دای مەولەوی. لۆمەی دایک و باوکت بخە ئەستۆی من، خۆت دەزانی ئەوان چەندە منیان خۆشدەوێ.

- وەلێ مەولەوی ئێرە لە لێڕەوارێکی[٣] چڕو پڕ ترسناک ترە، دەکرێ کاتێکی دیکە بێینەوە، لێ لەم تاریکیە تازە چی بکەین؟

مەولەوی دەستەکانی گرت و توند گوشی و لەگەڵ خۆیدا وەڕێی خستە سەرێ.

+ هیچ قسەیەک نەکەی و کەمهان ماوە بگەین.

سەرکەوتنی شاخەکە تۆزێ ئەستەم بوو بۆ ئەو دوو لاوە، بەتایبەتی سیروان لەوەیە یەکەم جاری بێ بەسەر شاخێکی ئاوادا هەڵزنێ[٤].

لەپڕدا سیروان هاواری لێ هەڵسا: ئاااى مەولەوی تخوا بمگەیە، کورە نامەوێ بمرم ، هاوار تووشی چیت کردم، خێرا دەستم بگرە کەوتم.

تومەز پێکانی لەسەر بەردێ تووزیابوون[٥] و لە لم و قوڕ چەقی بوون.

---

١- پاڵدامێن: داوێنی شاخ و گرد.

٢- بوولێل: کاتی ئێوارە کەدونیا لەنێوان ڕووناکی و تاریکی دایە.

٣- لێڕەوار: دارستان.

٤- هەڵزنین: سەرکەوتن بەسەر شوێنێکی بەرز.

٥- تووزیان: خلیسکان.



مەولـەوی دەسـتەکانی گـرت و سـەری خسـتەوە و گوتـی: ئـەرێ کاکـە تـۆ مرۆڤـی، بەخـودا کەسـێ گـەر بکەوێتـە خـواری خوارەوە وا لـە قیـڕە نـادا، خەریـک بـوو زیـڕە بـە منیـش بکـەی.

- باشـە مەولـەوی پێـم بێـژە ئـەم پیرەمێـردە چـۆن توانیویەتـی ڕۆژانـە بێتـە ئێـرە هـا، باشـە ئـەوە نەترسـاوە؟

+ چەندیـن جـارم گـوت مەڵـێ پیرەمێـرد، ئـەو پیرەمێـرد نییـە، خـۆ خەڵـک وەک تـۆ ترسـنۆک نییـن.

لـەو کاتـەدا لـەدەرگا درا، لەگـەڵ تەقـەی دەرگاکـە ڕەنـج دەفتەرەکـەی دەسـتی دانـا و وازی لـە خوێندنـەوە هێنـا.

+ هـا سـاریا دیسـان ئـەوە تـۆی، پێـم بێـژە چیـت گەرەکـە وا ئـەو خوێندنـەوە بـە چێـژەت لـێ تێکـدام؟

- هێـی ڕەنـج ئێسـتا ماڵـی خاڵـۆ کامـەران دێـن. دایکـم گوتـی لـە ژوورەکـەی بێتـە دەرو تـۆزێ خـۆی ڕێـک و پێـک بـکاو لەگـەڵ میوانـەکان ڕووبنیشـێ، چـون ئێسـتا ئـەو تـەواو گـەورە بـووە.

+ وەلـێ سـاریا وا دەبینـی سـەرم قاڵـە و دەخوێنمـەوە، جگـە لـەوەش هەنـدێ وانـەی قوتابخانـەم لەسـەر ماوەتـەوە و دەبـێ لێیـان بڕوانـم.

- من ئەمە نازانم، دایکم گوتی گەر نەیێ خراپ لێی دڵگران دەبم ها.

ڕەنـج دەفتـەرە بچووکەکـەی ئاخنیـە نێـو جانتاکـەی و لەژێـر چارپاکـەی[6] دانـا و خەریکـی لەبەرکردنـی جلـە تازەکانـی بـوو. هەرچەنـدە زۆر وازی[7] لـەوە نەبـوو لەمەجلیسـی خاڵـۆی ڕووبنیشـێ، وەلـێ لەبـەر دڵـی دایکـی ناچـار بـوو. سـەرەڕای ئـەوەش ئـەو مرۆیەکـی هێنـدە تێکـەڵ نەبـوو، زۆربـەی کات لـەژووری بـوو جگـە لـەو سـاتە کەمانـەی لەگـەڵ هاوڕێکانـی بەسـەری دەبـرد.

وەلـێ چشـتێک بەتـەواوی بیـرو هۆشـی ڕەنجـی ئاڵـۆز کردبـوو، باشـە بۆچـی ئـەم چیرۆکـەی خەریکـی خوێندنـەوەی بـوو لەنێوەنـدی ڕا دەسـتی پـێ دەکـرد! دووبـارە

٦- چارپا: قەرەوێڵە.

٧- واز: حەز ، ئارەزوو



سەیرێکی لاپەڕەی سەرەتای کردەوە (لەکۆتایی دا مەولەوی و سیروان گەیشتنە......)، ئاخر چۆن دەبێ چیرۆکێک لەپەڕی یەکەمیدا بڵێ لە کۆتاییدا! دەبێ چەند لاپەڕەیەکیش پێشی ئەمە هەبووبێ، بەڵێ بەڵێ بێگومان دەبێ هەبووبێ. بەدەستەکانی لاپەڕەی یەکەمی دەهێناو دەبرد، سەیرە، خۆ هیچ نووسراوێکی دی لەپێش نییە ! تۆ بڵێی پەڕی یەکەمی لێ نەکەوتبێ، یان خرابێتە نێوەندی دەفتەرەکەوە؟ چووزانم، یان تۆ بڵێی چەند پەڕ لەپێش ئەمەوە هەبووبێ و ئەم دەفتەرە تیای نییە؟

باشە مامۆستا بۆچی چیرۆکێکی وای بۆ نووسیوم کە پاژی[8] سەرەتای تیا نییە؟!

دووبارە لاپەڕەکانی هەڵدانەوەو بەدوای پەڕی یەکەمدا دەگەڕا، نا هەرگیز نابێ، چۆن دەکرێ لاپەڕەی یەکەم کەوتبێتە کۆتایی، هەردەبێ ئەمە سەرەتابێ.

کێ ناڵێ هەر لەلای مامۆستا چەند لاپەڕەیەکی سەرەتا نەفەوتاون و درکی پێ نەکردوون و دەفتەرەکەی بەنیوەیی پێ بەخشیوە؟ هەموو ئەم ئەگەرانە لەئارادان.

لەپڕدا لەو دیوی دەرگا دەنگی دایکی ژنەوت[9]: کوڕم ڕەنج خێرا وەرەماڵی خاڵۆت گەیشتن، ناکرێ کوڕی گەورەی ماڵ هێندە کەنارگیربێ.

+ بەسەرچاو دایکە گیان، خەریک بووم جلە تازەکانم لەبەر دەکرد، ئەوا هاتم.

لەو کاتەدا ڕەنج هاتە دەرو بەرەو ژووری میوان وەڕێ کەوت.

+ بەخێرهاتن خاڵۆ کامەران گیان بەڕاستی ئاوەدانتان کردەوە، دەمێ بوو خۆتان ون کردبوو، ئێوەش بەخێربێن خاڵۆ ژن، خێرو بێرتان لەگەڵ خۆتان هێنا.

خاڵۆ کامەران هەڵیدایێ: وای لە ڕەنج، چەنێ گەنج و جوان بوویتە ! کاکە ئەمە بۆیە نایەیتە دەر مەبادا چاوێنی[10] لێت بدا، کورە خۆ قەیرێ بوو نەمدیبووی گیانی خاڵۆی.

خاڵۆژنە نەرمین لێی وەرگرتەوە: تۆ سەیری ئەم چاوە سەوزو باڵا ڕێکەی بکە، هەر بۆ ئەوە دەشێ بیکەین بەزاوای خۆمان.

---

٨- پاژ: بەش.

٩- ژنەوتن: بیستن ، ژنەوت: بیستی ، گوێی لێ بوو.

١٠- چاوێنی: چاوەزار.



ڤیانی کچیان کە ئەم گوتەیەی دایکی ژنەوت بەخەندەوە سەری داگرت و ڕەنجیش چون لاوێکی زێدە شەرمن بوو سوور داگەڕا.

خاتوو هاجەرەی دایکی ڕەنج گوتی: کوڕی ئێمە بەئاڵتوونیش ناکڕدرێ. نەمێنم بۆی لەکاتی گەنجیدا باوکیشی ئاوا ڕێک و جوان بوو، وەلێ قەدەری خوا زۆر بەیەکەوە نەبووین و ئەم نەخۆشیە لێمانی سەند.

بەهۆی ئەم قسەیەوە چاوەکانی تەژی[11] بوون لەئاو و بۆ تاوێ دەنگ لەژوورەکە بڕا.

خاڵۆ هاتەوە گۆ: دەی جا خۆ ئێمە بۆ پرسە نەهاتووین خوشکێ، خودا لێی خۆشبێ، ئەوەتا کوڕێکی قیت و قۆزی لەدوای خۆی جێهێشتووە شوکر.

لەدوای عەسرەوە تا بەرە بەری ئێوارە کۆمەڵێ گوتەی خۆش و خەندە ئامێز لەنێوان ئەم دوو خێزانە قەشەنگە گۆڕدرایەوە. خاتوو هاجەرەش کابانێکی چاک بوو، مەنجەڵێکی گەورەی دۆڵمە وەسەرنابوو کە خەریک بوو دێمی دەدا.

نانی ئێوارە هەموو لەسەر یەک خوان گردبوونەوە، خووانچەیەکی[12] گەورەی پڕ لەدۆڵمە کە بۆن و بەرامەکەی کۆڵانی دەتەنی. تێکڕا ستایشی دەستاوی خاتوو هاجەرەیان دەکرد کە چەندە کارامەیە لە چاخکردنی[13] چێشت دا.

دوای نوێژی شێوان ڕەنج خۆی لە مەجلیسەکە دزیەوەو خزایە ژوورەکەی، تا دەست بە خوێندنەوەی دەفتەرەکە بکاتەوە. لەنێو جانتاکەی دەری هێناو دووبارە کردیەوە، لێ هەر ئەوەندەی ویستی دەست بەخوێندنەوەی بکا دەرگای ژوورەکەی واڵا کرا.

ژیلوان و ژیار لێی وەژوور کەوتن، دوو کوڕی بچووکی خاڵۆ کامەران بوون و جمکەش بوون. بەجۆرێ چونیەک بوون کە ڕەنج نەیدەتوانی بەباشی بزانێ کامیان ژیلوانە و کامیان ژیار.

- ڕەنج گیان بابەم گوتی بچنە لای، بەڵکو هەندێ چشتی لێوە فێربن.

+ وەلێ گیانەکەم ئەوەتا من دەرسم هەیە، ئەی نابینی ئەوە دەفتەرە لەدەستم.

---

١١- تەژی: پڕ

١٢- خووانچە: سێنی.

١٣- چاخکردن: سازکردنی شت.



- بەڵام بابەم گوتی تۆ پوورزای ئێمەی، خۆ دەبێ کاتێکیشت بۆ ئێمە هەبێ، وەکو ئەو جارەی تر هەندێ چیرۆکت بۆ خوێندینەوە.

+ باشە گیانەکانم وەرن ئێستا چیرۆکێکتان بۆ دەخوێنمەوە.

ژیار گوتی: ڕەنج گیان تۆ ئەم هەموو کتێبەت لەکوێ بوو؟ ئەمانە هەمووی چیرۆکن، ئای چەندەم پێ خۆشە کە هەموویم بۆ بخوێنیەوە.

+ نا بابە گیان هەمووی چیرۆکی چی، چەند دانەیەکیان چیرۆکن، ئەوەیان مەسنەوی مەولانایە و ئەمەشیان ئیحیای ئیمامی غەزالیە و ئەوەیش دیوانی نالیە و ئیدی هەر یەکەیان جۆرە ناوێکی هەیە.

- ئەی کامیان چیرۆکە ڕەنج؟

+ ئەوەتا هەزارو یەک شەوەم دۆزیەوە، ئیدی ئەمە پڕیەتی لە چیرۆک، ئێستا دانەیەکتان بۆ دەخوێنمەوە. بمبوورن کە چیرۆکی مناڵانم نییە، بێژنە بابەتان کە بۆتان بکڕێ و شەوانە بۆتانی وەخوێنێ.

- ئاخر ڕەنج خۆت دەزانی کە بابەم تا ئێوارە لەکارە و تەنێ ڕۆژی هەینی لەماڵە، ئەویش هەر جارەو دەچێ بۆ جێگایێ. خۆت ئاگاداری ئیمڕۆ هەینیە و هاتووینە ماڵی ئێوە، شەوانەش ماندووە و زوو دەخەوێ.

+ باشە گیانەکانم، پێی بێژن کە هەندێ چیرۆکتان بۆ بسەنێ، ئینجا هەر جارێ کە هاتنە ماڵی ئێمە من بۆتانی دەخوێنمەوە.

ڕەنج ئەو شەوە پتر لەکاژێرێ خەریکی خوێندنەوەی چیرۆک بوو بۆیان، دڵیشی نەدەهات پاماڵیان[١٤] بکا. ئاخر ئەوان تەنێ ئەو کوڕە پوورەیان هەبوو، کەسێکی واش نەبوو گرنگی بەم منالانە بداو فێریان بکا. ئاخر منالْ لەم تەمەنە بچووکە (٥) ساڵیە وازی[١٥] لەچیرۆک و کۆمەڵێ فێرکاریە، لێ دایک و باوکان گرنگی بەفێربوونیان نادەن و لەبری ئەوە ئامێرە ئەلیکترۆنیەکانیان دەخەنە دەست ! چەندە جێگای سەرسامیە کەدایک و باوک بەدەستەکانی خۆیان داهاتووی منالەکانیان شلۆق بکەن !.

---

١٤- پاماڵ: پێشێل.

١٥- واز: حەز ، ئارەزوو.



ئـەم دوو پەپوولـە جوانـە لەکاتـی خوێندنـەوەی چیرۆکەکانـدا لەسـەر چارپاکـەی ڕەنـج خـەو بردنیـەوە.

دواتـر ماڵـی خاڵـۆش ڕۆشـتن و ڕەنجیـش ئیـدی توانـای خوێندنـەوەی دەفتەرەکـەی نەمابـوو ، هـەر زوو خـەو کەوتـە چاوانـی.

بەیانـی زوو لەخـەو هەڵسـاو دوای خواردنـی نانـی بەیانـی بـەرەو قوتابخانـە کەوتـە ڕێ. ئـەو تـازە پێـی لـە قۆناغـی ئامادەیـی نابـوو، تەنـێ مانگـێ بـوو کـە پشـووی هاویـن کۆتایـی هاتبـوو، دەرکـی قوتابخانـەکان واڵا کرابـوون. ئـەو ڕۆژە لەقوتابخانـە هـەر بیـری لای دەفتەرەکـەی بـوو، بـەزۆر خـۆی دەهێنایـەوە تـا کاریگـەری لەسـەر وانەکانـی نەبـێ، تەنانـەت ئـەو ڕۆژە هێنـدە بیـری لای حەبیبـەش نەبـوو.

لەکاتـی گەڕانەوەیـدا بـەرەو ماڵـێ ئەحمـەد یـاوەری بـوو، چـون ماڵـی ئەویـش هێنـدە لەماڵـی ڕەنـج دوور نەبـوو، ئـەوان لەگەڕەکـی سـوورتاوی شـاری ئەختـەر دەژیـان.

لەڕێـگادا ئەحمـەد هاتـە گـۆ: هێـی ڕەنـج بیـرت نەچـێ کـە دوای عـەسر یـاری تۆپـی پێـمان هەیـە و بڕیـارت دابـوو بێـی.

+ ئەها چاکت کرد بیرت خستمەوە، بەخوا هەر بیریشم نەمابوو.

- دەزانی ڕەنج قەیرێکە هاوڕێیانت لەیاد کردووە و گرنگی بەکاروبارەکانیان نادەی.

+ یەکجار واش نییە، لێ ئەم ماوەیە زۆر بیرم لای خۆم نەبووە و سەرقاڵ بووم.

- دیسان حەبیبەیە؟

+ کورە دانیشە بابە، لای تۆ وایە هەموو ژیانی من هەر حەبیبەیە دیارە.

- چووزانم، گوتم نەبادا بەم ئاخرو ئۆخرە نالیەکی دیکەمان لێ هەڵسێتەوە.

بـەم گوتەیـە هـەردوو دایانـە قاقـاو هەریەکەیـان بـەرەو مـاڵ شـۆڕبوونەوە. چـون کاتـی نوێـژی نیـوەڕۆ بـوو ڕەنـج لای دایـە ئـەو مزگەوتـەی نزیـک ماڵـێ، وەلـێ لـەوە دڵگـران بـوو کـە ئیـتر مامۆسـتاکەی نابینـێ، ئـەو کەسـەی هەمـوو جـار لەسـووچێکی مزگەوتەکـە بانگـی ڕەنجـی دەکـردو بـازێ جاریـش لـەدواوە بەبـەری دەسـتی چاوەکانی دەگـرت.



ڕەنـج گەیشــتەوە ماڵــێ و ســەلامی لەدایکــی و ســاریای خوشــکی کــرد، کاتــی نانــی نیــوەڕۆ بــوو، خێــرا شــۆرباکەی خــواردو بــەرەو ژوورەکــەی خزانــدی.

دایکــی گوتــی ؛ بــەرەو کــوێ دیســان؟ خــۆ نەبوویتــە بایەزیــدی بوســتامی لێـہان ئەوەنــدە لــە خەلــوە دای.

+ دایــە گیــان چەنــد ڕۆژێکــە دەرســی قوتابخانــەم لەســەر ماوەتــەوە و دەبــێ بــۆ عــەسر تــەواوی بکــەم، چــون دەمــەوێ عــەسرێ لەگــەڵ ئەحمــەدوان بڕۆمــە یــاری.

- هەرچۆنێک دەیڵێی کوڕی ئازیزم، وەلێ با کاتێکیشت بۆ ئێمە هەبێ.

ڕەنــج گەڕایــەوە و دەســتی دایکــی ڕاموســی و[16] بــەرەو ژوورەکــەی وەڕێ کــەوت، تاکــو عــەسر مژووڵــی[17] وانەکانــی بــوو. ئــەو جلــە ســوورانەی کەبــۆ یــاری کڕیبوونــی دەری هێنــان و پۆشــینی و بــەرەو لای ماڵــی ئەحمــەد هەنــگاوی هەڵگــرت.

لەوێ چاوی بە عەلیش کەوت و هەرسێکیان بەرەو یاریگاکە تێیان تەقاند.

لەڕێــگادا عەلــی گوتــی: ئــەرێ ڕەنــج بەڕاســت چیــت کــردەوە لەگــەڵ ئــەم کچــە، قــەرار نییــە ئــەوەی لەدڵتایــە پێــی بێــژی؟

+ نازانــم، مــن هیــچ کات گفتوگــۆم لەگــەڵ کچانــدا نەبــووە و زۆریــش شــەرم دەکــەم، چ جــای ئــەوەی بابەتێکــی وا بدرکێنــم، ئــەم بابەتــە هــەر تــۆو ئەحمــەد دەیزانــن، تکایــە بــا لەنێوانمــان دزە نــەکات، حەبیبــە تابڵێــی کچێکــی بەحەیــاو حیشــمەتە، نامــەوێ نــاوی بکەوتــە ســەر زاران.

- کــورە ئــەوە چــی دەڵێــی بابــە، مەگــەر ئێمــە هــەر بــرات نەبوویــن، دڵنیاشــبە لەشــوێنی چــۆڵ باســی لێــوە ناکەیــن.

هەرســێ تریقانــەوە[18] لەخۆشــیان و ســەرەنجام گەیشــتنە یاریــگا. هەمــوو لــەوێ ئامادەبــوون، جەبــارو یاســین و دلێــرو شــەوکەت و کۆمەڵێکــی دیکــە لەهاوڕێیانــی قوتابخانــە، ئینجــا بوونــە دوو تیــپ و دەســتکرا بەیــاری.

---

١٦- ڕامووسین: ماچ کردن.

١٧- مژووڵ: سەرقاڵ.

١٨- تریقانەوە: پێکەنین بەدەنگی بەرز.



عەلی بە پێکەنینەوە هاواری کرد: هێی یاریزانان، تکایە ئاگاداری ڕەنج بن، ئەو تۆزێ ناسکترە لەئێمەو عاشقیشە، پێم وابێ بەنەستەلە و چشت گەورە کراوە.

+ کورە عەلی کەی کاتی ئەوەیە، بڕۆ تۆپەکەی لێ وەرگرە خەریکە گۆڵمان لێ بکەن.

یاریەکە بەرەو کۆتایی دەچوو، (٥-٣) بوو، تیپەکەی ڕەنج دوو گۆڵی پتربوو لەتیپی شەوکەت. تەنێ چەند خولەکێکی مابوو فیکەی کۆتایی لێ بدرێ، ڕەنج بەرەو تۆپەکە ڕۆشت و پێکانی لەپێی دلێر ئاڵاو کەوت بەزەویداو لەهارژنی دا[١٩].

یاریەکە ڕاگیراو هەموو لەدەوری ڕەنج گردبوونەوە، داخوا چی لێ بەسەر هات.

ئەحمەد گوتی هاوڕێیان پێم وابێ پێکانی زۆر ئازاری پێ گەیشتووە، پێویستە بیبەین بۆ نەخۆشخانە.

ڕەنج کە پاڵی دابوویەوە گوتی پێویست بەوە ناکاو پەرتەی لێ بکەن، تەنێ تۆزێ ئازاری هەیەو تەواو، هیچ ڕووی نەداوە.

یاریەکە بەبردنەوەی تیپی ڕەنج کۆتایی هات و هەموو بەرەو ماڵ بوونەوە، وەلێ پێکانی ڕەنج ئازاریان زۆربوو، بۆیە دەبوو ئەحمەد یاوەری بکا لەگەڕانەوەیدا.

ئەحمەد دەستی ڕەنجی خستە سەرشانی و یارمەتی دا بەرەو ماڵێ، کاتێ لەدەرگایاندا خاتوو هاجەرە دەرگاکەی واڵا کرد. ئەو دەمەی ڕەنجی دی بەم حاڵە گوتی: ئەی

لاڵ بم کوڕم، ئەوە چیت لێ هاتووە، خەریک بوو دەست بەگریان بکا، ڕەنج هاتەگۆ:

+ دایە گیان هیچ نییە، تەنێ قاچم تۆزێ ئێشی پێ گەییوە.

- ئاخر کوڕم دەڵێم مەڕۆن بۆ ئەم یاریە، دەفەرموو ئەمە ئەنجامەکەیەتی.

ئەحمەد گوتی: پوورە هاجەر دەی ئەمە دونیایە و هەموو دەم لەش ساغ نابین، تۆش ئەوەنە دڵت بە ڕەنجەوەیە ماڵت ئاوەدان. دەبا بیینە ژوورەوە ئەم هەژارە قاچی دەیەشێ.

---

١٩- هارژن: هاوار.




لەکاتی شەودا هەموو هاوڕێیان هاتن و سەردانی ڕەنجیان کرد، لەسەر چارپاکەی پاڵ کەوتبوو، پووره هاجەرە قاچی جوان بۆ پێچابوویەوە و چەوری کردبوو.

ئەو شەوە هێندە بەسەرهاتی قوتابخانەو گفتوگۆی بەتامیان بەزاردا هات، ڕەنج ئازاری قاچی لەیاد چووبوویەوە.

ئەحمەد گوتی: ئەدی سبەی بۆ قوتابخانە چی دەکەی؟

+ گەر باشتربووم هەوڵ دەدەم بێم، پێم وانییە ئازارەکەی زۆربێ.

- ڕەنج دەزانی بەیانی یەک شەممەیە، خۆ لەبیرتە مامۆستا حەسەن گوتی بۆ یەک شەممە هەر قوتابیەو دەبێ چشتێکمان پێشکەش بکا لەو بەهرانەی کە دەیزانن. من ڕۆبۆتێکم چێکردووە کە دەتوانێ سەری خۆی بلەقێنێ، زۆر وازم لێیە تۆش لەوێ بی و بیبینی.

عەلی گوتی: منیش گۆرانیەک دەچڕم کەئاوازەکەی خۆم دامناوە، یاسینیش دەیگوت کە تابلۆیەکی نایابم کێشاوە بۆ ئەم ڕۆژە.

ڕەنج گوتی: وەلێ من هیچم ئامادە نەکردووە، خۆ زۆریش وازم لێیە لەوێ بم و بەرهەمەکانتان ببینم، دەی هەرچۆنێک بێ خۆ دەگەیەنمە ئەوێ.

عەلی سەری بردە ژێر گوێچکەی و گوتی: تۆ بڵێی حەبیبەت چی ئامادە کردبێ؟

ڕەنج گوتی هششش هیچی دی نەڵێی باکەس نەیبیستێ، تازە وات کرد کە منیش خۆم ئامادە بکەم. ئای چاک لێ دەزانی کە چۆنم دەگری عەلی.

خاتوو هاجەرە گوتی: ها ئەمە چی پێ دەڵێی عەلی وا هانی ئەو کوڕە دەدەی بەقاچی شکاوەوە بچێ بۆ قوتابخانە، گەر ڕۆژێ نەڕوا خۆ دونیا تێک ناچێ.

+ هیچ نییە پووری، ڕەنج خۆی هێندە تامەزرۆی قوتابخانەیە و نایەوێ وانەکانی لەکیس بچن.

بۆ بەیانی ڕەنج هەڵسایەوەو هەستی کرد تۆزێ باشتر بووە، گەرچی هێشتا ئازاری زۆربوو. خێرا خۆی گۆڕی و دوو پەنیری خستە نێو سەموونێک و بەشەلە شەل بەرەو دەرگای حەوشە چوو.

خاتوو هاجەرە کەچاوی پێکەوت گوتی: شیرینەکەم چی دەبوو ئیمڕۆ کە ئازارت هەیە لەماڵەوە بووایت؟.

ڕەنج دەستی دایکی ڕاموسی و گوتی: دایە گیان، ئیمڕۆ ڕۆژێکی گرنگە بۆم، دەمەوێ لە بەرهەمی هاوڕێکانم بڕوانم.

هەرچۆنێ بوو خۆی گەیاندە قوتابخانەو هەر لەوانەی یەکەمدا مامۆستا حەسەن وەژوور کەوت.

+ سەلام هاوڕێیان، خۆتان دەزانن کە قەرار وابوو بۆ یەکشەممە بەهرەکانتان ببینم ، هەرچەندە وانەی ئێمە ڕێزمان و ئەدەبی کوردیە، لێ ئیمڕۆ نایخوێنین و چاوەنووڕی[20] ئێوەین کەیف سازمان کەن بەکارەکانتان.

لەڕیزی پێشەوە دەست پێ دەکەین، یەڵا هێژا بزانین تۆ چیت ئامادە کردووە؟

لەو ڕۆژەدا هەریەکەو توانای خۆی نومایان[21] دەکرد. یەکێ بەوێنەو تابلۆ، یەکێ بەسروودو گۆرانی، دانەیەکی دی بەنوکتەو قسەی نەستەق، هێندێکی دی کاری دەستیان کردبوو لەدروستکردنی ئۆتۆمبێلی بچووک و پایسکیل و ئاژەڵ و چەندین شتی دی.

ڕەنج چاوی لەحەبیبە بوو کەدەبێ چی پێشکەش بکا، لەدڵی خۆیدا گوتی ئیمڕۆ ڕۆژی منە کەتۆزێ ورە بدەمە بەر خۆم و شەرم نەکەم. بەڵێ بەڵێ نابێ لەبەر چاوی حەبیبەدا شەرمەزاربم. گەر ئەو عیشقەی لە دڵم دایە پێشکەشی ئەوی بکەم لە داهێنانی هەموویان گرنگترە، دەبێ چی گرنگتر بێ لە زیندووکردنەوەی عیشقێکی پاک لە زەمەنی مردنی عیشق و جوانیدا.

لەپڕدا مامۆستا حەسەن گوتی یەڵا نۆرەی حەبیبەیە، بزانین چی ئامادە کردووە.

حەبیبە هەڵسایەوە و ئەو عەزیەی لەدەستی بوو بەرزی کردەوەو گوتی:

- مامۆستا من بەدەستەکانی خۆم ئەم عەزیەی کچانەم دووریوە، شوکر شارەزاییم لەپیشەی دروومان هەیەو لەدایکمەوە فێری بووم.

---

٢٠- چاوەنووڕ: چاوەڕوان.

٢١- نومایان: دەرخستن.



+ ماشەڵا کچم بەڕاستی جوانت دووریوە، دەی هەمووتان چەپڵەی بۆ لێدەن، ئائەمە کارێکی جوانی کچانەیە کەزۆرم بەدڵ بوو.

ڕەنج بەچەشنێ لەعەزیەکەی دەستی ڕامابوو کە دەتگوت حەبیبە دڵی ئەوی لەدوای پەل پەل کردن دروومان کردووە و خەریکە نمایشی دەکا. لەلایێ کەیف خۆشبوو لەلایەکی دیکە سوور هەڵگەڕابوو، چون هیچی وای ئامادە نەکردبوو.

+ لەکۆتاییدا نۆرەی ڕەنجە، ئەم کوڕە قۆزە، دا بزانین چی بۆ ئامادە کردووین.

ڕەنج تادەهات سووریەکەی پتر دەبوو، ئاخر دەبوو لەبەردەم ئەم هەموو قوتابیە چ بێژێ ، بەتایبەتی کەحەبیبەش لەوێیە. لەدڵی خۆیدا گوتی دەی ڕەنج هەڵسە...

هەڵسە، ئێستا سەرەی تۆیە و دەرفەتێکە کە لەبەردەم حەبیبەدا گۆ بکەی.

+ دەی ڕەنج هەموو چاوەنووڕی تۆین.

- لەڕاستیدااا مامۆستا من ئەم ماوەیە زۆر سەرم قاڵ بوو، دواتر دوێنێ لەیاری تۆپی پێدا کەوتم و قاچم زۆر ئازاری پێ گەیی. ئیمڕۆ بەزۆر هاتووم بۆ قوتابخانە، بەتایبەت بۆ ئەوەی بەرهەمی هاوڕێیانم ببینم، وەخۆم چشتێکی وام ئامادە نەکردووە وەلێ هەرچۆنێ بێ هۆنراوەیەکی (نالی) تان بۆ دەخوێنمەوە.

+ باشە ڕەنج گیان، شوکر کەخۆت سەلامەتی، نەمزانیبوو گەرنا سەرێکم لێت دەدا. پۆزشەکەتمان قەبوولە و فەرموو بزانم چیمان بۆ دەڵێی.

ڕەنج هەڵسایەوە و لەو دەمەدا هەموو چاوەکان لەسەر ئەو بوون کەدەبێ چ بێژێ، حەبیبەش بەتایبەتی و بەشەرمەوە تێی دەڕوانی و چاوەنووڕی زاری ڕەنجی دەکرد.

ڕەنج دەستی پێکرد بەدەنگە بەرزو خۆشەکەی:

جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا
(حەبیبە)ی ماڵیاوا ماڵی ئاوا

حەلاڵی بێ نیکاحی حووری عینم
بەجووتێ نازیری شەرع و فەتاوا

زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم
موبارەک حەجلە بێ بۆ بووک و زاوا

سـیـداقـی ڕوونمـاو ، وەسـڵـی شـاهـیـد
لەگەڵ شـایی کـەران بێ دەنگ و داوا

ویساڵی بێ کـەم و کـەیفی حـوزووری
لـە (نالی) گەر دەپرسی یـەعنی ئـاوا

ئـەو دەمـەی لێبوویـەوە هەمـوو ڕەنجیـان چەپڵـە ڕێـزان کـرد، کچەکانیـش سـەیری حەبیبەیـان دەکـرد و ورتـە ورتیـان لێـوە دەهـات لەژێـرەوە و زەردەکەنیـان[٢٢] دەکـرد.

حەبیبـەی شـەرمنیش کوڵمەکانـی سـوور هەڵگەڕابـوون و هێنـدە کەیـف سـازبوو لەژێـر لێـوەوە کەخەریـک بـوو شاگەشـکە دەبـوو، وەلـێ نەیدەوێـرا سـەر هەڵبـڕێ، دەیزانـی کـە ڕەنـج ئـەو شـیعرەی بـۆ ئـەو گوتـووە.

لەکۆتاییـدا ڕەنـج توانـی ئامـاژە بەخۆشەویسـتی حەبیبـەی بـکا بەبـێ ئـەوەی چ کـەس نەنگـی بنوێنـێ، چـون لەمەبەسـتی تـەواوی ڕەنـج نەدەگەیشـتن چەنـد کەسـێ نەبـێ.

لەڕێگای گەڕانەوە عەلی و ئەحمەد یاوەریان دەکرد.

ئەحمەد گوتی: ئای ڕەنج ئاخیری کاری خۆت کرد دەزانی.

عەلـی هەڵـی دایـێ: کـورە بەخـوا بەدڵـم بـوو، ئـا ئەمـە شـیعرە بـرا، بێنـە ماچێکـم دەیـە ڕەنجۆکـە، بەخـوا حەبیبـەت خسـتە هـەوا هـەی فێڵبـاز، تـۆ ئەمـەت چـۆن بـۆ هـات لـەم دەم و دەسـتە.

هەرسێ بەم گوتەیە دایانە قاقاو بەرەو ماڵ شۆڕ بوونەوە.

هـەر دوای نـان خـواردن ڕەنـج دەفتەرەکـەی مامۆسـتای بیرکەوتـەوە، چوویـە ژووری و لەژێـر چارپاکـەی[٢٣] دەری کـردو دەسـتی بـە خوێندنـەوەی کـرد.

جا لێرەدا ڕەنج لەگەڵ دەفتەرەکەی جێ دێڵین و چەند مانگێ دەڕۆینە دواوە.

---

٢٢- زەردەکەنی: زەردەخەنە.

٢٣- چارپا: قەرەوێڵە.



## (٢٠١٥)ی میلادی، گەڕەکی ئاشنا - ئەختەر – ئارا و باوکی

مامۆستا سیراج لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا کەم لەماڵەوە دەچوویە دەر، زیاتر حەزی لەنێو خێزانەکەی بوو، چون دەیزانی ئیدی هێندەی لەژیاندا نەماوە.

بۆیە لەئاخرو ئۆخرەکانی زۆر ئامۆژگاری خێزان و منداڵەکانی دەکرد، بەتایبەتی (ئارا) کە کوڕە گەورەی بوو، ئێستا ببوو بە (١٧) ساڵ، وە (ئانا) و (ئاریان) ی کچەکانی مامۆستا کە شەش ساڵ و هەشت ساڵان بوون، هەموویانی بەپەروەردەیەکی تۆکمە گۆش کردبوو. هەر لەمنداڵیەوە ئۆگری کتێبی کردبوون، منداڵەکانی دەبردنە ژوورەکەی خۆی کە لێوانلێو بوو لەکتێبی جوان و دانسقە. هەریەکەیان کتێبێکی دەخستنە دەست و پێشبڕکێی پێ دەکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاشنای کردبوون بەسروشتی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕۆژانە بەر لە بوولێڵ[٢٤] دەیبردنە نێو باخ و گوڵەکانی پێ دەناساندن.

لەگەڵ ئەوین و خۆشەویستی و چریکەی بولبول و قومریدا ڕای هێنابوون.

---

٢٤- بوولێڵ: کاتی ئێوارە کەدونیا لەنێوان ڕووناکی و تاریکی دایە.

هاوسەرەکەشی هەر لە نووکەڕا کچە بچووکەکانی فێری چۆنیەتی چێشت لێنان و دروومان و کاروباری ماڵەوە دەکرد.

ئارا پۆلی پێنجی ئامادەیی بوو، ئەگەرچی ڕەوتارێکی ئاینی لەباوکیەوە بۆ مابوویەوە، وەلێ تۆزێ لاسار بوو، دەی ئەمە پیشەی زۆرێ لەگەنجانە لەم تەمەنەدا.

کوڕێکی قژ ڕەشی چاو ڕەش و خاوەن باڵایەکی عەرعەری. تاڵی قژەکانی تا نەرمایی گوێچکەکانی دەهاتن، بەشێوازێ کاتێ سەبا پەرچەمی لادەبرد ڕوخساری وێنەی مانگ دەدرەوشایەوە لەژێریدا. ئەو موژانەی[25] هێندە درێژو ناسک بوون هەر دڵێکی ئەنگاوتە[26] کردبا ڕزگاری نەدەبوو.

لەبەر جوانیەکەی دایکی وازی لێنەبوو زۆر لەدەرەوە بێ، مەگەر بۆ قوتابخانەو بۆ مزگەوتیش بازێ جار دەرچووبا. وەلێ ئارا هەندێ جار بەنهێنی دایک و باوکی دەچوویە دەر بۆ نێو هاوڕێیانی.

هەمیشە مامۆستاکانی ستایشی زیرەکیەکەیان دەکرد، ئەمەش بۆ دایک و باوکی دەگەڕایەوە کە لەمناڵیەوە نیگابانی[27] بوون و ئاشنای خوێندنەوەیان کردبوو.

لە تەکنەلۆجیا و یاریە بێ بەهاکان دووریان خستبوو.

مامۆستا سیڕاج هەمیشە پێی دەگوت: ئارا گیان بیرت نەچێ کەتۆ ئاوێنەی منیت، گەر خوانەخواستە کارێکی نەشیاو ئەنجام بدەی واتا من کردوومە، چون تۆ پەروەردەی دەستی منیت و ئەوە نومایان[28] دەکەی کە لەمنی فێربووی.

ئاراش سەری دەچەماندەوەو دەستی باوکی ڕادەمووسی[29] و باوەشی لێ دەداو دەیگوت: بەڵێنت پێ دەدەم کە ڕوو سوورت بکەم بابە گیان.

ڕۆژێ مامۆستا سیڕاج بانگی ئارای کردو گوتی: باوانەکەم، قەیرێکە ئاگەدارم کە چاوت لەسەر (مەریەم)ی کچی پوورتە و ئەویش چاوی لەسەرتە. ماڵی پوورە (دالیا)ت خێزانێکی باشن و ئەویش وەکو دایکت دڵسۆزە و مەریەمیش هەر

---

٢٥- موژە: برژانگ.

٢٦- ئەنگاوتە: پێکران ، ئەنگاوتە کردبا: بی پێکابا.

٢٧- نیگابان: پاسەوان.

٢٨- نومایان: دەرخستن.

٢٩- ڕاموسین: ماچ کردن.

پـەروەردەی دەسـتی ئـەوە. مـن لاریـم نییـە کـە ڕۆژێ ئێـوە بـبن بـە هاوسـەر، گـەر خۆشـت دیـەت نەخسـتبا سـەری لـەوە بـوو مـن خـۆم ئـەوم بـۆ نیشـان کردبـای، وەلـێ نەمویسـت لـەو کاروبارانـەی تایبـەت بەخۆتـن تێکەڵـت بـم ئازیزەکـەم.

ئـەوەی دەمـەوێ بێـژم ئەوەیـە کـە هێشـتا کۆمەڵـێ قۆناغـی خوێندنتـان لەبەردەمـەو تـۆزێ زووە بـۆ هاوسـەرگیری ئێـوە.

لـەو ماوەیـەدا وریابـە و فڕوفێڵەکانـی شـەیتان لەخشـتەت نەبـەن و بـازێ پەیوەنـدی هەڵـەت پـێ دابنێـن.

هەرچەندە ڕۆڵەی خۆمی و چاکت دەناسم، لێ یاد خستنەوەش خراپ نییە.

- بابـە گیـان زۆر سوپاسـت دەکـەم بـۆ ئامۆژگاریەکانـت، بەڵێـن بـێ زۆر ئـاگاداری خۆم دەبـم، بمبـوورە کـە ئـەم بابەتـەم لەتـۆ شـاردبوویەوە، لەڕاسـتیدا دەمـێ بـوو دەمویسـت بۆتـی بدرکێنـم وەلـێ.....

+ وەلێ چی ئارا؟

- ئاخـر نازانـم بۆچـی مـرۆڤ کاتـێ عاشـق دەبـێ حـەزدەکات تەنیـا خـۆی بیزانـێ و کەسـی تـر نـا. دواتـر باوکـە ئێمـە لاویـن و کۆمەڵـێ واز و ئارەزوومـان هەیە کـە لەوەیە ئێـوە نەتانبـێ، یاخـود پێویسـتتان نەبـێ. دەزانـم کـە ئـەم کاری عیشـق و چشـتە لەوەیـە تـۆ بەباشـی سـەری لـێ دەرنەکـەی چـون تـۆ پـتر لەبابەتـە ئاینیەکانـدا قـاڵ بوویتـەوە، بشـم بـوورە کـە وا دەڵێـم، وەلـێ هـەر لەبـەر ئەمەبـوو ئـەم کارەم لێـت شـاردەوە.

مامۆسـتا سـیڕاج کـە ئەمـەی لەکوڕەکـەی ژنـەوت[30] زەردەخەنەیەکـی قووڵـی کەوتـە سـەر لێـوان. خەریـک بـوو ئەویـش دەچـۆوە ڕابـردوو و مناڵـی دەکەوتـەوە یـاد، بۆیـە بەهێمنـی گوتـی ( ئاراکەم...ڕاسـتت گـوت، بەڕاسـتی مـن سـەر لەعیشـق دەرناکـەم ).

دوای ماوەیـەک مامۆسـتا سەرئێشـە و تایەکـی گوپچـڕی[31] گـرت و کەوتـە نێـو جێـگا، بەداخـەوە کـە هێنـدەی نەبـرد لەتەمەنـی (٤٥) سـاڵیدا وەفاتـی کـرد.

بـەر لەمەرگـی هەمـوو خێزانەکـەی کۆکـردەوە و وەسـێتی بـۆ کـردن کـە تەقـوای خـودا بکـەن و لەسـەر پەرستشـەکانیان بـەردەوام بـن و واز لەخوێنـدن و وانەکانیـان نەهێنـن،

---

٣٠- ژنەوت: بیستی.

٣١- گوپچڕ: دژوار.

بە ئاراشی گوت کە ئاگاداری خوشکە بچووکەکانی بێ.

لەدوای مەرگی مامۆستا خێزانەکە تەواو شپرزەو بێ هێزبوون. گەرچی لەهیچیان کەم نەبوو چون لەلایەن حکومەتەوە مووچەی خانەنشینی کۆچکردوویان پێ دەدرا، جگە لەوەش دایکی ئارا ڕۆژانە بەکاری دروومانی مژووڵ[٣٢] بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ماوەیە بۆ خەمڕەوێنیماڵەوەیان چۆڵ نەدەبوو لەماڵە پوورو خاڵ و مام و خزمانی دی. وەلێ ئەوان گەوهەرێکی گرانبەهایان لەکیس چووبوو کە بەسەرپاکی[٣٣] دونیاش قەرەبوو نەدەکرایەوە.

دوای چەند ڕۆژێ کە حاڵیان ئاسایی بوویەوە، دایکی ئارا لە ئاتەک[٣٤] کوڕە تاقانەکەی ڕوونیشت و گوتی: ئازیزەکەم خۆت دەزانی کەباوکت هێندە زەنگین نەبوو تا سەروەتی زۆرمان بۆ جێ بهێڵێ، وەلێ کۆمەڵێ ڕەوشتی جوان و باڵای لەدوای خۆیەوە جێ هێشت.

ئەو دەفتەرەی دەیبینیت میراتی باوکتە، بەر لەمردنی پێی وتم پێتی بدەم، بێگومان بۆ ئەوەی بوو بیخوێنیتەوە، من نازانم چی لێ نووسیوە وەلێ ئومێد دەکەم سەروەتێکی گرانبەهابێ بۆ تۆ.

ئارا ئەسرین لەچاوانی دەتکا و بەهێمنی دەفتەرەکەی لەدەستی دایکی وەرگرت، هەر زوو بەرگەکەی تەڕکرد بە ئاوی چاوانی.

هەر ئەو ڕۆژە چووە ژوورەکەی و دەستی بەخوێندنەوەی کرد.

لەو دیو بەرگەکەیەوە بە ڕێنووسێکی گەورە نووسرابوو ( **بۆ ئارا گیان کە لەدوای مەرگی بابەی دەیخوێنێتەوە** ).

لەخوار ئەمەوەش وتەیەکی مەولانا جەلالەدین بەدەست و خەتێکی خۆش نەخشێندرابوو: ( **ژیان هیچ نرخێکی نییە بەبێ عیشق، هەرگیز لەخۆت مەپرسە چ جۆرە عیشقێکت دەوێ، ڕۆحی یان ماددی، خودایی یان دونیایی، ڕۆژاوایی یان ڕۆژهەڵاتی، ئەم دابەش کردنانە تەنێ بەرەو دابەش کردنی پترت دەبا** ).

ئارا خێرا بەپەرۆشەوە چووە سەر یەکەم بابەت کەبەم ناونیشانە دەستی پێ دەکرد:

---

٣٢- مژووڵ: سەرقاڵ.

٣٣- سەرپاک: سەرتاپا.

٣٤- ئاتەک: تەنیشت.





## ١٩٨٠ ی میلادی، دێی (شاخان)، سەرەتای منداڵی

ئێرە شاخانە، دێیەکی خنجیلانەی لێوانلێو لەجوانی، پڕە لە چیاو دۆڵ و کانیاوی گەورەی دڵڕفێن. باخ و ڕەزەکانی هێندە زۆرو چڕو پڕن وەکو لێڕەوارێک[٣٥] خۆی دەنوێنێ، هەموو جۆرە میوەیەکی تیایە، (ترێ، هەنجیر، قۆخ، هەڵووژە )، لەوەیە هەر لەبەر زۆری چیاکانی بێ بەشاخان ناوبراوە. ئاوی سازگاری ڕەوان لەژێر چیاکانیدا هەڵقوڵاون و بەبەردەم خانووە قوڕینەکاندا ڕێ دەکەن. بەجۆرێ باڵندەکان لەنێو ئاوەکەدا تەراتێنیانە[٣٦] هەر دەڵێی بەهەشتێکی بچووکە خودا لێرە ئافراندوویەتی.

ئێرە زۆر دوورە دەستە، بەجۆرێ کەوا دانیشتوانەکەی لەوەیە ساڵێ جارێ بچنە شارو بێنەوە، ئەویش گەر پێویستیەک لەئارادابێ.

پێم وابێ دانیشتوانەکەی هەر (٣٠٠) ماڵ دەبن، وەلێ بەشێوازێکی برایانە و خۆشەویستیەوە لەگەڵ یەک دەژین.

---

٣٥- لێڕەوار: دارستان.

٣٦- تەراتێن: هاتووچۆ بە هەڕاکردن.

(سـیڕاج) یەکێکـە لەمناڵانـی دێیەکـە، هەرچەنـدە لەدایـک و باوکێکـی نەخوێنـدەوار هاتۆتـە دونیـا، وەلـێ خـۆی زۆر وازی لـە خوێندنـەوە و زانسـتە.

باوکـی سـیڕاج (مـام سـلێمان) پیاوێکـی دیـاری دێیەکەیـەو لەگـەڵ (ڕەحمـە) خاتوونـی خێزانـی دوو کـوڕو دوو کچیـان هەیـە، کـوڕەکان (سـەلمان و سـیڕاج)، کچەکانیـش (سـارا و سەوسـەن) یـان نـاوە.

ساراو سەوسـەن هـەردوو چوونەتـە ڕێـگای خۆیـان و مـاڵ و مناڵیـان هەیـە و کچانـی گـەورەی مـام سـلێمانن، وەلـێ سـەلمان گەنجێکـی (١٨) سـاڵانە و ژینـی هاوسـەری پێـک نەهێنـاوە، سـیڕاجیش کـوڕی بچووکـی ماڵـەو تەمەنـی (١٠) سـاڵانە.

مـام سـلێمان مژووڵـی کاری کشـتوکاڵیە و سـەلمانی کوڕیشـی لەکاروبارەکانیـدا یارمەتـی دەدا، وەلـێ سـیڕاج قوتابیـە و باوکیـان تەنـێ دەیهـەوێ بخوێنـێ و نایباتـە سـەرکار لەگـەڵ خـۆی.

لەپۆلـی پێنجـی سـەرەتاییدا ڕۆژێـک سـیڕاج لەقوتابخانـە دەگەڕایـەوە، لەپڕێکـدا چـاوی کەوتـە سـەر کتێبێکـی کۆنـی پەڕپـووت کەلەسـەر خۆڵـی لێوارێکـی ڕێـگای دێیەکـەدا کەوتبـوو. وێدەچـوو فڕەیـان دابـێ، چـون کـەس ئـەم پەرتووکـە کۆنـەی ناوێ، سەرەڕای ئەوەش بەرگەکەی و سێ چوار لاپەڕەی سەرەتای فەوتابوون.

هەڵی گرتەوەو دەستی بەخوێندنەوەی کرد:

جـــــــوابی دایەوە فەرهادی غەمگین
وتـی بـە زاتی (رب العـالـمیـــــن)
تــــــاکو نەبینم شیرینی جەم جـــام
حـــۆریم بدەنێ لـــەمن بێ حـــەڕام

بەسـەرهاتی عیشـقی شـیرینی ئەرمـەن و فەرهـادی پاشـازادەی چیـن بـوو کەبە شـێوازی هۆنـراوە داڕێژرابوو.

سـیڕاج ئەمـەی زۆر لـەدڵ خۆشـبوو، لەوەیـە یەکـێ لەڕێبـواران هاتبێتـە ئـەم دێیـەو لێـی کەوتبـێ، چـون پێـم وانییـە چشـتێکی وا دانسـقە فـڕێ درێ.

خێرا گەڕایەوە ماڵێ و تا کتێبەکەی تەواو نەکرد لەسەر جێگاکەی هەڵنەستا.

خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـە سـیڕاجی بچووکـی غەمگیـن کـرد، وەلـێ لەگـەڵ ئەوەشـدا چێـژی پـێ دەبەخشـی و تـەزووی گەرمـی بەدڵـی بچووکیـدا دێنـا.

بـازێ جـار خـۆی لەجێـگای فەرهـادی پاڵەوانـی کتێبەکـە دادەنـا و بانگـی شـیرینی ئەرمەنـی دەکـرد ( هـۆ هـۆ شـیرین ئـەوە بۆچـی دڵـی فەرهـادت بـەر خەدەنـگان[37] خسـت، مەگـەر نازانـی دڵ خـۆی لەبـەر مـوژەی[38] دولبـەران ناگـرێ، خێـرا وەرە و دڵـی عاشـقەکەت مەشـکێنە).

لـەم دیـوەوە ڕەحمـە خاتوونـی دایکـی دەیبیسـت و دەیگـوت: ئـەوە چیتـە هەتیـوە، بـەم هاتـو هـاوارە هەموومانـت وەخەبـەر هێنـا، خـۆ لێـمان نەبوویتـە سیامەندو خەجـێ، بـەم تەمەنەتـەوە ئـەم وشـانە لەکـوێ دێنـی. بەخـوا ئێسـتا نەخـەوی بێـم زیوالانـت لـێ بەبـا دەکـەم، [39]چـاو چـاو لـەم تەمەنـەوە لێـمان بـووە بەچـی.

ئەمـە لەکاتێکـدا بـازێ جـار ڕەحمـە خاتـوون هـەر خـۆی لەمـاڵ بـوو کەدەیگـوت هەموومانـت وەخەبـەر هێنـا.

بەتیرێ دوو نیشانە چانییە ئەی ڕۆحـــەکەم شیرین
بەغەمزەی تاقە یەک تیری لەفەرهادو لەخوسرەو دا [40]

وای لێهـات سـیڕاج کتێبەکـەی لەگـەڵ خۆیـدا دەبـردە بـەردەم کانـی دێیەکـەو لـەوێ بـۆ هاوڕێیانـی دەخوێنـدەوە. (ئەمیـر)ی هاوڕێـی قوتابخانـەی وازی لـێ نەدەهێنـا و هەمـوو ڕۆژێ دەیگـوت دەبـێ بۆمـی وەخوێنـی، سـیڕاجیش هێنـدەی لـەدڵ خۆشـبوو کـە لـە خوێندنـەوەی وەڕەز نەدەبـوو.

هەنـدێ جـار ئـەم منداڵانـە ئەوەنـدە بەسـۆزەوە گوێیـان دەگـرت کـە چاوەکانیـان گریانـی تـێ دەزا، سـیڕاجیش وێنـەی مامۆسـتایەکی کارامـە بۆیانـی شـی دەکـردەوە، دەتگـوت چەندیـن سـاڵە خوێنـەرو ڕاڤـەکاری عیشـق و ئەوینـە.

ئیـدی سـیڕاج خۆشەویسـتی کتێبـی کەوتـە دڵـەوە، لـەوە گەیشـت کەهەمـوو پەرتووکـەکان وەکـو هـی قوتابخانـە وشـک نییـن. ئاخـر چـی دەبـوو ئەوانـەی

٣٧- خەدەنگ: تیر.

٣٨- موژە: برژانگ.

٣٩- زیوالانت لێ بەبا دەکەم: لێک و پێکت دەردێنم.

٤٠- ( نالی ).



قوتابخانەش کۆمەڵێ چیرۆک و پەندو نوکتە و قسەی نەستەقی تێدابووایە، هیچ نەبێ قوتابی جار جارە بەم چیرۆک و گوتە خۆشانە هزری چالاک دەبوویەوە بۆ وەرگرتنی وانەکان.

ڕۆژی هەینی سیراج و ئەمیر بڕیاریاندا پیاسەیەک بەنێو دێکەدا بکەن، بۆیە هەر بەیانیەکەی بۆ ژێر چیای (سوور) کەیەکێ بوو لەچیا بەرزەکانی دێ وەڕێ کەوتن.

لەژێرەوەیدا هێندە درەختی سەوزو ڕازاوە بەدی دەکران کە لەژمارە نەدەهاتن.

لەجوانیدا ئەم شوێنەیان ناونابوو (بەهەشتی بچووک )، هەردوو لەژێر درەختێکی بەرز ڕوونیشتن و سیراج گوتی: دەزانی ئەمیر لەوەتەی ئەم کتێبەم خوێندۆتەوە زۆر حەزم لەخوێندنەوەیە. کاشکی[41] چەند کتێبێکی دیکەشم دەبوون، وەلێ نازانم چۆن پەیدایان بکەم.

- سیراج تۆ عوسمان دەناسی؟

+ بەڵێ بۆ؟

- ئەو بۆی باسکردم کەجارێ لەگەڵ باوکی چوونەتە شار، بەشوێنێکدا ڕۆشتوون کە سەرپاکی[42] کتێب بووە، بەشێوازێک ون دەبووی دەنێویدا.

+ ئێ باشە خۆ ئێمە دەستمان نایگاتێ، کەواتە سوودی چییە؟

- وەلێ سیراج مام تاهیری باوکی بازرگانە و زوو زوو بۆ شار دەڕوا، گەر لەگەڵیدا ڕێک کەوین و تۆزێ پارەی پێ بدەین، چ کتێبێکمان بووێ بۆمانی دێنێ.

+ بیرۆکەیەکی چاکە ئەمیر خێرا ڕاکە.

- بەرەو کوێ سیراج؟

+ بۆ ماڵی عوسمان.

هەردوو بەرەو ماڵی عوسمان تێیان تەقاند، بەشێوازێ کاتێ گەیشتنە بەر دەرگا پرزە سوار بوو بوون[43].

---

٤١- کاشکی: خۆزگە.

٤٢- سەرپاک: سەرتاپا.

٤٣- پرزە: هەناسە.



سیڕاج لەدەرگای داو مام تاهیر خۆی دەرگاکەی کردەوە.

+ سڵاو مام تاهیر کتێبمان گەرەکە.

- چی چی! ئەمە چیت گوت سیڕاج؟ بەم بەیانیە دەڵێی شێت بوویتە، بۆ کتێبخانەم داناوە.

+ ئەها ببوورە تۆزێ پەشۆکام، مەبەستم.... حاڵتان چۆنە شوکر باشن، دادە سەروین و عوسمان و عیساو شلێرو ئامینە، هەموویان چاکن شوکر؟

- بەخوا ئەوەندەی من بزانم تۆ بۆ چشتێک هاتوویت ئاوا پەشۆکاوی، خێرا پێم بێژە ڕۆڵە ئەم هاش و هووشەی ناوێ، هەموویان گڕەیان دێ و لەمن تەندروست ترن.

ئەمیر هەڵی دایێ: مام تاهیر گیان، تۆ زوو زوو دەڕۆیتە شارو لەوێ کارت هەیە، من و سیڕاجیش زۆر تامەزرۆی کتێبین وەلێ کەس نییە بۆمانی بسەنێ، گەر تۆ لەوێ بیسەنی بۆمان گەلێ منەتبارو قەرزارت دەبین.

- باشە کوڕم ئەی لەقوتابخانە کتێبتان پێ نادەن، بەخوا من هەر جارەی دەتان بینم کۆڵێکتان لەسەر شانە.

+ نا مام تاهیر، ئەوانەی قوتابخانە جوایەزن، سیڕاج دەیهەوێ کتێبی عاشقانە بخوێنێتەوە.

سیڕاج قونجرکەیەکی خێواندێ و گوتی: کورە ئابڕوت تکاندم، هێواش بە.

- چی چی، عاشقانە! کورە ئێوە لەو تەمەنە چیتان لەم بەزمە داوە، بابە بڕۆنە ڕێگای خۆتان.

+ دەی تخوا مام تاهیر دڵمان مەشکێنە، بەڵێنت پێ دەدەین کە هەر جارێ لەشار هاتیتەوە دەسبارت دەبین و کەلوپەلەکانت بۆ دادەگرین.

مام تاهیر قەیرێ بیری کردەوەو هاتەوە گۆ: باشە ئێوە پارەتان هەیە؟

+ خەمی ئەوەت نەبێ، لەگەڵ سیڕاج ڕۆژانەی خۆمان بۆ ئەوە دادەنێین و تۆ هەر جارەو کتێبێکمان بۆ بێنە.

- باشە کوڕەکانم، مادام ئێوە ئاوا وازتان لەخوێندنەوە بێ منیش یارمەتیتان دەدەم.

هـەردوو خۆیـان بەباوەشـی مـام تاهیـر دادا و خەریـک بـوو لەخۆشـیاندا بـە زەویـدا بـدەن.

- باشـە باشـە منتـان کوشـت کوڕینـە، خـۆ نەمگـوت ئـاوا بکـەن، یـەڵا زوو بڕۆنـەوە ماڵـێ دەنـا کتێـب نییـە هـا. ئینشـاڵا سێشـەم وەڕێ دەکـەوم و کتێبێکـی خۆشیشـتان بـۆ دێنـم کەهاتمـەوە.

هەردووکیان لەخۆشیاندا ڕایان کردو بەرەو ماڵ چوونەوە.

کێشـەکە لـەوەی دابـوو کەمـام تاهیـر لەگـەڵ ماینـە بـۆردا تاکـو دەڕۆیشـتە شـارو کارەکانـی خـۆی بەجـێ دێنـاو دەهاتـەوە دوو هەفتـەی گـەرەک بـوو.

ئیـدی وای لێهاتبـوو سـیڕاج و ئەمیـر هەمـوو ڕۆژێ پیاسـەیەکی بەردەمـی ماڵـی مـام تاهیـر بکـەن، دەتگـوت ماڵـی مەعشـوقە و بـۆ سـێبووری بەبەردەمیـدا ڕادەبـورن.

لەکۆتاییـدا هـەواڵ هـات و مـام تاهیـر گەیشـتەوە لادێ. سـیڕاج و ئەمیـر بەڕاکـردن بـۆ بەردەمـی ماڵیـان تێیـان تەقانـد، ڕوانیـان وا مـام تاهیـرو عوسـمانی کـوڕی مژووڵـی[٤٤] داگرتنـی بارەکـەن.

ئەمیـر بەڕاکـردن هەنـدێ کەلوپەلـی لەدەسـتی عوسـمان ڕاکێشـا و سـیڕاجیش بـەرەو مـام تاهیـر چـوو بازێکـی لەدەسـت ڕاکێشـان و خەریـک بـوو بکـەون بەسـەر یەکدیـدا.

+ قوربانـت بـم مـام تاهیـر بەخـوا نابـێ خـۆت هەڵیـان گـری، دەزانـم ماندوویـت، ئـا بێنـە بێنە بمـدەرێ.

- کـورە سـندان و هـەش باشـە، ئێـوە بـۆ وادەکـەن هەتیوینـە، خەریـک بـوو بکـەوم بەزەویـدا، جـارێ گەشـتوومەتەوە جـێ داتـان بەسـەرما.

+ خەجاڵەتین بەخوا مام تاهیر، وەلێ خۆت دەزانی کەچەندە پەرۆشین.

- باشە ئادەی ئەمانە لە بارکێشەکە[٤٥] داگرن تا کتێبەکەتان پێ بدەم.

بەخێرایـی کەلوپەلەکانیـان داگـرت و پاشـان مـام تاهیـر کتێبێکـی لەنێـو جۆڕکـە سـپیەکەدا دەرکـردو دایـە دەسـتیان.

---

٤٤- مژووڵ: سەرقاڵ.

٤٥- بارکێش: وڵاخ.

- گوتم کتێبێکی عاشقانەم دەوێ، ئەوەیان پێدام و تۆزێکیش پێم پێکەنین، ها بیگرن پارەکەیشیم ناوێ.

سیراج وەری گرت و تێی ڕاما، لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو (داستانی لەیلاو مەجنون)، خێرا دەستی مام تاهیری ڕامووسی و لەگەڵ ئەمیر ڕایان کردەوە بۆ بەهەشتی بچووک و دەستیان بەخوێندنەوەی کرد.

ئیدی هەموو مانگێ مام تاهیر کتێبێکی بۆ دێنان ( گەڵای وەریو، کچەی نێو بەفر، چیرۆکی بەر ئاگردان و شازادەو پەری ) و زۆری دیکە.

سیراجیش هاوڕێیانی کۆدەکردەوە و بەیەکەوە لەبەهەشتی بچووک دەیانخوێندەوە.



## دەرکەوتنی گوڵێکی تازە لەنێو بەهاری سیڕاج

سیڕاج یەکێ بوو لەقوتابیە زیرەکەکانی قوتابخانەی گوندی شاخان، شوێنێکی بچووکی لەقوڕ دروستکراو کە پێک هاتبوو لەشەش ژووری بچووک، هەر ژوورە و بۆ پۆلێک تەرخان کرابوو.

ناوەوەی ژوورەکان هێندە تاریک بوون، زۆرجار چرایان تێدا هەڵدەکرد.

قوتابخانەیەکی بێ بەڕێوەبەر، کە هەمووی حەوت مامۆستا سەرپەرشتیان دەکردو وانەکانیان تیا دەگوتەوە.

مامۆستاکان گەلێ بەقوتابیانەوە ماندوو دەبوون، چون لەبەر کەمی مامۆستا دەبوایە هەر یەکەیان چەند وانەیەک بڵێنەوە، کە هێندێ جاریش بەهۆی دڵۆپە و دزەکردنی ئاوی باران وانەکانیان لێ تێک دەچوو.

لەبەر ئەوەی گوندی (ناودۆڵ) ی دراوسێیان قوتابخانەی تیا نەکرابوو ئەوانیش بازێک مناڵەکانیان دەنارده شاخان و بەهۆی زۆری ژمارەی قوتابیان ناچار بوون بیانکەن بەدوو دان.

لەبەیانیـەوە تـا نیـوەڕۆ پۆلـی یـەک و دوو و سـێ، لـەدوای نیـوەڕۆ تاوەکـو عـەسر چـوارو پێنـج و شـەش، دوای سـێ ڕۆژیـش کاتەکانیـان پێچەوانـە دەبوویـەوە، هەریەک لـەم پۆلانـەش ئەلیـف و بائـی هەبـوو.

سـیراج و ئەمیـر لەپۆلـی پێنجـی (ب) بـوون و هـەردوو زیـرەک بـوون، لـێ سـیراج نموونـەی پـۆل بـوو، مامۆسـتاکان زۆریـان خۆشدەویسـت و گەلـێ جاریـش دەیـان بـردەوە ماڵـێ و دیاریـان پـێ دەدا.

زۆرجـار سـیراج دەیژنـەوت کـە لەپۆلـی (أ) کچـێ هەیـە گەلـێ چاپـووک و زیـرەک، وەلـێ ئـەو پێـی وانەبـوو کەکـەس لـەم فێرگەیـەدا زیرەکتربـێ لـەو.

ڕۆژێـک بەهـۆی هاروهاجـی هەندێ لەقوتابیان مامۆسـتا عەلـی بڕیاریـدا جێگۆڕکێیەک ئەنجـام بـدا، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دوو قوتابـی کـوڕی هاروهاجـی لەپێنجـی (ب) ەوە گواسـتەوە بـۆ پێنجـی (أ)، لەبـری ئـەوەش دوو کچـی لـە (أ) ەوە گواسـتەوە بـۆ (ب).

(سـەناریا و شـەیما)، دوو کچـی ڕێـک و پێـک و جوانکیلـە و زیـرەک، وەلـێ تـۆزێ لـووت بـەرز.

ئەمـە یەکـەم دیـدار بـوو، یەکـەم نیـگای سـیراج بـۆ سـەناریا، گەرچـی پێشـتر نـاو و چالاکـی ئـەوی بیسـتبوو، وەلـێ نەیزانیبـوو کەئـاوا جـوان و قەشـەنگە.

یەکەم دیدار چێژێکی ئەوتۆی هەیە کەتا مردن لەخەیاڵی مرۆڤ ناچێتە دەر.

سـەناریا چ سـەناریا، سـارایەکی ڕێ ونکـەر، گەردوونـێ بـوو کـە جوانـی لـێ دەتـکا، گوڵـزارێ بـوو کەجۆرەهـا گوڵـی ڕەنـگاو ڕەنگـی تێـدا خەملـی بـوو، سـەحەرێ بـوو لەخامۆشـی، دەریایـێ بـوو لەقووڵـی، دەتگـوت سروەی بـەری بەیـان لەگـەڵ خۆیـدا هێناویەتـی.

دوو چـاوی سـەوزی گـەلا ئاسـاو قژێکـی زێڕینـی خـۆر ئاسـا، لەچکـە سـپیەکەی تاڵـە زێڕینەکانـی داڵـدە دابـوو، ئەمـا ئـەو سـوورو سـەوزیەی کوڵـم و چاوەکانـی چـاوی مـرۆی کامڵـی تێکـەڵ و پێکـەڵ دەکـرد.

هـەر زوو دڵـی سـیراجی وە جووڵـە خسـت و وەکـو خوێنـێ بەنێـو باریکـە دەزوولـەی دڵیـدا تەراتێنـی[٤٦] بـوو.

---

٤٦- تەراتێن: هاتووچۆ بە هەڕاکردن.

بەشێوازێ دڵی سیڕاجی ئەنگاوتە[٤٧] کرد بەچەندین ساڵ بۆی ژێر نەکرێتەوە.

سیڕاجی بچووک تائێستا عیشقی لەکتێبەکانەوە ناسی بوو، لێ ئێستا خەریک بوو خۆی دەیچەشت.

سەیر نییە یەکەم نیگا عاشقت کا، بەڵکو سەیر لەوەدایە کەلەم هەموو جوانیە ڕابمێنی و یەشتا دڵت جوولەی تێ نەکەوتبێ.

ئیدی سیڕاج ئەو کوڕە بزێوەی جاران نەبوو، ئیدی یەکەمی پۆل نەبوو، ئیدی ناوی ئەو لەزیرەکیدا یەکەم ناو نەدەخوێنرایەوە، بەڵکو لەجێگاکەی ناوی سەناریا دەهات، ئەو هەموو چشتێکی لەسیڕاج زەوت کرد تەنانەت دڵیشی.

ئیدی ئەم سیڕاجە بزێوە هێندە شەرمن بووبوو کە نەیدەتوانی تەنانەت بۆ جارێکیش لە ڕوخساری دولبەر بڕوانێ، خێرا هەموو جەستەی دەکەوتە لەرزین و سوور دادەگەڕا.

ئاخر ئەو پێشووتریش کاتێ بەرەو ڕووی کچان دەبوویەوە شەرم تینی بۆ دەهێنا، دەی ئێستا کەعیشق لەگۆڕێ دایە تینەکەی پترە لەجاران.

بازێ جار جۆرە ڕقێ ڕووبەڕووی دڵی دەبوویەوە کە هەوڵی دەدا کێبەرکێ لەگەڵ ئەم کچە بکاو لەزیرەکی لێی بباتەوە. وەلێ هەر زوو هێوڵە[٤٨] دەبوویەوە و خۆشەویستی نەیدەهێشت پەل بهاوێ بۆ ڕق و قین.

ماڵی سەناریا لەدێی ناودۆڵ بوو، کە نزیکەی بیست دەقیقەیەک بەپێ لەشاخان دوور بوو، لێ ڕۆژانە لەگەڵ باوکی دەهات و دەچوویەوە.

سیڕاج لەڕێی هاوڕێیەکی توانیبووی ماڵیان بدۆزێتەوە، هیچ نەبێ دوو سێ ڕۆژ جارێ بۆ سێبووری دڵی لەگەڵ ئەمیردا بەبەردەم ماڵیان ڕەت دەبوو.

تا دەهات خەیاڵی ئاڵۆزتر دەبوو چون درکی بەوە کردبوو بازێ لەکوڕەکانی دیکەش چاویان لە سەناریایە و باس و خواسی ئەو لەنێویاندا دەگوزەرێ.

پۆلی پێنجیش تەواوبوو، ئێستا ئەوان لەکۆتا قۆناغی سەرەتایی دان. هەرکاتێ سیڕاج و ئەمیر ون ببان ئەوا دیاربوو کە لە ناودۆڵ بوون و بەردەم ماڵی سەناریا

---

٤٧- ئەنگاوتە: پێکران ، ئەنگاوتەی کرد: پێکای.

٤٨- هێوڵە: هێوربوونەوە.



ببـوو بـە مەنزڵگایـان.

ڕۆژێ لەگـەڵ ئەمیـر بەوێـدا ڕابـوردن و سـیڕاج گوتـی: دەزانـی ئەمیـر ئەمسـاڵ پۆلـی شەشـین و کۆتـا ساڵمانە، بـڕوا ناکـەم کەئیـدی ناتوانـم سـەناریا ببینمـەوە، گەر ئەمسـاڵ نەتوانـم ئـەوەی دڵمـی پـێ بێـژم، ئـەوا لەدەسـتم دەچـێ و مـاڵ وێـران دەبـم.

- وەلێ چۆن چۆنی پێی دەڵێی کەتۆ ناتوانی لێشی بڕوانی؟.

+ نازانـم، هـەر ئەوەنـدەی دەزانـم کـە زۆرم خۆشـدەوێ و بـڕوا ناکـەم بوێـری پـێ ڕاگەیاندنیـم هەبـێ، دەترسـم ئەمیـر.

- سـیڕاج دەمـەوێ چشـتێکت پـێ بێـژم، بمبـوورە کـە ئـەم قسـەیە دەکـەم، وەلێ سـەناریا لەدڵـی منیـش دایـەو خۆشـمدەوێ، بۆیـە هێنـدە بەپەرۆشـم کەلەگـەڵ تـۆ بێـرەدا ڕەتبم.

+ هێـی ئەمیـر، ئـەوە چـی دەڵێـی، تـۆ ئـاگات لەخۆتە، چـۆن دەبـێ دوو کەس کەسـێکیان خۆشـبوێ، تـۆ دەتوانـی شـەیما دەسـت نیشـان بکەی نـەک ئەو.

- وەلێ دڵم هەر ئەوی دەوێ، شەیما وێنەی ئەو جوان نییە.

سیڕاج چاوەکانی سوور بوونەوە لەتووڕەییدا، دەتگوت کە گوللەی پێوە دەنێن.

+ ئەمیـر تـۆ هاوڕێیەکـی خۆشەویسـتی لام، وەلـێ گـەر ئـەم قسـانە بکـەی لێـت تـووڕە دەبـم و بگـرە دەبـێ بـە شەڕیشـمان.

- سـیڕاج وازبێنـە، باهەردووکـمان خۆشـمان بـووێ کاکـە چـی زەرەر دەکـەی، گـەر پێـت خۆشـە تـۆ لەمنیـش پـتر بێـرەدا بـڕۆ.

سـیڕاج کـە ئەمـەی ژنـەوت یەخـەی ئەمیـری گـرت و مسـتێکی خێوانـدە بناگوێـی و پاڵێکـی پێوەنـا و دای بەزەویـدا.

ئەمیر بەچاوی پڕ ئەسرینەوە هەڵسایەوەو خۆی لەسیڕاج کرد و تێک هەڵغژان[٤٩].

مـام ڕەحیمـی باوکـی سـەناریا کـەدەرگای ماڵـی کـردەوە، ڕوانـی وا دوو منـاڵ لەبـەردەم ماڵەکەیـدا شـەڕیانە و ئـەو دەڵـێ سـەناریا هـی منـە و ئـەو دەڵـێ نـا هـی منـە.

هـاواری کـردو گوتـی: ئـا بـۆم بووەسـتن هەتیوینـە، ئەمـە چیتانـە لەبـەردەم ماڵەکەمـدا، ئێسـتا لای پۆلیـس شـکاتتان لـێ دەکـەم.

---

٤٩- تێک هەڵغژان: شەڕیان کرد.

هەر کە گوێیان لەمام ڕەحیم بوو خێرا سرک و تیژ تێیان تەقاند و هەڵهاتن.

نزیکەی دەقیقەیەک مام ڕەحیم دوایان کەوت و بۆی نەگیران.

ئەو دەمەی ترسیان لەسەر نەما ئەمیر بە پرزەی[50] سوارەوە گوتی: سیڕاج بمبوورە ئێمە برای یەکدین و من سەناریام ناوێ با بۆخۆت بێ، چی تریش نایەمەوە ئێرە.

سیڕاج لەقاقای داو گوتی: هەی ترسنۆک، تۆ چەند دەقیقە لەمەوبەر خەریک بوو بمکوژی، بەخوا مام ڕەحیم چاکی پێ کردی.

هەردوو دەستیان لەملی یەکدی کردەوە و بەپێکەنینەوە گەڕانەوە ماڵێ.

مامۆستا عەلی هەر ناوە ناوە دوو قوتابی نوێی دەکردە چاودێری پۆل، بۆ ئەم جارەیان گوتی دەمهەوێ دوو لەیەکەمەکانی پۆل چاودێر بن، بۆ ئەم مەبەستەش سەناریاو سیڕاج زۆر گونجاون. سەناریا یەکەمی پۆلە و سیڕاجیش دووەم، تکایە ژیربن و لەگوتەیان دەرمەچن، چون ئەم دووە ناوی هەرکامتان تۆمارکەن ئێمە دارکاری دەکەین.

ئەمە ڕۆژی بەختی سیڕاج بوو کەدەیتوانی بازێ جار بەهۆی چاودێریەوە لەگەڵ دولبەردا بدوێ، وەلێ سەناریا تۆزێ کەم دوو بوو، سیڕاجیش لەبەر شەرمەکەی چشتێکی ئەوتۆی پێ نەدەکرا.

ڕۆژێکیان هەرچۆنێ بوو تۆزێ خۆی توونە کردو بەشەرمەوە بەرەو ڕووی هەنگاوی نا.

+ سەناریا.....

- بەڵێ سیڕاج

+ تۆ ناوی قوتابیەکان دەنووسی گەر هاروهاجیان کرد؟.

- ئەی چۆن، ئەمە فرمانی مامۆستایە.

+ وەلێ من تا ئێستا ناوی کەسم نەنووسیوە.

- بۆچی؟

+ ئاخر ئەوان هەموو هاوڕێمن، نامەوێ دارکاری بکرێن.

---

٥٠- پرزە: هەناسە.



سـەناریا بـە تووڕەییـەوە: نابـێ سـیڕاج، ئەمـە چاودێریـە و هاوڕێیەتـی نازانـێ، گـەر ئـاوا بکـەی مامۆسـتا ئـاگادار دەکەمـەوە، دەبـێ نـاوی هەموویـان بنووسـی.

سـیڕاج خەریـک بـوو زیـڕە بـکا و گیانـی کەوتـە لـەرزە لـەرزو دەمـی تەتەڵـەی[51] دەکـرد بـەو تووڕەییـەی دولبـەر.

+ باشـە باشـە سـەناریا تـووڕە مەبـە، ئێسـتا نـاوی هەموویـان دەنووسـم بەسـەرچاو، خێـرا دەسـتی بەنـاو نووسـینی قوتابیـان کـرد.

- ئەوە چی دەکەی گێژە، خەریکە ناوی هەموویان تۆمار دەکەی.

+ ئەی مەگەر نەتگوت دەبێ ناوی هەموویان بنووسی؟.

- ئێ ئەوانەی هاروهاجن، تۆ خەریکە قوڕ دەکەیتە سەری هەموویان.

+ باشە ببوورە سەناریا، وا دەیان سڕمەوە هەر ئێستا، نەمزانی.

+ سەناریا تۆ هۆنراوەت پێ خۆشە؟

- بۆچی دەپرسی؟

+ هەروا.... من خۆم زۆرم واز لێیە.

- لەڕاسـتیدا.. زۆرنـا، وەلـێ خوشـکێکم هەیـە کتێبێکـی تـەژی[52] لەهۆنـراوەی هەیـە، جارجـارە منیـش دەیـان خوێنمـەوە، مـن پـتر قورئـان دەخوێنمـەوە.

+ قورئان...!

- ئەرێ..

+ خۆشە سەناریا قورئان؟

- ئەی چۆن، گوتەی خودایە.

+ باشە وازت لێیە هۆنراوەیەکی (ئەخۆل)ت بۆ بڵێم؟

- ئاخر ئێستا مامۆستا دەگا.

+ دەی تا نەگەیشتووە من دەیڵێم تکایە.

---

٥١- تەتەڵە: دەم تێک ئاڵان.

٥٢- تەژی: پڕ.

- باشە بفەرموو.

+ پەچەت لادە ببینم ڕووت ئەمن خۆ سەیری تۆ نـــاكـــەم

لەڕووی تۆ تێدەگەم یەزدان چلۆن نەخشێ دەنەخشێنێ

كـــە تیشكی خۆر ئـەدا زاخـاوی زوڵفی زەردی زێڕیـنـــت

لەلام قەوس و قەزەح هیچ ڕەونەق و شەوقێكی نامێنێ.

- ئەمە مانای چی بوو سیڕاج؟

+ نازانم وەلێ هۆنراوەیەكی خۆشە لام.

سـەناریا زەردەكەنـی[٥٣] دایگـرت و لـەو دەمـە مامۆسـتا وەژوور كـەوت و ئـەم گوتـە پـڕ چێژانـەی لـێ تێكـدان.

ئەو نیوەڕۆیە سیڕاج چوویەوە ماڵێ، بانگی كرد: دایە... دایە.

- ها كوڕم بێژە، وا لە ناندینم، هێشتا چێشتەكە ئامادە نەبووە، چاوەنووڕ بە.

+ نا نا، چێشتم ناوێ قوڕئانم دەوێ قوڕئان.

- ئەوە چی دەڵێی كوڕم.

سیڕاج چووە ناندینەكەو گوتی: دایە دەمەوێ قوڕئان بخوێنم، چی بكەم باشە؟

- ئەی بسمیلا بەم نیوەڕۆیە خێرە قوڕئانت بیركەوتۆتەوە؟

+ وەڵا ئیمـڕۆ هاوڕێیـەك بـۆی باسـكردم، منیـش حـەزم لێیەتـی، دەی تخـوا دایـە فێـرم بكـە.

- ئـێ كـوڕم مـن خوێنەواریـم نییـە، چۆنـت فێركـەم، لـەم دێیـەدا تەنـێ مـام ئیسـماعیل قوڕئانەكـەی ڕەوانـە، ئێـوارە بـڕۆ لای بـا فێـرت كا.

هـەر دوای نانـی نیـوەڕۆ سـیڕاج خێـرا هەڵسـاو لـە دەرگای ماڵـی مـام ئیسـماعیلی داو شـەریفی كـوڕی هاتـە دەرێ.

+ سەلامو عەلەیكوم.

- وە عەلەیكومە سەلام بەخێربێی، فەرموو سیڕاج.

٥٣- زەردەكەنی: زەردەخەنە.



+ نا نایەمە ژووریّ، بانگی مام ئیسماعیل بکەی زۆرباشە.

- باشە هەر ئێستا چاوەنووڕ بە.

مـام ئیسـماعیل دیاربـوو زوو نانـی خواردبـوو، سـەرخەوێکی شـکاندبوو، خێـرا شـەرواڵەکەی لەپاکـردو جامانیەکـەی بەسـتاو هاتـە دەریّ.

- فەرموو کوڕم بێژە بەم نیوەڕۆیە چیت گەرەکە؟

+ وەڵا ئەوەی ڕاستی بێ مام ئیسماعیل قوڕئانم گەرەکە.

- وەڵا کوڕم من هەر دوو قوڕئانم هەیە لەماڵ، یەکێکیان خۆم لەسەری دەخوێنم و

ئـەوەی دیکـەش حاجـی ژن، گـەر پێشـتی بـدەم دەبـێ زوو بیهێنیتـەوە بۆمـان دەنـا ماتەلمـان دەکـەی.

+ نا نا مام ئیسماعیل قوڕئانم ناویّ نا.

- دەی جا وەرە لەگەڵ ئەم هەتیوە سەر دەرکە، دەمێ دەیهەویّ و دەمێ نایهەویّ.

+ ئاخر مەبەستم ئەوەیە، هاتووم فێری قوڕئانم بکەی.

- ئێ دە ئاوا بێژە بابە، جا تخوا بەم نیوەڕۆیە هاتووی !.

+ ئاخـر بەپـەرۆش بـووم بـۆی، چـون سـەناریا قوڕئـان دەخوێنـێ و گوتیشـی کـەوا خۆشـە و گوتـەی خوداشـە، جـا منیـش دەمهـەویّ فێربـم.

- سەناریا کێیە کوڕم؟

+ ئـەو کچـی مـام ڕەحیمـە، لەنـاودۆڵ دەژیـن، لەقوتابخانـەش لەگەڵمایـەو بەیەکـەوە چاودێریـن، چـۆن نایناسـی؟

کـورە مـن چووزانـم مـام ڕەحیـم کێیـە، خـۆ مـن هەمـوو خەڵکـی دونیـا ناناسـم، دەی خێـرا وەرە ژووریّ هەرچەنـدە کاتـی خەوتنیشـە، لـێ بـۆ ئیمـڕۆ قەینـاکا.

پێویستە هەموو عەسران ئامادەبی، لەگەڵ دوو سێ قوتابی دیکە پێتان دەڵێم.

ئیـدی سـیڕاج دەسـتی دایـە قوڕئـان خوێنـدن و هەمـوو عـەسران بەپەرۆشـەوە لەماڵـی مـام ئیسـماعیل ئامـادە دەبـوو. هەرچەنـدە هیچـی لـێ حاڵـی نەدەبـوو، وەلـێ مـام ئیسـماعیل کاتـی خـۆی تۆزێکـی فەقێیاتـی کردبـوو، هێندێکـی بـۆ شـیدەکردەوە و

زۆریشـی ئامـۆژگاری لـێ دەکـرد.

دوای ئـەوەی سـیڕاج پاژێکـی[٥٤] لەقوڕئـان تـەواو کـرد، ئەمـەی بەدەرفەتێـک زانـی تاکو دووبـارە لەگـەڵ سـەناریا بدوێتـەوە، بۆیـە بـەر لـەوەی مامۆسـتا خـۆی بـکا بـەژوورا لێـی چوویـەوە پێـش.

+ سەناریا...

- بەڵێ سیڕاج چی بووە؟

+ ئەو ڕۆژە گوتت قوڕئان دەخوێنم وایە؟

- ئەرێ وایە، خێرە دەپرسی؟

+ دەی وەڵا منیـش لـەو ڕۆژەوە قوڕئـان دەخوێنـم، زۆر خۆشـە سـەناریا، بەخـوا عەڕەبیەکـەی زۆر زۆر فەسـیحە، مـام ئیسـماعیل گوتـی ئەمـە خـودا ناردوویەتـی بـۆ پەیامبەرمـان و هـەر پیتێکـی دە پاداشـتی لەسـەرە.

- بەڵـێ دایکـم هەمـوو ئەمانـەی بـۆ باسـکردووم، زۆر چاکـت کـردووە کـە دەیخوێنـی، گـەر بـەردەوام بـی خـودا پاداشـتی نەبڕاوەی بەهەشـتت پـێ دەدا.

+ دایکت فێرت دەکا؟

- ئەرێ، ئەو لەبواری ئاین زۆر شارەزایە.

+ بۆچی دایکی تۆ منیش فێرناکا سەناریا؟ منیش پێم خۆشە لای ئەو فێربم.

- شەرمە بۆ تۆ، خۆ دەبێ کوڕان لای پیاوان بخوێنن.

+ ڕاست دەکەی، مام ئیسماعیلیش کچەکانی دەناردنە لای حاجی ژن.

دووبـارە مامۆسـتا هاتـە ژوورو گفتوگۆکـەی لەسـیڕاج تێکـدا، ئاخـر ئـەو چ بەهانەیەکی دی بدۆزێتـەوە بـۆ قسـەکردن لەگـەڵ دولبەرەکەیدا.

سـاڵێکی تـەواو نەبـرد کـە سـیڕاج توانـی تـەواوی قوڕئانەکـە خەتـم بـکا. ئـەو شـەوە مـام ئیسـماعیل مەولـود نامەیەکیشـی بـۆ خوێنـدەوە و مـام سـلێمانی باوکـی سـیڕاج و کۆمەڵـێ لـە خەڵکـی گونـد لەماڵـی مـام سـمایلدا گردبوونـەوە و شـیرینیان دابـەش کـردو مەولایەسـەلیان خوێنـدەوە و تێکـڕا پیرۆزباییـان لەسـیڕاج کـرد.

٥٤- پاژ: بەش ، جوزئێک.



لەبـەر ئـەوەی تاقیکردنـەوەی کۆتایـی سـاڵ هەفتەیەکـی مابـوو، هەمـوو قوتابیـەکان مۆڵەتیـان درابـوو لەماڵـەوە بمێننـەوە بـۆ خوێنـدن.

ئەمـە ئـەو ڕۆژانەبـوو کەسـیراج لێـی تۆقـی بـوو، چـون کۆتـا سـاڵی بـوو لەگـەڵ سـەناریاو ئیدی لەوانەیـە نەیبینێتـەوە، بۆیـە لەهەوڵـی ئـەوە دابـوو ئـەم عیشـقە چیـدی لەپەنـاگای دڵـی حەشـار نـەدرێ و بێتـە سـەر زار.

تاقـی کردنـەوەکان دەسـتی پێکـردو هەمـوو ڕۆژێ سـیراج لەدەرفەتێـک دەگـەڕا، وەلـێ هەرگیـز سـەناریا تەنیـا نەدەبـوو، هەر کـە تاقیکردنـەوە کۆتایـی دەهات مام ڕەحیـم لەبەر دەرگا چاوەنـووڕی دەکـردو بەسـواری ئەسـپەڕەش سـەناریای دەگەیانـدەوە ماڵێ.

کۆتـا ڕۆژ وانـەی بیرکاریـان هەبـوو، سـیراج بڕیـاری دابـوو گـەر بەمردنیـش بـێ ئیمـڕۆ چشـتێ بـکا، چـون کۆتـا دەرفەتـە و جارێکـی دیکـە ناتوانـێ لەچـاوە سـەوزەکانی سـەناریا ڕابمێنـێ.

هـەر زوو تاقـی کردنەوەکـەی وەڵام دایـەوەو هاتـە بـەردەرگا ڕاوەسـتاو چاوەنـووڕی دولبـەر بـوو.

لەپـڕ سـەناریا هاتـە دەر، ئـەو ڕۆژە هێنـدە جـوان بـوو کـە سـیراج لەشـوێنی خۆیـدا چەقـی و دەمـی بـوو بـە تەڵـەی تەقیـو و زوبانـی نەهاتـە گـۆ.

سەناریا بەخێرایی ڕای دەکرد بەرەو دەرگاو پەلەی بوو تا بگاتە باوکی.

لەپـڕ سـیراج لـەدواوە شـەرمەکەی شـکاندو بەهەمـوو هێـزی خـۆی دوو جـار لەهارژنـی دا[٥٥] (سـەناریاااااااا). سـەناریا لای کـردەوە و نیگایەکـی سەرسـامانەی بۆکـردو گوتـی:

هـا سـیراج بۆچـی بـەم دەنگـە بـەرزە بانگـم دەکـەی ! خەڵـک هەمـوو ژنەوتـی، مـن زۆرم درەنگـە، لەگـەڵ باوکـم دەڕۆیـن بـۆ شـار، تکایـە ببـوورە.

لـەو کاتـەدا مامۆسـتایەک لەپـۆل هاتـەدەر و گوتـی: ئەمـە چ هەتیـوێ ئـەم هـاوارەی لـێ دەرچـوو، لەکاتێکـدا لـەژوورەوە پڕۆسـەی تاقـی کردنـەوە بەڕێـوە دەچـێ، بەخـوا بزانـم کێیـە هـەر دەیکەوێنـم.

سـیراج بەڕاکـردن بـەرەو سـەناریا چـوو، وەلێ سـەناریا ئـاگاداری ئـەو نەبـوو، بەخێرایی بـەرەو دەرگاو لای باوکـی دەڕۆیی.

---

٥٥- لەهارژنی دا: هاواری کرد.

ئەو دەمەی نزیک بۆوە دووبارە بانگی کردەوە: سەناریا تکایە بوەستە.

- ئەرێ تۆ چیت دەوێ سیڕاج، بەخوا زۆرم درەنگە، دەمێکە باوکم چاوەنووڕە.

لەو کاتەدا مامۆستا عەلی وەدیار کەوت و گوتی: بڵێ سیڕاج چیت گەرەکە؟ ئەمە کۆتا تاقیکردنەوەت بوو کوڕم، پێم بێژە چۆن بوویت؟ تۆ قوتابیەکی زیرەکی بۆیە خۆشمدەوێی، ئەمە کۆتا ڕۆژەو لەمەودوا هێندە یەکدی نابینین، بیری هەمووتان دەکەم ئازیزانم.

+ سوپاست دەکەم مامۆستا زۆر باش بووم، وەلێ من دەبێ بڕۆم و زۆر زۆرم درەنگە.

سیڕاج قسەکانی تەواو نەکردو ڕوانی سەناریا نەماوە لەبەر دەرگا، خێرا ڕای کردو بینی وا لەگەڵ مام ڕەحیم لەسەر پشتی ئەسپە ڕەشن و خەریکن دەڕۆن.

بەهەموو هێزی خۆی ڕایکرد بۆیان، وەلێ مام ڕەحیم زۆر لەوە بەهێزتر بۆی دەرچوو.

سیڕاج سەرپاکی توانای خستەگەڕ بۆ ڕاکردن، ئیدی لای گرنگ نەبوو کەچی لەپێشیەتی و بەرچی دەکەوێ، لێ منالێک زۆر لەوە لاوازترە بگا بەئەسپێکی تیژڕەو.

چەند جارێک سیڕاج لەدوایانەوە کەوت بەزەویداو دەست و پەنجە بچووکەکانی بە خوێن سوابوون، وەلێ لەڕاکردن بەردەوام بوو، هەستی بەئازاری قاچەکانی و ڕووشانی لاشەی نەدەکرد، دەتگوت کە هەموو هەستەکانی لەدەست داوە و جگە لە سەناریا چشتێکی دیکە بوونی نییە.

لەگەڵ هەر کەوتنێکدا هەڵدەستایەوەو هاواری دەکردەوە: سەناریاااااا، سەناریاااااا تکایە بگەڕێوە، چشتێکت پێدەڵێم بگەڕێوە، خۆشمدەوێی، خۆشمدەوێی سەناریا، لەبیرم نەکەی، منت لەیادبێ تکات لێ دەکەم.

دوو سێ جار مام ڕەحیم لای کردەوە و سەناریا گوتی: ئەم دەنگە چی یە باوکە؟

+ هیچ نییە کچم، منالێکە پێم وابێ خەریکی یاری کردنەو لەهارژنێ دەدا.

لەکۆتاییدا سیڕاج توانای نەماو کەوت بەزەویدا و دەستی بەگریان کرد، لەهەموو تەمەنیدا یەکەم جاری بوو ئاوا بەکوڵ بگری.

هەموو جارێ کاتێ مام سلێمانی باوکی لێی تووڕە دەبوو بەگۆپاڵەکەی دەستی لێی دەدا، وەلێ سیڕاج هەرگیز نەدەگریا و منالێکی گرینۆک نەبوو.

خاتوو ڕەحمەی دایکی هەموو جارێ دەیگوت کە سیڕاج لەکاتی کۆرپەییشدا زۆر بەکەمی دەگریاو خۆی پیس دەکرد، وەلێ ئێستا سەناریا هەم گریاندی و هەمیش جلوبەرگەکانی خۆڵاوی کرد، بەڵام چ گریانێ ! گریانێک کە تۆڵەی هەموو ڕوو قەیمیەکەی منداڵی کردەوە.

هەڵسە سیڕاج هەڵسە، تکایە سەر بەرزەوەکە، مەولانا دەفەرموێ (عیشق کاری ناسک و نازدارەکان نییە بەڵکو کاری پاڵەوانەکانە ).

هەڵسایەوەو بەدەستە خوێنینەکانی چاوەکانی دەسڕی و بەگریانەوە ئەم هۆنراوانەی مەحوی و وەفایی دەچڕی:

چ خاکێ کەم بەسەرما مامەوە تاک
بەلێو ئاهو بەچاو ئەشک و بەسەر خاک

بە دوویا وێڵم و ئەشکم دەپرسێ
لە هەر دارو دیارێ (أین سلماک)

جگەر دەبڕێ ، دڵ ئەڕفێنێت و دەڕوا
چ بێ مروەت چ بێ پەروا چ بێ باک

مەڵێن بولبول مەناڵێنە کەوا گوڵ گوڵشەنی چۆڵ کرد
دڵ ئارامی نەما چ بکا کە ئارامی دڵان ڕۆیی

بەناڵەی بولبول و قومری وەفایی بۆیە هەر دەگری
گوڵێکی سەروو باڵام بوو بەتاراجی خەزان ڕۆیی

ئیدی خوێنی دەستەکانی و گڵی سەر ڕێگاکە و ئەسرینی چاوەکانی تێکەڵی یەکدی ببوون و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: سەناریا مەڕۆ سەناریا، چۆن دڵت دێ تەنهام بکەی، تخوا وەرە لەبەر خاتری تۆ ناوی هەموو قوتابیەکان دەنووسم و دەیدەمە مامۆستا وەرە، تخوا وەرە دەمەوێ هۆنراوەیەکی دیکەت بۆ بڵێم، دەی مەڕۆ تکایە، سەناریا مەڕۆ هەموو ڕۆژێ قورئانت بۆ دەخوێنم، بەڵێنت دەدەمێ خۆم فێری ماناکەیشی دەکەم و ڕۆژانە بۆتی دەڵێم بەس مەڕۆ.

وەرە ئـــەی ڕێژنـــە بـــارانی بـــەهـــــاری
وەرە شیـعـــری تـــــەڕی پـــڕ ووردەکـــاری

وەرە جـــوانـــێ هەتـــا نـــازت بـــکـــێـــشـم
وەرە وەک دەستە گـــوڵ داتنێم لـــەپێشــــــم

(هێمن)





# قۆناغی بێ ئەوی

سیڕاج ئێستا لەقۆناغی ناوەندی دایە، چون لەشاخان هەر سەرەتایی لێیە بۆیە دەبێ ڕۆژانە نزیکەی نیو کاژێرێک بەپێ لەگەڵ ئەمیر بڕۆن تاکو دەگەنە شارەدێی (ئاودەر)، لەوێ قوتابخانەیەکی کوڕانی لێیە کە تایبەتە بەقۆناغی ناوەندی تاکو شەشی ئامادەیی.

هەموو ڕۆژێ بڕینی ئەم ڕێگایە بۆ سیڕاج گوپچڕ[56] بوو، وەلێ ناچاربوو، چون هەرگیز نەیدەویست دەست لەخوێندن بەربدا، سەناریاش هۆکارێکی بەهێزبوو بۆ مانەوەی لە قوتابخانە.

تۆ بڵێی لە چ قوتابخانەیێ بێ و باوکی بۆ کوێی ناردبێ؟ دەڵێن لەشارۆچکەی شیلێ قوتابخانەیەکی کچانەی لێیە، تۆ بڵێی لەوێ نەبێ؟ نا نا بڕوا ناکەم، ئەوێ زۆر دوورە، دەبێ بابی بەیانیان زۆر زوو بیبا دەنا وانەی یەکەمی لەکیس دەچێ.

زۆرجار سیڕاج ئەم خەیاڵانەی دەکرد، وەلێ تاکە دڵخۆشیەکی کە مابوو بەردەرگای ماڵی دولبەر بوو کە جار جار پێیدا ڕادەبورد. گەرچی هەرگیز

---

٥٦- گوپچڕ: دژوار.

نەیدەبینی سەناریا بێتە دەرێ، وەلێ سێبوریەکی باش بوو بۆ ئەو، هیچ نەبێ ماوە ماوە سەرێکی لەوێ دەدا.

شاعیر جوانی گوتوە: پای سەگی ماچ دەکرد مەجنون خەڵک گوتی چی بوو ئەوە
ئەو گوتی جارێ بە بەردەم ماڵی لەیلا ڕۆیـیوە

خۆ نەدەکرا زۆریش لەوێ وەمێنێ، چون خوێندنی قوتابخانەی تۆزێ سەخت بووبوو، مام سلێمانیش لێی تووڕە دەبوو گەر درەنگ هاتباوە ماڵێ، بەم دواییە بازێ جار لەگەڵ خۆی دەبردە سەرکاریش.

قۆناغی ناوەندی لای سیڕاج تابڵێی نارەحەت بوو، نەلەبەر قورسی وانەکانی، بەڵکو ئەو وا ڕاهاتبوو کەهەموو ڕۆژێ دەچوویە قوتابخانە یەکەم چشت چاوی بەسەناریا ڕۆشن بێتەوە، ئێستا لەپڕێکدا نەمانی ئەو سانا نییە.

هەستی دەکرد بێ نیشتیمان کەوتووە، مەولانا گوتەنی (من هیچ نیشتیمانێکم نییە، ئەو جێیە نیشتیمانمە کە یاری لێیە ).

هەموو جارێ کە دەهاتە پۆل سەیری کورسی یەکەمی لای دەرگای دەکرد کە سەناریای لەسەر ڕوودەنیشت، لێ ئێستا بێ ئەو قوتابخانە چۆڵ و هۆڵ و ساردو سڕە، دیمەنێکی هێندە بێڕەنگ و وشکە وەکو ئەوەی بنیادەمی تیا نەبێ.

ئەمیر نەیدەزانی هێشتا سیڕاج لەتەلبەندی عیشق دایەو دەربازی نەبووە، بۆیە ڕۆژێ لەقۆناغی دووی ناوەندی کە لەڕێگای قوتابخانە یاوەری دەکرد گوتی: سیڕاج، ئەها ئەم کچە سەناریا، کاتی خۆی لە سەرەتایی لەگەڵمان بوو، دەزانی ماڵیان لەو شوێنەی جاران نەماوە.

ئەم گوتەیە چەشنی ئاگر بەربووە جەرگی سیڕاج و کوڵاندی.

+ چی چی، چۆن گواستوویانەتەوە، تۆ لەکوێ دەزانی؟

- دوێنێ لەگەڵ باوکم چووین بۆ ناودۆڵ، ئەو لەوێ کارێکی هەبوو لای هاوڕێیەکی کە دراوسێی ماڵی سەناریا بوون. ئەو دەمەی چوومە بەر دەرگا ڕوانیم پیاوێ لەماڵی سەناریا دەرچوو کەباوکی ئەو نەبوو، لەمناڵێکم پرسی و گوتی کە قەیرێکە ئەوان لێرە نەماون.

+ ئەی باشە نەیگوت بەرەو کوێ؟

- پێم گـوت، وەلـێ نەیزانـی، لەوەیـە چووبێتنـە شـار، یـان گوندێکـی دوور لێـرە، چووزانـم.

سـیڕاج سـەرپاکی هەنـاوی بـەم هەواڵـە دەکـوڵا، لـێ نەیدەویسـت ئەمیـر لێـی حاڵـی بـێ، جەرگـی بچووکـی تـاو نـا تـاوێ خیـزەی لێـوە دەهـات. ئاخـر تاکـە یـادگاری کەلەگـەڵ ئـەودا مابـووی بـەردەم قاپیەکەیـان بـوو، لـەوێ کەمـێ دڵنـەوا دەبـوو، ئیـدی ئـەم دەرگایـەش بەڕوویـدا داخـرا.

لێـرە بـەدوا سـەناریا تەنـێ فەنتازیـا[57] بـوو لەژینـی سـیڕاجدا، نەلـە قوتابخانـە بوونـی هەبـوو نەکـەس مەنزڵـی دەزانـی.

ئیـدی سـیڕاج زۆربـەی دەمەکانـی بەتەنیایـی و گۆشـەگیری دەگوزەرانـد، تەنانـەت لەگـەڵ ئەمیریـش پەیوەنـدی جارانـی نەمابـوو، تەنـێ لـە قوتابخانـە یەکدیـان دەدیـت.

لاوازیەکـەی هێنـدە تێپـەڕی بـوو کەبـە ڕوونی ئێسـقانەکانی جەسـتەی دەبینران، گشـت هەوڵەکانـی بـۆ دۆزینـەوەی دولبەر بـێ ئەنجام بـوو، دەتگـوت زەوی قووتـی داوە، یاخود ئاسـمان هەڵـی کێشـاوە، تەنـێ خەیاڵێـک مابوویـەوە لەنێو دڵی سـیڕاجداو هیچـی دیکە.

حافز گوتی: دەسـاقـی پـیـاڵـەیێ بێنە بــەدەستم تـاکو بینۆشم
عیشق ئاسان بوو ئەوەل جار ، لەئاخیردا نەما هۆشم

لەگـەڵ ئـەم هەمـوو چورتمەیـدا[58] لەخوێنـدن کەمتەرخەمـی نەدەکـرد، چـون دەیگـوت سـەناریا زیرەکـەو لەوەیـە لەداهاتـوودا بچێتـە زانکۆیەکـی مـەزن، ناکـرێ مـن زەغەل و تەمـەڵ بـم گـەر ئـەوم بـووێ.

ئیـدی سـیڕاج ئـەو مناڵـەی جـاران نەمـاو پێـی نایـە قۆناغـی ئامادەیـی، وەلـێ هێشـتا هـەر بەخەیاڵـی سـەناریا ژینـی دەگوزەرانـد، ئـەو بـوو بـووە خولیـاو ماخۆلانـی. هێنـدێ جـار خەیاڵـی وەی دەکـرد کەدولبـەر ببێتـە هـی کەسـێکی دیکـە، بیرکردنـەوە لـەم بابەتـە شـێت و سـەرگەردانی دەکـرد و هیـچ چشـتێ ئۆخژنـی[59] نەدەکـردەوە ئەسرینـی چاوەکانـی نەبـێ کەوەکـو بـاران دەڕژانـە سـەر کوڵمـی ژاکاوی[60].

---

٥٧- فەنتازیا: خەیاڵ.

٥٨- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

٥٩- ئۆخژن: ئارام.

٦٠- ژاکاو: سیس.

هەمـوو ڕۆژێ لەبـەر خۆیـدا دەیگـوت: ئـەوە سـێ سـاڵ پـترە کـە لـەو دوورم، ئـەی خودایـە چلـۆن مـاوم، چـۆن نەمـردم بـێ ئـەو ! ئاخـر سـێ سـاڵ چـۆن جەرگـت نابرژێنـێ، چـۆن دەمـار دەمـاری دڵـت ناپچڕێنـێ.

تەنانـەت ڕۆژانـی جەژنیـش ئـازاری سـیڕاجیان دەدا کـە نەیدەتوانـی بزانـێ سـەناریا چـۆن جـەژن دەکا و چـی پۆشـیوە. بۆیـە بـە نێـو توولـە ڕێگاکانـی دێیەکـەدا دەکـەوت و لەبـەر خۆیـەوە دەهاتـە گـۆ: سـەناریا کەسـەکەم، جـەژن هـات و تـۆ هـەر پەیـدا نەبووی، یەشـتا لەبینینـی چـاوە سـەوزە بەهاریەکانـت بـێ بەشـم، سـەرابێکی[٦١] و هەرچەنـدی دەکـەم ناتگەمـێ. داوای لێبوردنـم هەیـە کەناتوانـم بتبینـم، لەوەیـە بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەرگیـز لەخـۆم خـۆش نەبـم.

بـێ تـۆ پرزەدانـم قـوڕس بـووە، چەشـنی ماسـیەکی بـێ چـارە لەدەسـتی ماسـیگرێکدا پـەل دەکوتـم، وەلـێ یەشـتا ڕۆحـم لەبـەردا مـاوە.

تخوا وەرە با ئەم جەژنــە تەنیـا نـەبم بەبـێ تـۆیی
باکاڵ نەبم، بانەسووتێم، نەچمە نێو کۆڕی نامۆیی

دەزانـم ئێسـتا جلـی قەشـەنگت کڕیـون و لەبەرتـان، دەتوانـم وێنـای بکـەم ئـەو دەمـەی بـەو جلانـە خـۆت نومایـان[٦٢] دەکـەی چەنـدە جوانـی، وەلـێ ئەفسـووس[٦٣] کەناتبینـم. خۆزگـە جـارێ بـەم جلـە تازانـە دەمتوانـی تێـت بڕوانـم، دواتـر گـەر کەوتبامـە ئاویلکـەش[٦٤] قەینـاکا، کەناتوانـم بمبـوورە تکایـە. نازانـم کەمـن ئەنگاوتـەی چاوەکانـت بـم چـۆن توانیومـە بـێ تـۆ جلـی جـوان بپۆشـم، ئەسـڵەن چـۆن پێکانـم توانیویانـە بەسـەر زەویـدا ڕێ بکـەن بەبـێ تـۆ.

تخـوا پێـم بێـژە جەژنـە پیـرۆزە لـەکام مەخلـووق بکـەم؟ هیـچ نییـە سـەناریا هیـچ نییـە، تـۆ جـەژن بکـەو بامـن تەعـزێ باربـم، تـۆ دڵخۆشـبە و بامـن خەمباربـم، تـۆ خەنـدەت بێتـێ بائەمـن ئەسریـن، باتـۆ نەگریـەی شـۆخی نازەنیـن.

---

٦١- سەراب: تراویلکە ، خۆڵێکە کە لەبەر هەتاو بریقە دەداو لەئاو دەچێ ، کەنزیک بوویەوە دەزانی ئاو نییە.

٦٢- نومایان: دەرخستن.

٦٣- ئەفسووس: بەداخەوە.

٦٤- ئاویلکە: سەرەمەرگ.



ڕۆژی جـەژنەو خـەڵکی دڵخۆش، هەر منم خەفەتبارم
بـۆیـە من تەعزێ دارم، لـەبـەر نـەبـوونی یــــــارم

کـاشکی بەم جلە جـوانـانە دەمتوانی چـــاوت لێکەم
تـا بـهاتـبـا دەر کـەلـیــمـەی حـەمدو لیللا لــەزارم

ئیـدی سـیڕاج تـا شـەکەت دەبـوو بەبـاڵای دولبەریـدا دەیهۆنیـەوە، بـازێ جاریـش قورئانەکـەی دەردێنـاو چەنـد پەڕێکـی چـاو لـێ دەکـرد، دەسـتەکانی بـەرزەوە دەکـردو لەگـەڵ خـودا دەکەوتـە ڕازو نیـاز و دەیگـوت: خودایـە ئۆخژنـم بکـە و یارمەتـی دەرم بە، چـون لەتـۆ زیاتـر نەکـەس شـک دەبـەم و نەکـەس ئـاگای لێمـە، داوای فەریادڕەسـێکت لـێ دەکـەم و دڵـی بچووکـم بەبـێ قـەراری مێڵـەوە.



## ١٩٨٦ی میلادی، پیرە پیاوێکی نەناسراو.

نزیکـەی سـاڵێ دەبـوو پیـرە پیاوێـک ڕووی لەشـاخان کردبـوو، لـە لێـواری نزیـک کانیـاوی سـازگاری دێیەکـە ژوورێکـی بچووکـی قوڕینـی سـازدابوو. ڕۆژێ لەماڵەکەی دابـوو ڕۆژێکـی دیـش سـەردانی چیـا بەرزەکانـی دەکـرد و ئەشـکەوتێکی بـەرزی کردبـووە پەنـاگای.

سـەیر لەوەدابـوو نەسـەردانی کەسـی دەکـردو نەدەیشـی هێشـت کەسـێ پـێ بخاتـە ماڵەکـەی.

تەمەنـی نزیـک حەفتـا سـاڵ دەبـوو، ڕیشـێکی چـڕو پـڕی بەفرینـی هەبـوو کەتاوەکـو سـنگی دەهـات، جەسـتەیەکی باریـک و درێـژ، وەلـێ بەهێـزو خۆڕاگـر کەدەیتوانـی بەسـەر چیـا بەرزەکانـدا هەڵزنـێ [٦٥].

ڕوخسـارێکی سـپی و سـوور کـە بەکەمـی لۆچەکانـی تەوێڵیـت دەبینـی، زۆرکات قەمیـس و شـەرواڵێکی سـپی دەپۆشـی کـە لەگـەڵ ڕیشـە سـپیەکەیدا سـەرپاکی سـپی هەڵدەگـەڕا.

٦٥- هەڵزنین: سەرکەوتن بەسەر شوێنێکی بەرز.

زۆرێـک لەخەڵکەکـە لێـی دەترسـان و نزیـک مەنزڵگاکـەی نەدەبـوون، تەنانـەت بـازێ پێیـان وابـوو کەسـێکی شـێتە، بازێکیـش وەکـو ڕەبـەن ستایشـیان دەکـردو دەیـان گوت کـە بینیومانـە لەشـەودا ڕووناکـی لەبـان کوخەکـەی بـەرز بۆتـەوە. هێندێکیـش دەیـان گـوت کەماڵەکـەی پڕیەتـی لەجنۆکـەو بینیومانـە زۆرجـار هاتۆتـە دەرو لەبـەر خۆیـدا گفتوگـۆی کـردووە.

بۆیـە کـەس نزیـک ئـەم کوخـە نەدەکەوتـەوە و هیـچ بنیادەمێکیـش نەیدەوێـرا بڕواتـە ئەشـکەوتەکە و بـۆی بنـوارێ.

خونچـە تـازە دەمیـان دەکـردەوە، تەمەنـی سـیڕاجیش هـەر شـازدە سـاڵ دەبـوو، دەمـەو بەیانیـەک بەنێـو دێکـەدا پیاسـەی دەکـرد، لەگـەڵ دارو بـەردو لـق و پـۆپ و گـوڵ و گەڵاکانـی دێیەکـەدا دەهاتـە گـۆو هۆنـراوەی بـۆ دەخوێندنـەوە.

بـێ ویسـتی خـۆی ڕێـی کەوتـە بـەردەم کوخـی مامـە پیـرە و ڕوانـی وا پیاوێکـی جـل سـپی لەبـەردەم کوخەکـەدا کەوتـووە و هیـچ جووڵەیەکـی نییـە.

بەتـرس و لـەرزەوە لێـی نزیـک بوویـەوە: مامـە.... مامـە... بـۆ لەوێـدا کەوتـووی، چیت لێ هاتـــووە؟

هیـچ دەنگـێ نەبـوو وەڵامـی داتـەوە، لـەوە دەچـوو وەفاتـی کردبـێ. خێـرا ڕای کـردو باوکـی و هەنـدێ لەخەڵکـی گوندەکـەی ئـاگادار کـردەوە، کـە هاتـن سـەیریان کـرد مامـە پیـرە گیانـی لەبـەردا نەمابـوو، وەفاتـی کردبـوو.

خێـرا بەترسـەوە شـۆردیان و کفنیـان لـێ پێچـاو لەنزیـک کوخەکەیـدا گۆڕێکیـان بـۆ هەڵکەنـد و ناشـتیان. وەلـێ هیـچ کەسـێ بوێـری ئـەوەی نەبـوو دەرگای کوخەکـەی بکاتـەوە، چـون یەکـێ دەیگـوت نەکـەن دەسـتکاری بکـەن، بەچـاوی خـۆم بینیومـە کـە جنۆکـەی لـێ هاتۆتـە دەر، دەترسـم بیکەنـەوە ماڵەکانـی ئێمـەش جنۆکـەی تـێ بکـەوێ و خاکبەسـەر بیـن، بۆیـە هەمـوو گەڕانـەوەو چ کـەس نزیکـی کوخەکـە نەبـوو.

سـیڕاج مەراقـی کـرد کەدەبـێ چـی لەوێدابـێ خەڵـک ئـاوا لێـی تۆقیـون ! دەبـێ چ گەنجینەیـەک هەبـێ لـەژوورێ کـە ئـەم مامـە پیرەیـە لـەو مـاوە درێـژەدا نەیهێشـتووە کەسـێ ڕوو لەماڵـی بـکا.

بڕیاریدا هەرچۆنێ بێ ترس وەلا بنێ و سەردانێکی ئەم ماڵە بچووکە بکا.

بەیانیەکەی زوو لەخەو ڕابوو، هیچ کام لەئەندامانی ماڵەوە خەبەریان نەبوو بوویەوە، بەئەسپایی بەرەو دەرگا هەنگاوی نا، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکرێ بەرەو کوخی مامە پیرە تێی تەقاند.

یەشتا تاریک و ڕوونی بەری بەیان بوو کەگەیشتە بەردەم کوخەکە، بەترس و لەرزێکەوە دەستی بۆ دەرگا دارینەکە بردو پاڵێکی پێوە ناو لەترسا کشایەوە دواوە.

پرزەی بەتوندی لێی دەدا، تۆزێ وەستا تاکو ئۆخژن بوویەوە، ئینجا بەتوندی خۆی بەژووریدا کرد.

لەبەر ئەوەی کازیوە بوو هێشتا بەباشی چشتەکانی دەوروبەری نەدەبینی و لەترساش ئارەقەی لێ دەتکا.

لەپڕدا دیەی کەوتە سەر فانۆسێک کەتۆزێ نەوتی تیا مابوو، شقارتەکەش هەر لەئاتەکی[٦٦] دانرابوو، بەخێرایی دایگیرساندو بەترسەوە لەچوار دەوری ژوورەکەی ڕوانی. تۆزێ نانی ڕەق و ئامانێک[٦٧] و بادیەک[٦٨] ئاو لەزاویەیەک دانرابوو، سەیرێکی ئەولاتری کرد جلێکی کوردی سپی کەلە کۆنیان نەختێ بۆر بوو بوو دەق کرابوو لەسەر زەویەکەدا لەگەڵ بەرماڵێک.

بەرێکی شپرزە لەسەر زەویەکە ڕاخرابوو، تۆزێکی دی چاوی سووڕاند سەرینێک و لێفەیەکی سەوزی کەوتە بەرچاو.

لەبەر خۆیەوە گوتی ئەمە هەموو ماڵەکەیەتی، ئاخر چۆن مرۆڤێک بەوەندە کەلوپەل و خواردنە کەمە ژیاوە، چۆن هیچ سەروەتێکی لەدوای خۆیەوە جێ نەهێشتووە بەڕاستی سەیرە!

دەستێکی گەیاندە بادیە ئاوەکەو چاوی سووڕاندو ڕوانی لەپشتی دەرگاکە بە ڕێنووسێکی گەورە نووسراوە: (**بەخێربێی سیراج**)، سیراج زەندەقی چوو، بادیەکەی لەدەست بەربوویەوەو پارچە پارچەبوو، هەموو گیانی کەوتە لەرزە لەرز.

چی چی ! خۆ ئەو مردووە، دڵنیام ئەوە جنەکانن، پێویستە خۆم دەربازکەم، خێرا بەرەو دەرگاکە چوو، وەلێ چاوی کەوتە سەر دێرە نووسینێکی دی: (مەترسە کوڕم، ئێرە

---

٦٦- ئاتەک: تەنیشت.

٦٧- ئامان: قاپ و قاچاخی مسین.

٦٨- بادی: جامی ئاو خواردنەوە.

هیـچ جنۆکەیەکـی لـێ نییـە، لێفـە سـەوزەکە هەڵـدەرەوە و بزانە چـی تیایە).

هێزیـدا بـەر خـۆی و تـۆزێ بەسـەر ترسـەکەیدا زاڵ بـوو، بەڕەنگـی پەڕیـو و دەسـتی لەرزۆکـەوە لێفـە سـەوزەکەی لابـردو ڕوانـی دەفتەرێکـی بچـووک و پارچـە پەڕێکـی لەژێردایـە.

سـەرەتا دەسـتی بـۆ پەڕەکـە بـردو خوێندیـەوە: ( **بەخێربێـی بـۆ ماڵەکـەم سـیڕاج، ئەمـە بیسـت ساڵە مـن خەلـوە دەکێشـم و هیـچ کەسـێ سـەردانی نەکـردووم. کارێکـی باشـت کـرد کـە خەڵکـی لادێکـەت لەمردنـم ئـاگادار کـردەوە، زۆر سوپاسـت دەکـەم بـۆ ئەمـە، خـودا نزاکانتـی گیـرا کـردو لەمـەودوا هێنـدێ لـە تەناهیـت[٦٩] پـێ دەبەخشرێ.**

**دەمزانـی کـە هـەر دێـی، بۆیـە ئـەم دەفتـەرە بچووکـەم بـۆ داناویـت، ئەمـە کورتەیەکـی کەمـە لـە باسـی بیروبـاوەڕو ئەقیـدە، کـە یەکێکـە لەزانسـتە گرنگەکانـی ئایـن و پێویسـتە لێـی ئاگاداربـی. وەلـێ دەبـێ بەڵێنـم پـێ بـدەی کەخـۆت نەیخوێنیتـەوە، بەڵکـو بـەدوای مامۆسـتا عەبدولڕەحمان دا بگـەڕێ بـۆ خوێندنـی وانـەکان و هەرچۆنـێ بـێ بیـدۆزەرەوە، دواتـر ڕێنمایـی تـرت پـێ دەگا** ).

سـیڕاج خەریـک بـوو شـێت دەبـوو، ئەندێشـەی تـەواو پەڕاگەندەبـوو، ئارەقـە بەتـەواوی جەسـتەیدا دەتـکا. ئـەی خودایـە مەگـەر ئەمـە نەمـردووە، چۆن دەزانـێ مـن دێـم بـۆ ئێـرە! ئـەی چـۆن دەمناسـێ ! خـۆ لەژیانمـدا نەمـن چـاوم بـەو کەوتـووە لەکاتـی زیندووییـدا نەئەویـش منـی دیـوە ! ئـەی ناوەکەمـی چـۆن زانـی ! تـۆ بڵێـی جنۆکـە نەبووبـێ، یـان فریشـتەبێ، یاخـود تـۆ بڵێـی هێشـتا زینـدوو بـێ؟ وەلـێ خـۆ سوپاسـی کـردم لەسـەر ئـەوەی خەڵکـم لەمردنەکـەی ئـاگادار کردۆتـەوە ، ئـەی چـۆن دەربـارەی نزاکانمـی زانـی، باشـە بۆچـی شـتێکی وا بۆمـن جـێ دێڵـێ، ئـەی مامۆسـتا عبدولڕەحمان کێیـە و چـۆن بیدۆزمـەوە؟!

هەمـوو ئەمانـە پرسـیار گەلـێ بـوون لەهزری سـیڕاجی گەنجدا بـێ وەڵام مابوونـەوە، لە خەیـاڵ و دڵەڕاوکێیەکـی قـووڵ دابـوو، بەشـێوەیەک کـە ئـاگای لەترسـەکەی بڕابوو.

تـا دەهـات لادێکـەش ڕۆنـترو ڕۆنـتر دەبـۆوە، خەریـک بـوو سـەری وەژان دەکـەوت. ئاخـر چـۆن دەبـێ چشـتی وا ڕوویـدا؟ چـۆن مردوویـەک دەتوانـێ ئـاگاداری ژیـان بـێ، سـەرەڕای ئـەوە ژیانـی کەسـێک کەتائێسـتا نەیبینیـوە !.

---

٦٩- تەناهی: ئاسوودەیی.

خێـرا تێنووسـەکەی هەڵگـرت و چوویـە دەرو دەرگاکـەی لـەدوای خـۆی داخسـتەوە، بەڕاکـردن بـەرەو مـاڵ تێـی تەقانـد. بەئەسـپایی دەرگای حەوشـی کـردەوە و چـووە ژووری، ڕوانـی وا دایکـی هەڵسـاوە و نانـی بەیانـی چـێ دەکا.

- ها سیڕاج، چۆنە بەم کاتە هەڵساوی؟ لەسەر ئاو بوویت؟

+ ئەوەی ڕاستی بێ دایکە تۆزێ وەڕەز بووم و چوومە دەرێ پیاسەیەکم کرد.

- ئەیـەڕۆ کـوڕم، دەیـان گـوت سـیڕاجی کـوڕت شـێت بـووە و لەبـەر خۆیـەوە هۆنـراوە دەڵـێ بـاوەڕم نەدەکـرد، لـێ ئێسـتا بەڕاسـتی دەزانـم کەشـێتی، ئـەم بەیانیـە زووە هـی ئەوەیـە کـە پیاسـەی تیـا بکـەی؟

+ هیـچ نییـە دایکـە گیـان، خەمـی منـت نەبـێ یەشـتا شـێت نەبـووم بەتـەواوی، ئەمـەی گـوت وخێـرا خـۆی خزانـدە نێـو پێخەفەکـەی.

- ئـەی خودایـە ڕەحمـان پـێ بکـەی و عەقڵـێ بدەیتـە ئەم کـوڕەی مـن، بەخـوا بەتەواوی سـەری لێ شـێواوە.

نیـو کاژێـری نەبـرد مـام سـلێمان و سـەلمانیش هەڵسـان بـۆ نانـی بەیانـی، چـون دەبوایـە ڕۆژانـە زوو بـڕۆن بـۆ سـەر کارو شـینایی.

سـیڕاج ئـەو ڕۆژە نیـوەڕوان بـوو لەقوتابخانـە و دەیهەویسـت سـەرخەوێکی باشـی بـۆ بشـکێنێ، لـێ چەنـدی کـردی خـەوی لـێ نەکەوتـەوە، بۆیـە ناچـار هەڵسـا و لەگـەڵ ماڵـەوە لەسـەر سـفرەکە ڕوونیشـت.

خاتـوو ڕەحمـە زوو هاتـە دەنـگ و گوتـی: دەزانـی سـلێمان سـیڕاجی کوڕمـان شـێت بـووە، دەڵێـن هێنـدێ جـار بەنێـو دێـدا دەگـەڕێ و هۆنـراوەو چشـت دەخوێنێتـەوە. ئیمـڕۆش دەمـی نوێـژی بەیانـی چووبوویـە دەر بـۆ پیاسـە کـردن، بۆچـی نەیبەینـە لای شـێخێ چارەیەکـی بـکا؟.

+ ئـێ چـی لـێ بکـەم ژنـێ، گوتـم بـا لەگـەڵ خـۆم بیبەمـە سـەر کارو فێـری شـینایی بـێ و ببێتـە مرۆیەکـی بەخۆژیـو،[٧٠] هـەر گوتـت بـا بخوێنـێ و لەماڵـەوەت هێـڵاوە ئـا ئەمـە ئاکامەکـەی بـوو، هـەر نـا ئێسـتا وەکـو سـەلمان فێـری کارێـک دەبـوو.

---

٧٠- بەخۆژیو: کەسێک بەڕەنجی شانی خۆی بژی.



- ئـێ چـی بکـەم پیاوەکـە، منداڵـی خەڵـک هەمـووی بـوو بەمامۆسـتا و دکتـۆرو چشـت، گوتـم بەڵکـو هـی ئێمـەش چشـتێکی لـێ دەرچـێ، چووزانـم شـێت دەبـێ.

سـیڕاج لەژێـرەوە پێدەکەنـی و هیچـی نـەدەوت، لـەو کاتـەدا سـەلمان هەڵـی دایـێ: دەی واز لـەوە بێنـن، مەسـەلەی ژن هێنانەکـەی مـن چـی لـێ هاتـەوە دایکـە، هەمـوو جـارێ دەتگـوت ژن هێنانـی سـەلمان لەئەسـتۆی منـە و هـەر خـۆم دەزانـم کێـی بـۆ دێنـم، دەی ئـەوا ئێسـتا (٢٤) سـاڵم، بۆچـی خۆتـان لێـی بێدەنـگ کـردووە؟

- ئـێ کـوڕم دە ئۆخژنـت [71]هەبـێ، ئـەی نابـێ ماڵێکـی چـاک و خانەدانـت بـۆ بدۆزمـەوە، خـۆ ئێمـە تەماتـە و شـووتی ناکڕیـن.

+ ئـێ دایکـە مـن تاکـەی ئۆخـژن بگـرم، بەخـوا تـا تـۆ یەکـێ دەدۆزیتـەوە مـووی ڕەش بەسـەرمەوە نامێنـێ.

مـام سـلێمان بەپێکەنینـەوە: ڕاسـتدەکات ژنەکـە، ئـەو ئێسـتا تـەواو گـەورە بـووە، بـا ئەمـە زوو لەکـۆڵ کەینـەوە، بەخـوا هـەر موددێکـی دیکەیـە سـیڕاجیش داوای ژنمـان لـێ دەکات.

- وەڵا جا منداڵی ئێستا سەیرو سەمەرەن، خۆ تۆش ژنت ناوێ سیڕاج؟

سـیڕاج بەپێکەنینـەوە گوتـی: نـا دایکـە خەمـی ئەوەتـان نەبـێ، کـەی مرۆڤـی شـێت هـی ژن و ماڵـە.

هەمـوو دەسـتیان کـردە قاقـاو مـام سـلێمان هاتـەوە گـۆ: یـەڵا سـەلمان بادرەنـگ نەکەوین لـەوە زیاتر.

خەمـی سـیڕاج دۆزینـەوەی مامۆسـتا عەبدولڕەحـمان بـوو لەئێسـتادا، لەدێیەکـەی خۆیانـدا کەسـێکی بـەم نـاوە نەبیسـتبوو، بۆیـە ڕووی لەدایکـی کـردو گوتـی: دایکـە گیـان کەسـێ دەناسـی نـاوی مامۆسـتا عەبدولڕەحـمان بـێ؟

- وەڵاهـی کـوڕم چەنـد ڕەحمانێـک لێـرە هـەن، ڕەحمانـی حەسـەن فاتـێ و ڕەحمانـی ئەحمـەد قەلەنـدەرو ڕەحمانـە گـۆج و... وەلـێ ئەوانـە شـتاقیان[72] مامۆسـتا نیین. نـەم زانیوە لێرە مامۆستایەک بەو ناوە هەبێت، ئەوەت لەکوێ هێنا لەو دەمە؟

---

٧١- ئۆخژن: ئارام.

٧٢- شتاقیان: هیچیان.

+ هیـچ نییـە دایکـە لەکەسـێکم ژنـەوت، گوتـم نـەکا لـەم گونـدە مرۆیەکـی وا هەبـێ، باشـە مـن دەڕۆم پیاسـەیێ دەکـەم.

- بۆ کوێ دیسان مەجنون؟ ئەوە بۆ خولەکێ گیر نابی لەماڵەوە.

+ ئێ گەر پیاسەیێ نەکەم وەڕەز دەبم دایکە.

سـیڕاج بـۆ گەڕان بەدوای مامۆسـتا ڕۆیشـتە دەرەوە، سـەردانی مـام تاهیرو مـام تۆفیق و مـام ئەحمـەدی کـرد کەئەمانە کەسـانی دیـاری دێیەکـەن و هەرکەسـێ لەوێدا نیشـتەجێ بـێ لای ئەمانـە نـاسراوە، وەلێ هیـچ کامیان چـی لەبـارەی مامۆسـتاوە نەدەزانی.

بەبـێ تاقەتـی چوویـە سـەر کانیەکـە و لەپەنایەکـدا ڕوونیشـت و ڕۆچـوو لەنێـو فکرانـدا، لەلایـێ سـەناریا و لەلایـێ مامەپیـرە و لەلایـێ مامۆسـتا.

لەو کاتەدا سیروانی کوڕی مام ئەحمەد، کە لەتەمەنی سیڕاجدابوو دەرکەوت.

- ها سیڕاج، چۆنە بەتەنیا لێرە ڕوونیشتووی؟

+ زۆر وەڕەز بووم، هاتم لێرە هەوایێ بگۆڕم.

- ئـێ حاڵـت چۆنـە کاکـە، دەزانـی تـۆ زۆر خـۆ لەخەڵـک نـادەی، کـورە هەمـوو جـارێ بەمناڵـی بەیەکـەوە بـاش یاریـمان دەکـرد، چاوشـارکێ و کێلەبەردانێـی ئەوسـات بیـرە، بەخـوا سـەردەمانێکی خۆشـمان بـەڕێ کـرد بـرا.

+ ئاای هەی، وادەزانم دوێنێ بوو، چۆنم بیر نییە، خۆ ئێستاش هەر مناڵین سیروان.

- سـیڕاج مـن هاوڕێیەتـی هەمـوو کـەس ناکـەم و کەمیـش لەمـاڵ دەردەچـم، بۆچـی وێنـەی ئـەو سـەردەمە نەبینـەوە هـاوڕێ؟ گـەر لات ئاسـایی بـێ حـەزم لێیـە زوو زوو یەکـدی ببینیـن.

+ ئەمـە کـەی قسـەیە بـرا، ئێمـە هـەر هـاوڕێ و بـرای یەکدیـن، بەخـوا منیـش هەمـوو کـەس بەهـاوڕێ ناگـرم، ئـەوەی زۆر لەگەڵـی بـووم ئەمیـر بـوو، ئێسـتا ئەویـش لەگـەڵ باوکـی دەچێتـە کارو لەقوتابخانـە نەبێـت زۆرکـەم یەکـدی دەبینیـن، لەوەشـە هاوڕێـی تـری گرتـبن.

- زۆر سوپاسـت دەکـەم سـیڕاج گیـان، وەلـێ لەشـتێ مـەراق بـووم، ئایـا ئەو مامۆسـتایە کێیـە کەتـۆزێ لەمەوبـەر سـەبارەت بەئـەو لەباوکمت دەپرسـی؟

+ ئەها، پیاوێکە ناوی مامۆستا عەبدولڕەحمانە، دەمەوێ بیدۆزمەوە، زۆرم کار پێیەتی.

- باشە تۆ ئەوت بینیوە، ئەی نازانی لەکوێ دەژی؟

+ نەخێر، تەنێ دەزانم کەسێکی وا بوونی هەیە.

- ئەوەی ڕاستی بێ سیڕاج من ناوێکی وام بیستووە، ماڵی خاڵێکم لە (ئاودەر) دەژین، دووساڵ بەرلە ئێستا ڕۆژێ لەماڵی ئەوان بووم، لەشارەدێکەدا بەپێی پەتی هەڵدەهاتم و یاریم دەکرد، لەپڕدا پێم چوو بەپارچە شووشەیەکی بچووکدا و خوێن فڕکەی کرد، چی واشم لانەبوو بیبەستم. پیاوێکم لێ دەرکەوت دەوروبەری چل ساڵێک دەبوو، بەرەو ڕووم هات و پارچەیەکی لەکراسەکەی خۆی دڕی و برینەکەی بەستم، من نەمزانی ئەو کێ بوو، وەلێ کاتێ ویستی بڕوا کەسێ لەدوایەوە گوتی مامۆستا عەبدولڕەحمان درەنگ دەکەوین، هێشتا ڕوخساریم لەیادە.

+ ئابێنە ماچێکم بەرێ سیروان، کورە تۆ لەکوێ بۆمن پەیدابووی، بەخوا زۆرت کەیف ساز کردم، من هەموو ڕۆژێ بۆ قوتابخانە دەڕۆم بۆ ئاودەر، کەواتە کارەکە زۆر ئاسان دەبێ، زۆرت سوپاس دەکەم.

- شایەنی نییە برا لەخزمەت دام.

+ باشە خەریکە دەبێ بەنیوەڕۆ، دەبێ بچمەوە و خۆم بۆ قوتابخانە ئامادەکەم، خوا ئاگادارت بێ.

- خوات لەگەڵ بێ سیڕاج، لەیادم نەکەی ئێمە هاوڕێین.

سیڕاج خێرا تێی تەقاند بۆ ماڵ، بەشەوقەوە نانەکەی خوارد و بەرەو قوتابخانە وەڕێ کەوت.

ئەم ماوەیە بەتەنیا بۆ قوتابخانە دەڕۆیی، چون ئەمیر باوکی هاتوچۆی پێ دەکرد.

ئەو ڕۆژە هیچ ئاگاداری وانەکانی نەبوو، هەر بیری لای ئەوە بوو زوو تەواو بێ و بچێتە دەر بۆ دۆزینەوەی مامۆستا.

وانەکان تەواو بوون و بەڕاکردن چوویە دەرو بەهەرکەسێ دەگەیی پرسیاری لێ دەکرد، لێ کەس جێگا و سۆراغی مامۆستای نەدەزانی. لەکۆتاییدا شەکەت بوو، لەسەر بەردێ ڕوونیشت و بیری لای کات نەمابوو، زۆری تینوو بوو.

شـوانێ بەلایـدا ڕابـورد و سـیڕاج بانگـی کـرد: هێـی کاکـی شـوان، ئـاوت لایـە، زۆرم تینـووە؟.

شـوان دەبەیەکـی لەسـەر پشـتی گوێدرێژەکـەی دەرێنـاو گوتـی ئـادەی دەمـت بکـەرەوە تـا چۆڕێکـت دەمـێ.

سـیڕاج هەرچەنـدی کـرد پێکەنینـی دەهاتـێ و بەدەسـتی شـوانە بـۆی نەدەخورایـەوە و گوتـی: جـا ئەمـەی بۆچیـە بـرا، بیـدەرە دەسـتم بەخـوا زۆرم تینـووە، ئـاوا قدیلـەم دێتـێ و بـۆم ناخورێتـەوە.

- کاکـە هـەر بایـی خۆمـم ئـاو لایـە، تـۆ نازانی لەم دەشـت و کێـوەدا چەنـدە مانـدوو دەبم بـەم ئاژەڵانـە، گـەر نـاڕازی بڕۆ خـۆت لەبیرەکە ئـاو هەڵێنجـە، مەگـەر شـارەزاییت نییە؟

+ نـەوەڵا خەڵکـی ئێـرە نییـم، قوتابیـم و بـەدوای کەسـێک دەگـەڕام، هـەر بەڕاسـت ئایـا کەسـێک دەناسـی بەنـاوی مامۆسـتا عەبدولڕەحمان؟

شـوانە دوای تـۆزێ تێڕامـان گوتـی: لەڕاسـتیدا کەسـێک هەیـە نـاوی عەبدولڕەحمانـە، پێـم بێـژە مامۆسـتای چییـە؟ لـەوە ناچـێ ئـەو مامۆسـتابێ.

+ نازانم، لەوە دەچێ مامۆستای ئاین و چشت بێ.

- ئەهـا دەبـێ خـۆی بـێ، بەمـەلا بانگـی دەکـەن، لـە بـواری ئایـن ئەبقـەری دیـارە، وەلـێ بەخـوا نازانـم ماڵـی لەکوێیـە، چـون هەمـووی دووسـێ جـار بینیومـە و تێکەڵـی خەڵـک نابـێ ئـەم پیـاوە، منیـش درەنگمـە و لازمـە بـڕۆم، ئینشـاڵا دەیدۆزیتـەوە.

سـیڕاج دووبـارە دەسـتی بەڕۆیشـتن کـردەوە، لەڕاسـتیدا خۆشـی نەیدەزانـی بـەرەو کام لا دەڕوا، هـەر هێنـدەی زانـی چـاوی کەوتـە سـەر بیـرە ئاوێـک کەچەنـد کەسـێ تێـی ئاڵابـوون و بەنۆبـەت ئاویـان لـێ هەڵدێنجـا. لەبـەر ماندوویـی چـوو لەژێـر درەختێکـی نزیـک بیرەکـە ڕوونیشـت و چاوەنووڕبـوو تـا ئـەوان بـڕۆن و خـۆی تێـراوکا و پـرزەی[٧٣] بەبەردا بێتەوە.

-٧٣ پرزە: هەناسە.





## ئیلهامێکی ژاکاو

ئیلهـام تـازە لەقوتابخانـە هاتبوویـەوە، کـە گریانـی خوشـکە بچووکەکـەی ژنـەوت زوو زانـی برسـیەتی، خێـرا هەڵسـا تـا تـۆزێ ئـاو گـەرم بـکا و بـە بیانـووی چێشـت لێنـان خوشـکەکەی ژێرکاتـەوە، وەلـێ کەسـەیری کـرد دڵۆپـە ئاوێکیـش لەنێـو شـەربەکەدا[٧٤] نەمابـوو.

بەتـەواوی نارەحـەت بـوو، لەبـەر گریـەی خوشـکە بچووکەکـەی ماندووبوونـی قوتابخانـە و برسـیەتی خـۆی لەبیرچووبوویـەوە، خێـرا ڕووی لەدایکـی کـرد و بـە نیگاییێکـی بـێ هیوایانـە و پرسـیار ئامێـز تێـی ڕوانـی کـە بۆچـی شـەربەکە خاڵیـە لەئـاو؟.

- کچـی شـیرینم هـەر ئێسـتا خەریـک بـووم دەچـووم ئـاو بێنـم، ئیمـڕۆ باوکتـان تایەکـی گەرمـی لێیـە و لەبـەر سەرسـوورە نەیتوانـی بچـێ ئـاو هەڵێنجـێ و لـەژووری کەوتووە، ئاخـر دوێنـێ هـەر ئاومـان خواردۆتـەوە، جگـە لـەو سـەموونەی کەماڵـی مـام حەمیـدی دراوسـێ هێنایـان و بـۆ ئیسـڕامان لـە ئـاو خسـت.

---

٧٤- شەربە: گۆزەڵەیەکی گڵینی تەنکی بەچەرخ گێڕدراوی سوورەوەکراوی سپییە ئاوی تێ دەکرێ.

+ نـا دایـه تـۆ بـۆ هیـچ شـوێنێ ناچـی، بـۆ خـۆت سـاغ و تەندروسـت نـی ئیـدی چـۆن سـەتڵە ئـاوت بـۆ هەڵدەگیـرێ، مـن لەگـەڵ ئیسـڕا دەڕۆیـن و زوو دێینـەوە، سـا بەڵکـو ئەویـش تـۆزێ مـژووڵ بـێ و چیـدی نەگـری. ئیسـڕا، ئیسـڕا خێـرا وەرە بـا بڕۆیـن.

- ئاخـر کچـم چـۆن دەبـێ کچێکـی شـلکی[75] وەکـو تـۆ خـۆی لـەم ڕێگایـە بـدا، لەوەیـە خەڵـک قسـەمان لەسـەر بکـەن.

+ نـا دایـە گیـان خەمـی منت نەبـێ، خۆ ئێمـە بۆ خەڵـک ناژین، ئەگـەر خەڵـک ویژدانیان هەبوایـە ئێمـە ئاوا لات و برسـی نەدەبووین، سـەد شـوکر بۆ خودا، سـەد شـوکر.

ئیلهـام دەسـتی ئیسـڕای بچووکـی گـرت و وەڕێ کەوتـن، بەهارێکـی ڕەنـگاو ڕەنـگ بـوو، تـەواوی خونچـەکان دەمیـان لێـک کردبوویـەوە و وەکـو کچێکـی شـەنگ و شـۆخ نازیـان بەسـەر زەویـدا دەکـرد. ئیلهـام بەنێـو گوڵـە سـوورەکاندا دەڕۆیـی، لەنێـو هەموویانـدا تەنـێ ئـەو ژاکاو بـوو، ئاخـر برسـیەتی و بێنەوایـی ڕەنـگ زەرد و زارو نەزاریـان[76] کردبـوو دەنـا ئـەو سـەرتۆپی جوانـان بـوو، نەشـمیل و خەرامـان[77] و خانـەدان بـوو، کچێکـی تـازە چـرۆ کـردووی لەچـک شـینی قەڕنەفـل لەمـل، بـەدوو دیـەی قاوەیـی تۆخـی ئاسـکانەوە کـە حەقـی خـۆی بـوو نـاز بەسـەر تـەواوی گوڵانـدا بـکا، وەلـێ ئـاخ لـە هـەژاری کەچـۆن پشـتی گەنـج و مناڵیـش دەچەمێنێتـەوە، ئـەو هێنـدە لاواز ببـوو کـە لەوەبـوو بایەکـی بەهێـز هەڵـی فڕێنـێ، دایکـە هەڵۆیـەک هەڵـی گـرێ و وەکـو نێچیـر بـۆ بێچوەکانـی بێنـێ، بەڕوونـی دەتتوانـی تـەواوی دەمارەکانـی ئیلهـام لەجەسـتەیدا سـەرژمێر بکـەی، سـەرەڕای ئـەوەش یەشـتا گوڵـەکان لەئاسـتیدا سـەریان نـزم بـوو، یەشـتا بـە سـەرکردەی خۆیـان دەزانـی و چاویـان لـە فەرمانـی ئـەو بـوو.

ئـەو دەمـەی گەیشـتنە بیرەکـە لـەدواوەی خەڵکەکـە وەسـتان و چاوەنـوڕ بـوون تاوەکو چـۆڵ بـێ و لـەدوای ئەوانـەوە سـەتڵەکە پـڕ ئـاو بکـەن.

ئیسڕای بچووک هاتە گۆ: خوشکێ زۆرم برسیە، کەی نان دەخۆین؟

+ ئێسـتا کـە ئاوەکەمـان بـردەوە چارەسـەری ئـەوەش دەکەیـن، دە تۆزێکـی دیکـەش خـۆت بگـرە، نازانـی ئـەو چەنـد ڕۆژە بابـە نەخۆشـە و نەیتوانیـوە کار بـکا.

---

٧٥- شلک: نازک، گەنج.

٧٦- زارو نەزاری: لەڕو لاوازی.

٧٧- خەرامان: ئافرەتی شەنگ و شۆخ.

- باشە من بێتاقەتم و تۆزێ ڕوودەنیشم، ئیلهام گیان ئەم خەڵکەش هەمووی وەک ئێمە برسیانە وانیە؟

+ ئەرێ دادەکەم برسیانە، زۆریشیان برسیە، وەلێ ئەوان خۆگرن.

- ئەی باشە ئەم پیاوە زلەی ئەولا بۆچی ئەو مەڕەی لایەتی نایکوژێتەوە ئەگەر برسیەتی؟

+ ئاخر دیارە بۆی غەمبار دەبێ ئەگەر بیکوژێتەوە، چون لە بچووکیەوە بەخێوی کردووە و ئولفەتی پێ گرتووە.

- ئەدی بۆخۆی غەمبار نابێ ئەگەر برسی بێ، یان بۆ ئەم خەڵکە غەمبار نابێ؟

+ نازانم بەخوا، نازانم ئیسرا چیت پێ بێژم، ئیمڕۆ کەس بۆکەس غەمبار نابێ.

- دادە ئیلهام، دەڵێن کچان ئەگەر گەورەبوون شوو دەکەن وایە؟

+ ئەرێ وایە، تۆ چیت داوە لەم باسە جارێ بەم بچووکیەت.

- دەی ئەگەر تۆ شووت کرد من چی بکەم بە تەنیا، ئاخر وەڕەزو بێتاقەت دەبم بۆت.

+ هێواش بدوێ با خەڵک گوێبیستمان نەبێ، من شوو ناکەم جارێ، تۆ بۆچی بیر لەو بابەتانە دەکەیتەوە.

- ئاخر ئەگەر شووت کرد پێم خۆشە هاوسەرەکەت مرۆیەکی دەوڵەمەند بێ و بەئەسپێکی ڕەشی قەترانی باڵا بەرز بتبا، ئینجا منیش دێم لەگەڵ تۆ دەژیم و هەموو ڕۆژێ بەیەکەوە ماست و پەنیریش دەخۆین و برسیشمان نابێت، وەلێ دەبێ ئەو دەم ئاگامان لە دایە و بابەش بێ و خواردن بۆ ئەوانیش ببەین، بەخوا زۆر بیریان دەکەم ئەوکات.

ئیلهام بەو گوتانەی خوشکەکەی فرمێسک لەچاوەکانی ترازان و ڕوومەتی وەک گوڵی سوور و گەردنی نەسرینی تەڕبوون، وەلێ ڕووی خۆی وەرگێڕا و نەیهێشت ئیسڕا درکی پێ بکا و هیچی بۆ نەگوترا.

ئیسڕای بچووک هاتەوە دەنگ: دادە ئیلهام گیان تۆ چیرۆکی ساندرێلات بیستووە؟

+ ئەرێ بیستوومە گیانەکەم.

- دایکم دەیگوت ساندرێلا هەروەکو ئیلهام وابوو، زۆر جوان بوو، ئەو زۆر بە هەژاری دەژیا، تاوەکو ڕۆژێک شازادەیەک هات و لەگەڵ خۆیدا بردی، دواتر لەکۆشکی شاهانەدا سەراپای ژیانی خۆی بەڕێ کرد، تەواوی چیرۆکەکەم لەیاد نییە، وەلێ بەپێی قسەکانی دایکم بێ دەبێ ئەو شازادەیە ڕۆژێک بێتە دوای تۆش، زۆر بەپەرۆشم بۆ ئەو ڕۆژە خوشکێ زۆر.

ئیلهام کە چاوەکانی ئەسرینی تێ زابوون گوتی ؛ واز لەوە بێنە گیانەکەم، ئەوە خەڵکی ڕۆیشتن با سەتڵەکەمان پڕ ئاو بکەین.

هەردوو لەسەر بیرەکە وەستان و ئیلهام دۆڵچەکەی داهێشتە ناوی تاوەکو پڕ ئاوبوو، وەلێ ئەو دەمەی ویستی هەڵی کێشێتەوە هەستی کرد لەبەر ماندوویی و لاوازی تینی بەسەردا نەدەشکا و بۆی هەڵنەدەکێشرا، ئەمجارەیان ئیسڕاش دەستی بە پەتەکەوە گرت، لێ پێکانی خزی و بەربوویەوە، پەنجەی چوو بە دڕوێکدا و دەستی بەگریان کرد.

ئیلهام لەبەر گریانی ئیسڕا ئاگای لەبیرەکە نەما و خەریک بوو دڕووی لەپەنجەی خوشکەکەی دەردێنا. ناچار هەردوو بە بێتاقەتی لەوێ ڕوونیشتن و بیری ڕێگا چارەیەکیان دەکردەوە.

لەپڕدا ئیسڕا وەدەنگ هات: سەیرکە خوشکێ، ئەم لاوە لەژێر ئەم درەختەدا ڕوونیشتووە، دەچم دەڵێم بێ یارمەتیمان دا.

+ نا نا نەکەی ئیسڕا، ئێمە ئەوە ناناسین، کێ دەڵێ مرۆیەکی چاکەخوازە.

- ئێ خۆ مرۆڤە، چۆن یارمەتیمان نادا؟

+ گیانەکەی من خۆ هەموو مرۆڤێک باش نییە، کەسانی خراپیش هەن.

سیراج موددێک بوو تێیان ڕامابوو، هەستی دەکرد پێویستیان بەیارمەتیە و شەرمیشی دەکرد لێیان وە نزیک کەوێ، لەجێگاکەی خۆی هەڵسایەوە و هاواری کرد: کچینە چی دەکەن لەوێ و کارتان چی یە؟[78]

---

٧٨- ئاماژەیە بۆ بەسەرهاتی حەزرەتی موسا و کچەکانی پەیامبەر شوعەیب، لەئایەتی ٢٣ی سورەتی قەسەس دا تۆمارە.

ئیلهـام خێـرا سـەری خـۆی داگـرت و بەشـەرمەوە وەڵامـی دایـەوە ؛ هاتوویـن ئـاو هەڵێنجیـن، وەلـێ ناتوانیـن و نازانیـن چـی بکەیـن، باوکیشـمان زۆر نەخۆشـە.

سـیڕاج بەبـێ ئـەوەی هیـچ ببێـژێ لەگەڵیانـدا خێـرا چـوو سـەتڵەکەی بـۆ پـڕ ئـاو کـردن و هێندێکیشـی بۆخـۆی خـواردەوە و گەڕایـەوە ژێـر درەختەکـە تـا وچانێـک بـدا، لەوێـدا زۆری نـزا کـرد کـە خـودا کۆمەکـی بـکا.

هێنـدەی پێنەچـوو کـە ئیلهـام بەشـەرم و حیشـمەتێکی زۆرەوە دەرکەوتـەوە و گوتـی: باوکـم بانگـت دەکا و دەیهـەوێ سوپاسـت بـکا لەسـەر ئـەوەی یارمەتـی ئێمـەت دا.

سـیڕاج ئەگەرچـی پەلـەی بـوو، وەلـێ شـەرمی کـرد ئـەم بانگێشـتە ڕەتکاتـەوە، چـون ئـەم کچـە لـەم ڕێگایـەوە لەبـەر خاتـری ئـەو گەڕاوەتـەوە و ناکـرێ بـەدڵ ساردی بچێتـەوە، سـا بەڵکـو لـەوێ سـۆراغێکی مامۆستاشـی دەسـکەوێ.

لەڕێـگادا ئیلهـام شـەرم و شـکۆیەکی وەهـای لێدەبـاری کـە سـیڕاجی سەراسـیمە کردبـوو، تـا گەیشـتن هیچیـان نقەیـان لێـوە نەهـات.

دوای ئـەوەی لـە دەرگایانـدا و دەرگا کرایـەوە، پیاوێکـی بـاڵا ناوەنـدی سـنگ پـان، خاوەنـی دوو چـاوی ڕەش کەلـەوە دەچـوو کلـی تـێ کردبـن، هـاوڕێ لەگـەڵ تەنکـە ڕیشـێکی ڕەش، وێدەچـوو تەمەنـی چلـەکان بـێ، لـێ تـەواو بێتاقـەت و ناسـاغ دیاربـوو، بفەرمـوو براکـەم، یاخـوا بەخێربێـی.

سـیڕاج بەشـەرمەوە وەژوور کـەوت، خانوێکـی چکۆلـەی دوو ژووری کـە کەلوپەلێکـی کەمـی تیـا بـەدی دەکـرا، دیاربـوو کـە خێزانێکـی زۆر هـەژارن، وەلـێ هێنـدە بەجوانـی سـیڕاجیان بەخێـر هێنـا و ڕێزیـان گـرت هـەر شـایەن بـوو بەخانـەدان و زەنگینـان.

کچـەکان لەگـەڵ دایکیـان چوونـە ژووری ئەودیـو تاکـو میـوان و باوکـی ئیلهـام بەتەنها لەگـەڵ یەکدیـدا بدوێـن. خێـرا ئیسـڕای بچـووک دوو بادیـە ئـاوی بـۆ بابـی و سـیڕاج بـردن و گەڕایـەوە ژوور.

- بـەدوام نـاردی تاوەکـو سوپاسـت بکـەم کـوڕی خـۆم، کچەکانـم لەپاکـی و ڕەوشـتی بـەرزت دەدوان، مـرۆی چاکەخـواز لەهـەر شـوێنێ هەبـێ خۆشـم دەوێ، پێـم بێـژە نـاوت چـی یـە؟ لـەوە ناچـێ خەڵکـی ئێرەبـی؟

+ زۆر سوپاست دەکەم قوربان، لە گەورەیی خۆتانە، ناوم سیڕاجە و خەڵکی ئێرە نییم، لێرە قوتابی ئامادەییم و بەدوای کەسێک دەگەڕێم نێوی مامۆستا عەبدولڕەحمانە، گەر بیناسن زۆر دڵخۆشم دەکەن.

- تۆ ئەم کابرایەت بۆچی یە، چ سوودێکی لێ دەبینی؟

+ دەمهەوێ وانەیەکی ئاینی لەلا بخوێنم، وام وەسیەت بۆ کراوە.

- بمبوورە کە دێمە نێو باسەکەت، وەلێ من ئەم کابرایە دەناسم، کەسێکی هێندە باش نییە، دەکرێ بزانم کێ ئەم وەسیەتەی بۆ کردووی؟

+ مامە پیرە، تۆ نایناسی، لەڕاستیدا منیش باش نایناسم، مرۆیەکی تەواو سەیربوو، لە کۆتا تەمەنیدا هاتبوویە لادێکەمان و تێکەڵی کەسی نەدەکرد، ئەو بەر لە مردنی نامەیەکی بۆ جێهێشتم کە ئەو مامۆستایە بدۆزمەوە، ئیدی باسەکە دوورو درێژە.

- دەتوانی نامەکەم نیشان بدەی، لەوەیە بتوانم یارمەتیت بدەم بۆ دۆزینەوەی.

سیڕاج نامەکەی لەنێو جانتاکەی دەرهێنا و دایە دەستی. بابای نەناسراو نامەکەی لێ وەرگرت و تاوێ تێی ڕاما، لەپڕدا ئەسرین لەچاوانیدا ڕیزیان بەست و تا ماوەیێ هیچی بۆ نەگوترا، سیڕاجیش بەڕوخساریدا واق بوو بوو،[٧٩] دەیگوت چی بووە قوربان تکایە! پێم بێژن چی ڕوویدا؟

کابرا بەچاوی پڕ گریانەوە کە بەئاستەم قسەی بۆ دەکرا، دەتگوت لە ئاویلکە[٨٠] دایە، هاتە گۆو گوتی: کوڕم، ئەوەی باسی دەکەی مامەپیرە نییە، ئەمە دەست و خەتی شێخ (موستەفا)یە، بیست ساڵە کون و کەلەبەری ئەم زەمینەی بۆ دەگەڕێم، بەم دوا دواییە تەواو بێ هیوابووم لەدۆزینەوەی، وام زانی وەفاتی فەرمووە. ئێمە کۆمەڵە گەنجێ بووین لە فێرخواز و موریدانی شێخ، لەپڕێکدا ڕۆژێ لێمان ون بوو، زۆر بەدوایدا وێڵ بووین و نەمان دۆزیەوە. ئەو باوکی ڕۆحی ئێمە بوو، وەلێ داخی گرانم کەپاشەوار[٨١] بوو و کەسی لەدوای خۆی جێ نەهێڵا.

سیڕاج لەم گوتانە سەراسیمە بوو، ئەو کەسەی کەهەموو خەڵکی گوند لێی تۆقی بوون، کەس نەیدەوێرا نزیک ماڵەکەی بێ، وایان دەزانی تەنێ مامەپیرەیەکی

---

٧٩- واق بوون: سەرسام بوون.

٨٠- ئاویلکە: سەرەمەرگ.

٨١- پاشەوار: وەجاخ کوێر.



جناویـە، ئێسـتا دەركـەوت شـێخێكی مەزنـە !.

- ئـەوە منـم كـە بەدوايـدا دەگەڕێـی كـوڕم، مـن مامۆسـتا عەبدولڕەحمانـم، تكايـە بـۆم بـاس بكـە، ئـەو لای ئێـوە چـی دەكـرد و ئێـوە لەكـوێ دەژيـن؟

سـیڕاج بـە ژنەوتنـی ئـەم هەواڵـە سەرسـامی و خۆشـی لـێ تێكـەڵ ببـوو، ماوەيـێ دەمـی تەتەڵـەی دەكـرد و لەپـڕدا هـاواری كـرد:

+ ئەڵـلا لـە كۆتاييـدا تـۆم دۆزيـەوە مامۆسـتا، بەخـوا زۆر شـەكەت بـووم هێنـدەی بەدواتـدا بگەڕێـم زۆر.

ئيـدی سـیڕاج بەتێـرو تـەواوی بـۆی دواو تێـی گەيانـد چـۆن دوای وەفاتـی چۆتـە كوخەكـەی و ئـەم نامـەو دەفتـەرەی دۆزيوەتـەوە.

مامۆسـتا ئەسرينـی چاوەكانـی لەكوڵمانـی تـرازان و خەريـك بـوو پارچـە بـەڕی سـەر زەويەكـەی تـەڕ دەكـرد، هێنـدە بەكـوڵ دەگريـا بـۆ مەرگـی پيرەكـەی، بەشـێوازێ كەخێـزان و مناڵەكانـی هاتبوونـە ديـاری و سەراسـيمە بووبـوون.

سەری هەڵبڕی گوتی: ئێوە بڕۆنەوە ئەوديو، لەگەڵ ئەم لاوەدا نەختێ گفتوگۆمان هەيە.

دەفتەرەكـەی لەسـیڕاج وەرگـرت و كرديـەوە و تۆزێكـی لـێ خوێنـدەوە، بابەتـەكان بەهۆنـراوە داڕێژرابـوون. هێنـدە بەگەورەيـی و ڕێنووسـێكی قەشـەنگەوە نەخشـاندبووی كـە هـەر ڕووپەڕێكـی لـە دوو دێـڕی پـتر نەگرتبـوو، لـێ مـرۆ هـەر چێـژی لـە تێڕامانـی دەبينـی، دياربـوو شـيكردنەوەكەی بـۆ مامۆسـتا جـێ هێشـتبوو.

+ باشـە قوربـان ئـەوەی منـی سەراسـيمە و دامـاو كـردووە ئەوەيـە كـە چـۆن زانيويەتـی لـەدوای مەرگـی دەڕۆمـە ژوورەكـەی و لەكـوێ ناسـيومی تا ئەم چشـتانەم بۆ بنووسـێ؟

- ئـەم جـۆرە كارانـە بـۆ پياوانـی خـودا سـانان كـوڕم، دواتـر خـۆت لەهەمـوو چشـتێ دەگـەی و ئێسـتا تەنـێ پێويسـتە بخوێنـی و هيچـی دی.

كـوڕم سـیڕاج، لەسـەر وەسـيەتی شـێخ ڕۆژانـە لای من ئـەم وانانـە دەخوێنی، گـەر دواتر ئـارەزووت كـرد چشـتی ديكـەش دەخوێنيـن، وەلـێ پێـم بێژە تـۆ چ كاتێـك دێيـە ئێرە؟

+ ئـەوەی ڕاسـتی بـێ قوربـان مـن تەنـێ بـۆ قوتابخانـە دێمـە ئـەم شـوێنە، سـێ ڕۆژ بەيانيـان و سـێ ڕۆژ نيـوەڕوان، وەلـێ دەكـرێ نيـو كاژێـر زووتـر بێـم، چـون ناكـرێ وانەكـە دوای قوتابخانەبـێ، گـەر درەنـگ بچمـەوە ماڵـەوە لێم دەڕەنجـن، چـار چييـە؟

- من کۆمەڵێ قوتابیم لایە دوای عەسران دەخوێنن، کاتەکانی دی زۆر مژووڵم، وەلێ چون تۆ زۆر تایبەتی، لاریم نییە گەر ئاوا زوو بێی، لێ ئەم ڕۆژانەی بەیانیانی لێی گەڕێ، تەنێ ئەو کاتانە وەرە کە نیوەڕوانی، هەفتەی سێ ڕۆژ بۆتۆش باشترە. چەند ڕۆژێکە نەخۆشم و کارم بۆ نەکراوە، بەیانیان زوو دەردەچم بۆ کۆکردنەوەی دار و دەبێ دوای کردنە خەڵووزیان بیان فرۆشم، سا بەڵکو مناڵەکانم برسیان نەبێ. خۆم موددێکی زۆرە سیلم لێیە، ئەو ڕۆژانەی ناتوانم بچمە کار مناڵەکان بە خودا دەسپێرم، ئیدی خودا کەسی بێکەسانە و ڕۆزی دەری هەموومانە. هەر تۆزێ بەر لەوەی تۆ بێی یەکێ لە دراوسێکان هێندێ گۆشتی بۆ هێنایین لەو ئاژەڵەی لەپێناو خودا سەری بڕی بوو، خەریکن مناڵەکان ئامادەی دەکەن.

+ زۆر سوپاست دەکەم مامۆستا، پێت چۆنە هەر لەبەیانیەوە دەست پێ بکەین، زۆر تامەزرۆم بۆی، بەیانی چوارشەممەیە و کاتێکی باشە.

- من تامەزرۆ ترم چشتێ پیرەکەم نووسیبێتی بیخوێنمەوە و شیبکەمەوە.

سیڕاج بیری کەوتەوە زۆر درەنگ کەوتووە، خێرا هەڵسایەوەو کتێبەکانی وەدەست

گرتن و گوتی: قوربان من ئاگام لەکات نەمابوو، زۆر زۆرم درەنگە، ئینشاڵلا بەیانی یەکدی دەبینینەوە.

- کوڕی خۆم چۆن دەبێ ئاوا بە برسێتی بڕۆی، خەریکە خواردن ئامادە دەبێ.

+ نا نا مامۆستا گیان ئێستا دایکم چاوەڕێمە، سوپاست دەکەم.

سیڕاج ئەو ڕۆژە زۆر درەنگ کەوتبوو، بەڕاکردن بەرەو ماڵ گەڕایەوە، ڕوانی دایک و باوکی و سەلمانی برای لەبەر دەرگان و شڵەژاون لەنەهاتنەوەی.

کە سیڕاجیان بینی، مام سلێمان هاواری کرد: ئەوە کاتە دێیتەوە کوڕم، وا زەردەپەڕە،[٨٢] تائێستا چییت دەکرد لەقوتابخانە؟ هەموومانت تووشی چورتم[٨٣] کردووە، خەریک بوو بەدوات دا بێین.

خاتوو ڕەحمە لێی وەرگرتەوەو گوتی: خەڵکی دەڕۆنە قوتابخانە ژیر دەبن، تۆ هەر شێت تر دەبی کوڕم بۆ وادەکەی؟

---

٨٢- زەردەپەڕ: دەمی خۆرئاوابوون.

٨٣- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

+ تکاتان لێ دەکەم بمبوورن، لە قوتابخانەوە چووم بۆ شوێنێ، زۆر پێویست بوو بچم، بەخوا هەر پەیوەندی بەخوێندنەوە هەبوو.

خاتوو ڕەحمە هاتەوە دەنگ: شوێن و چشت نییە، هەر وانەکانت تەواو یەکسەر دێیتەوە ماڵ تێگەیشتی.

مام سلێمان بەتووڕەییەوە: ئەم جارەش با ئاوابێ و وەرە ژووریٰ، وەلێ گەر جارێکی دی ئاوا نارەحەتمان کەی ناچار دەبم لەقوتابخانە دەرت بێنم.

+ باوکە گیان، دەستت ڕادەمووسم، بەڵێن بێت کۆتا جارمەو ئیمڕۆش کارەکەم گەلێ پێویست بوو.

سیڕاج چوویە ژوورەوە و خۆر ئاوابوو بوو، نوێژەکەی کردو لەجێگاکەی بەنارەحەتی پاڵی دایەوە و ئارەزووی چێشت خواردنی نەما.

خاتوو ڕەحمە کەتێی ڕوانی چووە لای ڕوونیشت و بەهێمنییەوە گوتی: کوڕی خۆم بمانبوورە ، خراپ بەسەر تۆدا دەنگمان هەڵێنا، دەزانم ئێستا گەورە بوویتە، وەلێ ئێمە دڵمان پێتەوەیە، دەبێ لەمە تێبگەی، کاتەکەش زۆر لایدابوو بۆیە هێندە شڵەژا بووین.

+ هیچ نییە دایکە گیان، ئێوەش مافی خۆتانەو من خەتابارم، چیت لێناوە ئەم ئێوارەیە؟

- بریانیەکم چاخکردووە[٨٤] دەستی خۆتی لەگەڵ دەخۆی کوڕم، وەرە با بۆتی تێکەم.

سیڕاج چون زۆری برسی بوو، ئەم ئێوارەیە زۆری خوارد، پاشان ڕوونیشت و دەفکران دا ڕۆچوو، تۆ بڵێی بەیانی چۆن لەگەڵ مامۆستا دەست پێ بکەن و چی بخوێنن، تامەزرۆ بوو تاوەکو بەیانی بێ، وەلێ جاریٰ هیچی بۆ ماڵەوە نەدرکاند.

لەم چەند ڕۆژەدا کەمتر بیری لەسەناریا دەکردەوە، زیاتر شێخ مستەفا و مامۆستا و وانەی عەقیدەکە ببوویە ماخۆلانی.

بەیانی نیو کاژێر زووتر لەڕۆژان بە جەختیەوە[٨٥] خۆی ئامادەکرد بۆ چوونە قوتابخانە، ئەو ڕۆژە هەر لەگەڵ نوێژی بەیانی خەو نەچووبوویەوە چاوانی لەخۆشی وانەکەی.

---

٨٤- چاخکردن: سازکردنی شت.

٨٥- جەختی: چالاکی و چاپووکی.

خاتـوو ڕەحمـە کەتێـی ڕوانـی گوتـی: چییـە کـوڕم، ئیمـڕۆ لەکاتـی خـۆی زووتـر دەڕۆی، خێـرە؟

+ ئـێ دایکـە قوتابـی زیـرەک هـەر وایـە، حـەزی لێیـە زوو بـڕوا بـۆ وانەکانـی، مەگـەر تـۆ ناتـەوێ ئاقـڵ بـم و شـێت نەبـم؟.

- ئای ئای چەند مەکر کەری کوڕم، باشە با وابێ وەرە نانەکەت بخۆ.

سـیڕاج خێـرا نانەکـەی خـواردو سرک و تیـژ تێـی تەقانـد تاوەکـو نەگەیشـتە بـەر دەرکی ماڵـی مامۆسـتا گیـر نەبوو، تونـد لـەدەرگای دا.

- کێیە؟

+ سیڕاجم قوربان، گوتت بەیانی وەرە ئەوا هاتم.

مامۆسـتا خێـرا دەرگای واڵاکـردو بردیـە ژووری و زۆر بەخێرهاتنـی کـرد. ئیلهـام کـە سـاڵێ لـە سـیڕاج بچووکـتر بـوو لەگـەڵ ئیسـڕای هەشـت سـاڵان تـازە بـۆ قوتابخانـە خۆیـان ئامـادە دەکـرد. خاتـوو خەدیجـەی خێزانـی مامۆسـتاش هاتـوو سـیڕاجی بەخێرهێنا و چوویـەوە ئەودیـو، تـا هـەردوو بەتەنهـا بـن.

- ئامادەی کوڕم؟

+ بەڵێ بەڵێ، تەنێ لەوەندەی کەمە کە دەست پێ بکەین.

- باشـە بـڕۆ بەرامبـەرم ڕوونیشـە و دەفتەرەکـەت واڵاکـە، بـا پێـت بێـژم چـۆن دەسـت پـێ دەکەیـن. تـۆ بابـەت بابـەت هۆنـراوەکان بۆمـن دەخوێنیتـەوە و منیـش ڕاڤەیـان دەکـەم. هـەر پرسـیارێکیش کـە هاتـە هزرت دەیکـەی و درێغـی ناکـەی لەپرسـیارکردن، ئێسـتا بفەرمـوو بیخوێنـەرەوە.

+ بەسەرچاو قوربان.

سـیڕاج بەشـەرمەوە لەبەرامبـەر مامۆسـتادا لەسـەر ئەژنـۆ ڕوونیشـت و دەسـتی بەخوێندنـەوەی پێشـەکیەکە کـرد.

لێـرەدا ئـارای جوانکیلـە تێبینـی پەراوێزێکـی کـرد لەخـوارەوە کەلێـی نووسرابـوو **( ئـارا و ڕەنـج، سـڵاوتان لێبـێ. تکایـە بابەتـە ئەقیدەییـەکان بـە وردی بخوێننـەوە، دوای تـەواو بوونـی دەفتەرەکـە وازی لـێ مەهێنن و پێیـدا بڕۆنـەوە. هەوڵـم داوە زۆر بەپوختی بابەتەکـە بەئێـوە بگەیەنـم، هـەر بۆیـە دەققـە عەرەبییەکانـم لەقورئـان و فەرمـوودەکان نەنووسـیون، هیـوام سـەلامەتیتانە ).**

ئـارا زۆر لەمـە سەراسـیمە بـوو، باشـە خـۆ تەنیـا منـم ئەمـە دەخوێنمـەوە، ئـەم ڕەنجـە کێیـە پەیدابـوو خودایـە ! دوای تـۆزێ تێڕامـان نەگەیشـتە ئەنجـام و دەسـتی بەخوێندنـەوە کـردەوە.



## دەست پێ کردنی وانەکان و سەرەتایەکی تازە

**( پێشەکی )**

| | |
|---|---|
| بەناوی خودای پاکی فەریاد ڕەس | دروود و سەلام لەچاکترین کـەس |
| ئەوەی ژێر دەستت بیرو بـــاوەڕە | لەسەر قورئان و سوننەی ڕەهبەرە |
| بەفەهمی زانـا و دانـایـانی دیـــن | تا خوا لەڕێی شەڕ لامان دا لە ژین |

سـیڕاج بەخوێندنـەوەی ئـەم سـێ دێڕە تـەواو سـوور بوویـەوە، لێ نەیدەویسـت مامۆسـتا هەسـت بەشـەرمەکەی بـکا، بۆیـە خێـرا سـەری بەرزکـردەوەو گوتـی: بفەرمـوو قوربـان چیـت لەسـەری هەیە؟

مامۆسـتا ئەگەرچـی نەسـاغ بـوو، وەلـێ وانەکـە هێنـدە گڕوتینـی پـێ بەخشـی بـوو کـە نەخۆشـیەکەی بیرچووبوویـەوە و دەسـتی پێکـرد:

- بەنـاوی خـودای بـێ هاوتـا، درودو سـەلامی بـێ پایـان بـڕژێ بۆسـەر گیانـی پێشـەواو خۆشەویسـتەکەمان کـە نێـردراوی خودایـە، هـەم لەسـەر ئـال و یارانـی بەبـێ پچـڕان و هەتـا هەتایـە.

هەمـــوو کارو کردارێـــک پێویســـتە بەنـــاوی خـــودا دەســـت پـــێ بکـــرێ، هەروەکـــو خۆشەویســـتمان فەرموویەتـــی کـــە هـــەر کارێکـــی گرنـــگ هەبـــێ بەنـــاوی خـــودا دەســـت پـــێ نەکـــرێ ئـــەوا پچـــڕاوەو کەموکـــوڕی تێدایـــە.

وابزانـــم پێشـــەکیەکەی چشـــتێکی وای تیـــا نییـــە حاڵـــی نەبـــی ســـیڕاج گیـــان، وەلـــێ کەمێـــک لەســـەری دەوەســـتین.

سـیڕاج بەشـەرمەوە: بەڵـێ ڕوونـە وەلێ یـەک پرسـیارم هەبوو قوربـان، ئێمـە هەمووەمان پەیامبـەری خۆشەویسـت دەناسـین، بـەڵام تـا ڕادەیـەک کەمتەرخەمیـن لەناسـینی ئـال و ئەسـحابی ئـەو، گـەر پێناسـەیەکی کورتـی ئـەم دوو چینـە بکـەن خـراپ نییـە.

- ئالـی پەیامبـەر موسـڵمانەکان دەگرێتـەوە لەنەتـەوەی هاشـم و موتەلیـب کـە هـەردوو کـوڕی عەبدولمەنافـی باپیـرە گـەورەی پەیامبـەرن، واتا خزمە موسـڵمانەکانی. سـەحابەش یاخـود هـاوەڵان بـەو کەسـانە دەگوتـرێ کـە گەیشـتوون بەپەیامبـەرو باوەڕیـان پـێ هێنـاوە و هـەر بـە موسـڵمانیش مـردوون.

پاشـان ئـەوەی دەیخوێنیـن بیروبـاوەڕی موسـڵمانانە لەئەهلـی سـوننە، کـە گشـتی لەقوڕئـان و فەرموودەکانـی پەیامبـەر هەڵێنجـراون، ئەمـەش پێویسـتە بەتێگەیشـتنی زانایانـی شـارەزا لێـی حاڵـی بیـن، نـەک بـەو تێگەیشـتنە کـەم و کورتـەی خۆمـان.

زانسـتی بیروبـاوەڕ ئـەو زانسـتەیە کـە بەهۆیـەوە بیروبـاوەڕی ئاینـی جێگیـر دەبـێ، بەهێنانـەوەی بەڵگـەکان و لابردنـی ئـەو گومانانـەی نەیـاران دروسـتی دەکەن لەسـەری.

وەبزانـە ئێمـە دوو پێشـەوای گەورەمـان هـەن لـەم زانسـتەدا کـە تێکۆشـاون بـۆ سەرخسـتنی بیروبـاوەڕو بەرگـری کـردن لێـی و پاڵفتـە کردنـی لەبیروبـاوەڕی ناپەسـەند و داهێـنراو.

یەکەمیـان نـاوی (موحەممەد) ەو (ئەبومەنسوڕ)یشـی پـێ دەڵێن، لەنێـو خەڵکیدا ناسراوە بـە (ماتوریـدی)، سـاڵی لەدایک بوونی بـاش ڕوون نییە، لەسـەمەرقەند لەدایـک بووە لە ئوزباکسـتان، لـە (٣٣٣) ی کۆچـی هـەر لەوێ کۆچی دوایـی کردووە.

دووەمیـان نـاوی (عەلـی)ە و (ئەبولحەسەن)یشـی پـێ دەڵێـن، نـاسراوە بـە (ئەشـعەری) و نـەوەی سـەحابەی بەڕێـز (ئەبوموسـا)ی ئەشـعەریە. لـە (٢٦٠)ی کۆچـی لەبەسـڕە لەدایـک بـووەو لـە (٣٢٤) دا کۆچـی دوایـی کـردووە و لەبەغـدا نێـژراوە.

+ ئایا پێویستە لەسەرمان شوێن ئەم زانایانە کەوین لەکاتێکدا قورئان و فەرموودەکان لەژێر دەستمان دان؟

- بەڵێ سیراج گیان، زانایان چرای گەشن بۆ خەڵکی و پێشەواو میراتگری پەیامبەرن، گەر تێکۆشان و شرۆڤەکردنەکانی ئەوان نەبا، ڕەنگە ئێستا زۆر شتی داهێنراوو خراپ تێکەڵی دین کراباو ئێمەش بە دین لێی حاڵی باین. وەلێ ئەوان لەهەموو سەردەمێ بەرگریان لەبیروباوەڕ کردووە و کۆمەڵێ کتێب و دانراویان بۆ جێ هێشتووین کەتێیدا بیروباوەڕی دروست و نادروستیان لێک جیاکردۆتەوە و بەرپەرچی ئەو کەسانەیان داوەتەوە کەقورئان و فەرموودەکان بۆ مەرامی پووچی خۆیان مانا دەکەن و لێکی دەدەنەوە.

وە هەر بابەتێک پێویستی بە ئیجتیهاد[٨٦] و تێکۆشان هەبێ ئیجتیهادیان تیا کردووە و گشتیان بۆ ئێمە سپی و سانا کردووە، کەئێمە خۆمان ئەهلی ئەوە نیین بەتەواوی لەقورئان و فەرموودەکان بگەین و بڕیارەکانی لێ هەڵێنجین، بەڵکو هەر دەبێ بچینەوە سەر تێگەیشتنی ئەوان.

گەر هەر کەسەو کەچەند ئایەت و فەرموودەیەکی لەبەرە بە دڵی خۆی دەقەکان لێک بداتەوەو شیکردنەوەیان بۆ بکا ئەوا پشێوی و سەرلێ شێواوی لەنێو گەلدا دروست دەبێ. وەلێ گەر گەڕاینەوە بۆ زانایانی جێگای باوەڕ کەئەوان چۆن لەم دەقە گەیشتوون و شیان کردۆتەوە ئەوا شێوان و ناڕوونی ڕوونادەو دەگەین بە ڕاستی بابەتەکە، هەروەکو گوتوویانە ( نان بۆ نانەواو گۆشتیش بۆ قەساب).

مەگەر نەتبیستووە خوداش دەفەرموێ پرسیار لەزانایان بکەن گەر ئێوە نەتان زانی.[٨٧]

+ بەڵێ قوربان گیان بیستوومە دەمت خۆش.

- دەی کەوایە کۆپلەی دواتر بخوێنەرەوە تا بچینە سەر بابەت.

---

٨٦- ئیجتیهاد: بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانا بۆ دەرکردنی حوکم لەقورئان و فەرموودەکان، کە ئەمە کاری زانا مەزنەکانە.

٨٧- سوورەتی نەحل ، ئایەتی ٤٣.

+ **( ئەرکانی ئیسلام )**

| | |
|---|---|
| ئـەرکــانی ئیسلام پێنجن بزانـە | یەکەم شایەدی دان بە زوبانـــــە |
| دووەم نوێژکردن، سێیەم زەکاتە | چوارەم ڕۆژووە، گەر هێز لەلاتە |
| پێنجەمین حەجە بۆ ماڵی خـودا | گەر خودا لەشی ســاغت پێ بدا |

- بزانـە کـوڕی خـۆم، ئـەم ئاینـەی خـودا سێ پلـەی هەیـە ( ئیسـلام و ئیـمان و ئیحسـان). ئیـمان بـاوەڕی نێـو دڵـە بەرامبـەر هەمـوو ئـەو یاسـایانەی خـودا دەری کـردوون. ئیحسـانیش خۆشەویسـتمان لەفەرموودەیەکـی درێـژدا ڕوونـی کردۆتـەوە کـە دەفەرموێ خـوای گـەورە بپەرستی وەکـو ئـەوەی بیبینـی، خـۆ ئەگـەر تـۆش ئـەو نەبینـی بێگومان ئـەو دەتبینـێ.

جـا ئیسـلام کـەوا باسـەکەی ئێمەیـە واتـا: گوێڕایەڵـی و ملکـەچ بـوون بـۆ هەمـوو ئـەو فەرمانانـەی لەلایـەن خـوداوە نێـردراون بۆسـەر مرۆڤایەتـی.

لەقوڕئانی پیرۆزدا هاتووە کە هەرکەس جگە لەئیسلام ڕێبازێکی دیکە هەڵبژێرێ

ئەوا لێی وەرناگیرێ و لەڕۆژی پەسڵان[٨٨] دا لە زەرەرمەندان دەبێ[٨٩].

ئـەوەش بزانـە کـەوا ئاینـی ئیسـلام لەسـەر پێنـج پایـە دامـەزراوە کەپێویسـتە هەمـوو تاکێکـی موسـڵمان وەکـو نـاوی خـۆی لەبـەری بـێ، هەروەکـو پەیامبـەری خۆشەویسـت بۆمانـی ڕوون کردۆتـەوە کـە ئیسـلام بریتیـە لەشـایەدی دان و نوێژکـردن و زەکات دان و ڕۆژوو گرتـن و حـەج کـردن گـەر لەتوانـای دا هەبـوو.

ئەمانەش یەکە یەکە ئینشاڵا لێیان دەدوێین، بۆیە ئێستا پرسیار لەهیچیان مەکە.

- ڕوونە سیڕاج گیان؟

+ بەڵـێ قوربـان تـا ئێسـتا زۆر ڕوونـە و هیـچ پرسـیارێکم نییـە، گـەر لات ئاسـایی بـێ بابەتـی دوای ئـەوەش دەخوێنیـن کەباسـی شـایەدی دانـە، چـون ئـەو باسـانە زۆر بەربـڵاون لەنێومـان و قوڕسـیەکی وای تیـا نییـە.

- زۆر چاکە، بیخوێنەرەوە.

---

٨٨- پەسڵان: ڕۆژی دوایی.

٨٩- سوورەتی ئالی عیمڕان ، ئایەتی ٨٥.

## ( باسی شایەدی دان )

+

| | |
|---|---|
| بڵێ بەزوبـان جـگـــە لە (ئـەڵڵا) | هیچ خــودا نیـیـە کـە لابا بـــەڵا |
| بەبێ شەریکە و تاک و تەنیایـــــە | قەت بە مەخلووقات موحتاجی نایە |
| هەروا (موحەممەد) کە پێغەمبەرمە | لەهەردوو دونیا هەر ئەو سەروەرمە |

+ تەواو قوربان.

- سیـڕاج گیـان، مـرۆڤ بـەر لـەوەی مـەرگ یەخـەی پـێ بگـرێ پێویسـتە بـاوەڕ بەخـودا بێنـێ و شـایەدی بـدا و بڵـێ شـایەدی دەدەم کەهیـچ خودایەکـی بەڕاسـتی نییـە جگـە لـە ئەڵـڵا، هـەروا شـایەدیش دەدەم کـە موحەممـەد درودی خـوای لەسـەر پەیامبـەرو نێـردراوی خودایـە.

بەزوبانـت دان بـەوەدا بێنـە کەهـەر ئەڵـڵا خـودای تاکـەو جگـە لـەو هیـچ کـەس توانـای ئـەوەی نییـە کەبـەڵات لـێ لاداو تووشـی خۆشـی یاخـود زەرەرت بـکا.

وەکـو خـودا خـۆی دەفەرمـوێ: بڵـێ خـودای گـەورە تـاک و تەنیایـەو هاوتـاو هاوبەشـی نییـە. خـودا ئاتاجـی کـەس نییـەو هەمـوو کـەس ئاتاجـن بـەو[٩٠].

+ باشە قوربان بۆچی خودا تاکە، حیکمەت چییە لەتاکیەتی ئەودا؟

- دەمـت خـۆش سـیڕاج گیـان پرسـیارێکی جـوان و لەجێـت وروژانـد. بزانـە کـوڕی خـۆم وێکچـوون نەبـێ، ئایـا تائێسـتا وڵاتێکـت بینیـوە دوو سـەرکردەی هەبـێ؟

+ بێگومان نەخێر.

- دەی گریمان وڵاتێکی وا هەیە، چی ڕوودەدا کوڕم؟

+ بێگومان پشێویەکی زۆر ڕوودەدا قوربان، چون هەریەکەیان جۆرە فرمانێک

دەردەکـەن، سـەربازو ئەفسـەرەکانیش دەکەونـە گێـژاوەوە کەنازانـن فرمانـی کامیـان بەجـێ بێنـن، بۆیـە هەنـدێ دەبنـە لایەنگـری لایـەک و هەندێکیـش لاکـەی تـر، ئەمـەش بـەرەو دارمانـی وڵاتیـان دەبـا.

- ئافەریـن کـوڕم، وەڵامەکـەت لەجێیـە، هـەر بۆیـە خـودا دەفەرمـوێ گـەر لەئاسـمان و زەویـدا چەنـد خوایەکـی تـر هەبوایـە جگـە لـە ئەڵـڵا، ئـەوا وێـران دەبـوون و تێـک

---

٩٠- سوورەتی ئیخلاس ، ئایەتی ١ ، ٢.



دەچوون بەسەر یەکدیدا[٩١].

ئەمە ئەم بەسەرهاتەی بیرخستمەوە کە لە مام حاجیەک دەپرسن چۆن دەزانی خودا تاکە، ئەویش گوتی بەئاشەکەی مام عەولا، چون ئەو ڕۆژەی تەنها خۆی لەوێیە کاروباری ئاشەکە چاک بەڕێوە دەچێ، وەلێ ئەو ڕۆژەی براکەیشی دەچێ کارەکەیان باش ناڕواو دەبێتە دەمەقاڵێیان.

+ نموونەیەکی بەچێژو خەندە ئامێزبوو قوربان.

- وێکچوون نەبێ لەنێوانیاندا ئەم نموونانە تەنێ بۆ نزیک کردنەوەیە لەهزری ئێمە گەرنا خودا بەرزو بێگەردە لەوەی بەچشتی دیکەی بچوێنین.

ئەوەش بزانە کوڕم کەهەموو پەیامبەرانی خودا یەکەم بانگەوازیان بۆ یەکخواناسین بووە، ئینجا کەخەڵکی خودایان بەتاک ناسیوە، دواتر تێیان گەیاندوون لەحەڕام و حەڵاڵ و نوێژو زەکات و بابەتە ئاینیەکانی دی. چون گەر کەسێ خودا نەناسێ کارێکی عاقڵانە نییە تۆ بێی باسی نوێژو زەکاتی بۆ بکەی، هەر وەک خودا بەخۆشەویستەکەی فەرمووە: هەر پەیامبەرێکمان پێشی تۆ ناردبێ سروشمان بۆ کردووە کەهیچ خوایەک نییە جگە لەخۆم، کەوایە بمپەرستن [٩٢].

هەروەها بزانە کوڕی ئازیزم، خودا لەهیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ، چون تۆ هەرچی دەبینی دروستکراوی ئەوە، کارێکی عەقڵی و لۆژیکی نییە تۆ دروستکراو بە دروستکەرەکەی بچوێنی و پێت وابێ وەکو ئەوانە.

هەروەکو خۆی لەقوڕئاندا ئاماژەی پێداوە کە هیچ شتێ هاووێنەی ئەو نییە[٩٣].

ئینشاڵا لەباسی خۆیدا پتر لەم بابەتە دەدوێین، بۆیە ئێستا پرسیاری تیا مەوروژێنە.

وەبزانە کەخودا قەدیمی موتڵەقە، واتا بەزات و بەزەمانیش قەدیمە و قەت ڕۆژێ لەڕۆژان خودا نەبوونی بەسەردا نەهاتووە، وە خودا ئەزەلی و ئەبەدیە. ئەزەل بریتیە لەوەی هیچ نەبوونێکی لێ پێش نەکەوتبێ، هەروەها بە چشتێک دەڵێن ئەبەدی کەهەرگیز نەبوونی بەسەردا نەیەت، بەکورتی واتا هەر هەبوو بووە و

٩١- سوورەتی ئەنبیا ، ئایەتی ٢٢.

٩٢- سوورەتی ئەنبیا ، ئایەتی ٢٥.

٩٣- سوورەتی شوورا ، ئایەتی ١١.

هـەر هەبـووش دەبـێ. وەک پەیامبـەر ئامـاژەی پێـداوە کەخـوای گـەورە لەئەزەلـدا هەبـوو، هیـچ چشـتێکی تـر نەبـوو، وە عەڕشـی خـۆی لەسـەر ئـاو دروسـت کـرد.

+ باشە قوربان یانی خودا ئێستا لەسەر عەڕشە؟ یاخود عەڕشی بۆچی بوو؟

- ئـەم پرسـیارەم لەکاتـی خۆیـدا بیـر خـەرەوە، ئێمـە ئێسـتا تەنـێ باسـی شـایەدی دان و تـاک و تەنیایـی ئـەو دەکەیـن.

+ زۆر چاکە، وا یاداشتی دەکەم لای خۆم، تۆ بەردەوام بە.

- بزانــە کــوڕم گوتنــی وشــەی شــایەدی دان مەرجــە لەئیمانــدا، تاکــو بڕیارەکانــی موسـڵمانانت بەسـەردا جێبەجـێ بکـرێ مەرجـە کـە ئـەم وشـانە بڵێـی، هەروەهـا پێشـەوا نـەواوی دەفەرمـوێ ( گـەر باوەڕێکـی پتـەوت هەبـوو ئـەوا دەبیـە بـڕوادار، ئیـدی پێویسـت نابـێ لەسـەرت بەڵگـە فێرببـی ). بێگومـان ئـەو دەشـتەکیانەی سـەردەمی پەیامبـەر باوەڕیـان دەهێنـاو هیـچ بەڵگەیەکیشـیان لەسـەر خـودا نەدەزانـی.

جـا هـەر ئەویـش فەرموویەتـی ( بەتەنیـا وتنـی هیـچ خودایـەک نییـە جگـە لـە ئەڵـڵا، نابیتـە موسـڵمان، بەڵکـو پێویسـتە دان بـە پەیامبـەرو نێردراوەکەشـی دابێنـی کە(موحەممەد)ــە دروودی خـوای لەسـەر ).

ئـەوەش بزانـە کاکـە سـیڕاج کـە منداڵـی موسـڵمانان هەرچەنـدە گوتـەی شـایەدی دانیـش نەڵێـن هـەر بـە موسـڵمان دادەنرێـن، چـون باوانیـان موسـڵمانن و ئەوانیـش شـوێنکەوتەی وانـن، مەگـەر خۆیـان دواتـر دان بەبـێ بڕواییـدا بێنـن.

وە بەهـەر زوبانێکیـش گوتـەی شـایەدی بڵێـی ئـەوا دێیـە ڕیـزی موسـڵمانان، هەرچەنـدە بەعەرەبییـش نەبـێ.

پێم وابێ ئەوەندە بۆ ئەمڕۆ بەس بێ کوڕەکەم، لەوەیە بۆ قوتابخانەش دوا بکەوی.

+ قوربـان وانـەکان بەچێـژن و وەڕەز نابـم لـە ژنەوتنـی، وەلـێ لەبـەر قوتابخانـە بـا ئەوەنـدە بـەس بـێ و نووکـە دەبـێ بـڕۆم گـەر مۆڵەتـم دەن.

- بفەرموو کوڕەکەم، پارێزراوی خودا بی.

سـیڕاج وەڕێ کـەوت بـۆ قوتابخانـە، ئـەوکات پێنجـی ئامادەیـی بـوو، ئەوەندە ئـارەزووی لەوانەکانـی قوتابخانـە نەبـوو هێنـدەی حـەزی لەکتێـب خوێندنـەوە بـوو. گـەر بیسـتبای کەسـێ دەڕواتـە شـار خێـرا خـۆی پـێ دەگەیانـدو ڕای دەسـپارد کـە کتێبـی بـۆ بکـڕێ.

وای لێهاتبوو کتێبەکانی هێندە زۆر ببوون کە هەموو ڕۆژێ خاتوو ڕەحمە دەیگوت بەخوا کوڕم ئاخری شێت دەبی هێندەی سەر بەسەر ئەو پەڕاوە زەردانەدا بگری.

هەموو جۆرە کتێبێکی دەخوێندەوە، وەلێ بەم دوا دواییانە زیاتر ئارەزووی لە بابەتە ئاینیەکان و هۆنراوە بوو. گەلێ جار هۆنراوەکانی نالی و مەولەوی لەبەر دەکردن و لەقوتابخانە بۆ هاوڕێیانی دەگوت، وەلێ وەکو جاران نموونەی پۆل نەبوو، نمرەی بەرزی نەدەهێنا، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو خەدەنگەی[94] کەسەناریا لەدڵی دایچەقاندبوو.

ئەو ڕۆژە لەقوتابخانە یەکەم وانە ئاینیان هەبوو، مامۆستا شێروان دەستی کرد بەباسی تاکیەتی و سیفاتە بەرزەکانی خودا و تۆزێ لێی دوا، لەوکاتەدا سیڕاج دەستی هەڵبڕی.

+ قوربان گەر لاتان بێ شەرمی نەبێ پێم خۆشە من هەندێ لەسەر ئەم بابەتە بدوێم.

- بفەرموو سیڕاج گیان بەڵکو زۆریش وازم لێیە کەقوتابیەک بەژداری بکا.

هەموو ڕوویان وەرچەرخاند بەلای سیڕاجدا، چون پێشتر زۆر کەم دەهاتە گۆ.

سیڕاج دەستی پێکرد، هەموو ئەو گوتانەی ئیمڕۆ لەمامۆستای ژنەوتبوو، لەگەڵ هەندێ لەو زانیاریانەی لەپەرتووکەکان خوێندبوونیەوە، لەقوتابخانە بەشێوازێکی دانسقە پێشکەشی کردن.

مامۆستاو قوتابیەکان سەراسیمەبوون لە جەختیەکەی،[95] چون تائێستا لەم وانەدا هیچ قوتابیێ دەستی هەڵنەبڕی بوو کە قسان بکا، بۆیە مامۆستا هەموو دەم دەیشکاندنەوە کە هیچیان لەهەمبانە دا نییە و چ دەربارەی ئاین نازانن.

- ئەی ئافەرین سیڕاج، بەڕاستی سەرسامت کردم، کاشکی[96] هەموو وەک تۆ توانیبایان بدوێن، ئەمانە لەکوێ فێربووی؟

+ قوربان مامۆستایەکم هەیە وانەی بیروباوەڕی لا دەخوێنم، جگە لەوەش بەردەوام خوێندنەوەم هەیە.

---

٩٤- خەدەنگ: تیر.

٩٥- جەختی: چالاکی و چاپووکی.

٩٦- کاشکی: خۆزگە.

- ئافەریـن کوڕەکـەم، بەڕاسـتی لەمـن چاکـتر لەبابەتەکـە دوای، لەمـەودوا پێـم باشـە تـۆش بـەژداری بکـەی لەوانـەکان مـادام شـارەزاییت هەیـە.

+ بەسەرچاو قوربان، هەرچی بیزانم درێغی ناکەم لە گوتنی.

دوای تـەواو بوونـی وانەکـە تێکـڕا قوتابیـان دەسـت خۆشـیان لەسـیڕاج کـرد، خەریـک بـوو تـۆزێ بەخۆیـدا بنازێ لـەزۆری ستایشـەکان.

لەوانـەی داهاتـوو مامۆسـتا لوقـمان خـۆی کـرد بـەژووردا. پیاوێکـی کەڵەگەتـی تێـک سـمڕاو[97] بـوو، هەمیشـە بـێ سـڵاوو چشـت یەکسـەر دەسـتی بەبابـەت دەکـرد، ڕێزمـان و ئەدەبـی کـوردی دەگوتـەوە، بۆیـە خێـرا گوتـی: ئیمـڕۆ دێینـە سـەر باسـی شـاعیرێکی بـەرزی کـورد، کەڵەپیاوێکـی دانـاو زانـا، مەلایەکـی خـاوەن تەقـوا، مەولـەوی تاوگـۆزی، تـۆزێ باسـی ژیـان و شـیعرەکانی دەکەیـن.

بەر لەوەی قسەکانی تەواوبن سیڕاج دەستی بەرزەوە کرد.

- ها کوڕم جارێ هاتوومە ژوور پرسیارت هەیە.

+ نـا قوربـان پرسـیارم نییـە، وەلـێ تـۆ هەمـوو جـارێ خـۆت وانـەکان بـۆ ئێمـە شـی دەکەیـەوە و مانـدوو دەبـی، گـەر جارجـارە ئێمـەش بەژداربیـن پێـم وانییـە خـراپ بـێ.

- جـا وەڵا منیـش پێـم خۆشـە کەسـێ هەبـێ تـۆزێ قسـەمان بـۆ بـکا، وەلـێ مـن چتـان لەبـاردا نابینـم بۆیـە هـەر خـۆم دەدوێـم.

+ گەر مۆڵەت بدەن ئیمڕۆ من تۆزێ باسی مەولەوی تاوگۆزی دەکەم.

- یا ئەڵا، چ قەوماوە ئیمڕۆ، دەی با من ڕوونیشم بزانم چیمان پێشکەش دەکەی.

وەرە ئەکـرەم تـا سـیڕاج چشـتێ دەلـێ بـڕۆ کێـک و شـەربەتێکم بـۆ بێنـە لەحانوتەکـە، باقیەکەیشـی هەڵگـرە، ئیمـڕۆ هەسـت دەکـەم تـۆزێ برسـیم بـووە، دەی سـیڕاج دەی باوکـی باوکـم داخـوا چیـت ئامـادە کـردووە.

سـیڕاج دەسـتی کـرد بەباسـی مەولـەوی، هێنـدە جـوان و لەسـەرخۆ لەژیـان و بەرهـەم و شـیعرەکانی دەدوا، مامۆسـتا بـەدەم کێـک و شـەربەت خواردنـەوە چـاوی ئابڵـەق بـوو لەدیـاری، چـون خـۆی نەیدەزانـی ئـاوا جـوان لەمـەڕ مەولـەوی بـدوێ.

---

٩٧- تێک سمڕاو: گۆشتن.



نزیکەی دە دەقیقە دواو کۆتاییەکەی بەم هۆنراوە قەشەنگەی مەولەوی هێنا:

خـاڵـۆ خـاڵـۆتەن کەم واچــە خـاڵــۆ
خـاڵـۆ دەم وەبـان خـاڵانـت مـاڵــۆ

شەرت بۆ من جەداخ خاڵۆ خاڵۆی تـۆ
وێم کەرۆ وەکوڕ چوارده ساڵەی نــۆ

- هەربـژی سـیڕاجەکەم، ئـادەی چەپڵەیەکـی بەهێـزی بـۆ لێـدەن، ئـا ئەمـە بـاس کردنـە، بەخـوا مەولـەوی خۆشـی دوابـا هـەر ئـاوای بـاس دەکـرد، شـایەنی ئـەوەی لەمـەودوا بەسـیڕاجی مەولـەوی بانگـت بکەیـن.

ئیـدی لـەو ڕۆژەوە مامۆسـتا سیڕاجی بـەژداری پـێ دەکـرد لەئەدەبـی کوردیـدا، هەنـدێ جـار خـۆی ڕوودەنیشـت و دەسـتی بەخـواردن دەکـرد تـا سـیڕاج لـێ دەبوویـەوە.

سـیڕاج ورده ورده کەنارگیـری وەلا دەنـاو تێکەڵـی قوتابیـەکان و خەڵکـی دەبوویـەوە، بـازێ جـار لەقوتابخانـە یاخـود لـەلادێ هاوڕێکانـی دەورەیـان لـێ دەداو هۆنـراوەی بـۆ دەخوێندنـەوە و بۆیـان دەدوا. هەنـدێ لـەوان بەمەولـەوی بانگـی سـیڕاجیان دەکـرد.

ئـەو ڕۆژە بـەدڵ خۆشـی گەڕایـەوە بـۆ ماڵـێ و هەسـتی دەکـرد کـە بەڕاسـتی جـۆرێ لـە ئۆخژنـی[98] پـێ بەخـشراوە، وەلـێ بـێ ئاگابـوو لـەوەی ئـەو عیشـقەی لەدڵیـدا نوسـتووە، گـەر وەئاگابـێ دەیباتـەوە هەمـان دۆخـی جارانـی و بـێ قـەراری دەکاتـەوە.

مام سلێمان تازە لەکار هاتبوویەوە کە سیڕاج خۆی بەژووردا کرد.

- بەخێر بێیەوە کوڕم، لەگەڵ وانەکانت چۆنی؟

+ شوکر بۆ خوا باوکە باشم، وەلێ داواکاریەکم لێت هەبوو.

- یا ئەڵا، بێژە.

+ هەنـدێ لەهاوڕێیانـم بەپایسـکیل هاتووچـۆ دەکـەن، وەلـێ مـن تـا دەڕۆم و دێمـەوە زۆر مانـدوو دەبـم.

- جا مەبەستت چییە؟

98- ئۆخژن: ئارام.

+ ئێ خۆ دیارە باوکە، دەزانم دڵم ناشکێنی و دانەیەکم بۆ دەکڕی، خۆت گوتت کە هەموو پێداویستی قوتابخانەت بۆ دابین دەکەم، ئێ ئەمەش پێداویستیە خۆ.

- ئای کە لێزانی بۆ کاری خۆت، پایسکلێکت بەملدا هێنام تازە. خەمت نەبێ کوڕەکەی مام تۆفیق دانەیەکی جوانی هەیە، لەگەڵ باوکی دەدوێم کەپێمانی بفرۆشێ، گەر بەنرخی زیادەیش بێ دەیبژێرم، چون من تاقەتی چوونە شارم نییە.

سیڕاج دەستی باوکی ڕامووسی و سوپاسی کرد، خێرا چوویە ژووری و دەستی بەخوێندنەوەی کتێبان کرد، زۆری لەخۆی دەکرد تاکو هێندە بیر لەسەناریا نەکاتەوە، بۆیە هەر ناویشی نەدەهێنا.

هەرکات زانیبای خەیاڵی دەچێتە سەر ئەو خێرا کتێبێکی دەردێنا یاخود خۆی بەوانەی قوتابخانە مژووڵ دەکرد.

بەیانی هات و دڵی پەلە پەلی بوو کەدووبارە بچێتەوە لای مامۆستا، بەر لەوەی بڕوا دەفتەرەکەی دەرهێناو چاوێکی بەوانەی دوێنێدا خشاندەوە و هۆنراوەکانی لەبەرکردن.

ئەو هێشتا لەو نهێنیە نەگەیشتبوو کەچۆن مامەپیرە توانی ئەم پەرجۆیە[99] بئافرێنێ[100] و لەدوای مەرگی ئاوا پەلکێشی بکا، چاوەنووڕ بوو کەڕۆژێ ئەم مەتەڵە نادیارە هەڵبێنێ.

مامۆستاش گوتبووی کەجارێ لازمە بخوێنێ و دواتر کارەکانی بۆ ڕوون دەبنەوە، لێ نەیدەزانی کەی ئەم دواترە دێ.

بەخێرایی وەڕێ کەوت تاکو گەیشتەوە بەردەم دەرگای ماڵی مامۆستا و بەتوندی لەدەرگای دایەوە.

بۆ ئەم جارە ئیلهام دەرگاکەی واڵا کرد، سیڕاج سەری خۆی داخست و شەرمی لەخۆی کردەوە.

+ سەلام وعەلەیکوم.

- عەلەیکە سەلام، بفەرموون وەرنە ژوورێ ئێستا باوکم دێتەوە، بۆ هێندێ پێویستی چوویە دەرێ.

---

٩٩- پەرجۆ: موعجیزە.

١٠٠- بئافرێنێ: بخولقێنێ ، دروست بکا.

سیڕاج بەشەرمەوە چوویە ژووریّ و لەهۆدەکە تەنیا ڕوونیشت. خاتوو خەدیجە و منالّەکان دوای بەخێرهاتن کردنی چوونە هۆدەکەی ترو بادیەک ئاویان بە ئیسڕادا بۆ نارد.

هێندەی نەبرد مامۆستا وەژووریّ کەوت و گوتی:

- ئای سیڕاج هاتی کوڕم، بمبوورە لەوەی کەمیّ درەنگ کەوتم، دوێنیّ بە وانەکەی تۆ هێندە کەیف سازبووم تینم بەبەردا هاتەوە، شوکر ئیمڕۆ چوومە سەر کار و ئەوە هێندیّ پێویستیم کڕیوە. ئێستا دێم و ڕوودەنیشین، ئەمانە تۆزیّ ماست و هێلکەن وا دایان دەنێم.

+ سەلامەت بن قوربان، من پەلەم نییە هەرکاتیّ بێن، ئێوە گەورە و خاوەن مالّن.

مامۆستا خواردنەکانی لەودیو دانان و هاتەوە لای سیڕاج. دوای هێندیّ هەوالّ پرسین و قسەو باس گوتی با دەست پیّ بکەین و لەوە پتر دوانەکەوی، یەلّا بۆمی بخوێنەرەوە.

+ **ڕوکنی دووەم (نوێژ)، پەرستشێک بەرەو بالّابوون**

| | |
|---|---|
| بزانە ڕوکنی دووەمی ئیسلام | نوێژە بۆ خودا بەبیّ جیم و لام |
| لەسەر گشت کەسیّ نوێژ واجب دەبیّ | ئیسلام بیّ و بالغ، هەم عەقلّی هەبیّ |

+ بفەرموو قوربان.

- بزانە کوڕم، لەدوای شایەدی دان نوێژکردن دووەمین ڕوکنی ئیسلامە کەخودای گەورە واجبی کردووە لەسەر موسلّمانان.

ئەم سیّ مەرجەی دەیلّێین لەهەرکەسیّ بێنەجیّ ئەوا ئەو کەسە نوێژی لەسەر واجب دەبیّ.

یەکەم: ئیسلام بوون، مادام تۆ موسلّمانی پێویستە نوێژ بکەی، چون مرۆڤی بیّ باوەڕ داوای نوێژکردنی لیّ ناکریّ.

دووەم: نوێژ لەسەر کەسیّ واجبە کە بلۆغی بووبیّ، یانی گەیشتبێتە تەمەنێکی وا بەتەواوی چاکەو خراپە لەیەک جویّ کاتەوە، چون منالّ گەر نەشی کرد لەسەری واجب نییە، وەلیّ هەر دەبیّ لەتەمەنی حەوت سالّیدا فرمانی پیّ بکریّ تاوەکو ڕابهێندریّ لەسەر نوێژ.

سێیەم: دەبێ ئەو کەسە عەقڵی هەبێ، چون مرۆڤی شێت نوێژی لەسەر نییە.

کەواتـە ئەوانـەی نوێـژ ناکـەن یـان دەبـێ بێبـاوەڕ بـن، یان منـاڵ، یان شـێت، جگـە لەمانە هەرکەسـێ بـێ واجبـە نوێژەکانـی جێبەجێ بکا، چـون فرمانـی خودایەو نابێ بشـکێندرێ.

هەروەکـو خۆشەویسـتمان ئامـاژەی پێـداوە کـە نووسـینی تـاوان لەسـەر سـێ کـەس هەڵگیـراوە: لەسـەر نوسـتوو تاکـو هوشـیار دەبێتـەوە، وەلەسـەر منـداڵ تـا بلۆغـی دەبـێ، وەلەسـەر شـێت تـا چـاک دەبێتـەوە.

بزانـە کـوڕم، نوێـژ لەشاری مەککـە لـە (٢٧)ی مانگـی ڕەجـەب، بەسـاڵێک و نیـو پێش کۆچکردنـی پەیامبـەر بـۆ مەدینـە واجب کـراوە، هەروەکوخـۆی فەرموویەتـی: شـەوی شـەوڕەویم بۆ ئاسمان خـوای گەورە پەنجـا نوێژی لەسـەر گەلەکەم واجب کـرد، وەلێ هەر پاڕامـەوەو داوای سـووک کردنـم کـرد، تـا کردنیـە پێنـج نوێـژ لەهەمـوو شـەو و ڕۆژێک.

+ ماشەڵا مامۆستا پەیامبەرمان چەندە دڵسۆز بووە بۆمان کەئاوا بۆی کەم کردووینەتەوە.

- بـێ گومـان کـوڕم، هەرچەنـدە بۆخـۆی هیـچ کێشـەی نەبـووە لەگـەڵ پەنجاکـەدا وەلـێ بەتەمبەڵـی ئێمـەی زانیـوە، بۆیـە ئـەم داوایەی کـردووە.

+ بەڕاسـتی سەرسـامم لـەو کەسـانەی دوای ئـەم هەموو سـووک کردنەش لەسـەریان کە ئەگـەر هـەر پێنـج نوێـژ کۆکەیتـەوە هەر بیسـت خولەکێـک دەخایەنـێ لەبیسـت و چوار کاژێـردا، کەچـی ئامادەنییـن ئەم مـاوە کەمە بۆ خوداو دروسـتکەرەکەیان سـەر دانەوێنن.

- خـودا ڕێگـەی هەمـووان ڕۆشـن بـکا کـوڕم، جـا ئـەوەش بزانـە کەهەمـوو نوێـژەکان کات و سـاتی خۆیـان هەیـە، هـەروەک خـودا فەرموویەتـی: نوێـژ بکـەن بەڕاسـتی نوێـژ لەسـەر بـڕواداران نـووسراوەو کاتـی بـۆ دانـراوە [١٠١].

خـودا ئـەم نوێژانـەی لەکاتـی جیاجیـا دانـاون، وای دەبینـم کەلەبـەر ئـەوە بـێ بەنـدە مـاوە مـاوە خـودای بکەوێتـەوە یـاد و دروسـتکارو مەعشـوقی حەقیقـی لەهیـچ کاتـێ لەیـاد نـەکا. بـۆ ئـەوەش کەئـەم بەندەیـە گـەر لەنێـوان نوێژەکانـدا تووشـی بـێ فەرمانـی و گوناهێـک هـات، ئـەوا کردنـی نوێژەکـە پاکـی بکاتـەوە.

خودا گەلێ بەسۆزە لەگەڵ بەندەکانی، حەیفە کەئێمە لەیادی بکەین.

---

١٠١- سوورەتی نیسائ، ئایەتی ١٠٣.

ئـەو دەمانـەی لەنێـو نوێـژ دایـن پێویسـتە تـەواو بیروهۆشـمان لەسـەری بـێ و بزانیـن کەچـی دەڵێیـن سـیڕاج گیـان، نوێژێـک کەنەزانـی چـی تیـا دەڵێـی و لەگـەڵ کـێ دەدوێـی، تەنیـا چەنـد گوتەیەکـی خێـراو لەکـۆڵ کردنـەوە بـێ، دەبـێ ئـەم نوێـژە چ سـوودێ بەخاوەنەکـەی بگەیەنـێ؟ تخـوا گـەر لەگـەڵ هاوڕێکانمـان ئـاوا بەخێرایـی بدوێیـن بـەم شـێوازەی کـە لەنێـو نوێژیـن، ئایـا ئـەم هاوڕێیـە بێزاریـمان لـێ دەرنابـڕێ؟ دەی بزانـە کەتـۆ لەگـەڵ خـودا دەدوێـی خـودا.

جـا یەکەمیـن نوێـژ کـە فێـری خۆشەویسـتمان کـرا نوێـژی نیـوەڕۆ بـوو، پاشـان عـەسرو مەغریـب و عیشـاو دواهەمینیشـیان بەیانـی. هەموویـان چـوار ڕکاتـن تەنیـا مەغریـب سـێ ڕکاتـەو بەیانیـش دووە.

وەبزانـە کەهـەر کەسـێ بـاوەڕی بەیەکـێ لەنوێـژەکان نەبـێ ئـەوا لەبازنـەی ئیسـلام دەردەچـێ، چـون بـڕوای نەمـاوە بەیەکـێ لەپایـەو ڕوکنـە مەزنەکانـی دیـن.

- ڕوونە کوڕم، بچینە سەر بابەتێکی دیکە؟

+ بەڵـێ قوربـان بابچینـە سـەر بابەتـی دواتـر، چـون ڕۆژانـە زۆر دووبـارە دەبێتـەوە سـانایە لـەلام.

- باشە بیخوێنەوە.

+ **زەکات دان ڕزگار کردنی هەژارانە لەنەهامەتی**

ڕوکـنی سێیەمت بۆ بکـەم ئیقرار   زەکـاتە بیدە گەدا و هەم هەژار
نەختێ لەماڵت سەرف کە بۆ خوا   گەرنا ئەو ماڵە سەری تۆ دەخوا

+ بفەرموو قوربان.

- بزانـە کـوڕی ئازیـزم، زەکات ڕوکنـی سـێیەمی ئیسـلامەو لەمانگـی شـەوالی سـاڵی دووەمـی کۆچـی واجـب کـراوە.

بریتیە لەوەی کەوا موسڵمان نەختێ لەماڵی خۆی بدا بە موسڵمانێکی تر کەوا هەژارە.

ئـەم ئاینـە ئاینـی سـۆزو میهرەبانـی و بەخشـینە، لەهیـچ ئاینێکـی تـرا بـەم شـێوازە جەخـت لەسـەر بەخشـین نەکراوەتـەوە.

بیر لەوە بکەرەوە کوڕم، گەر خەڵکی لەم جیهانەدا ئەم واجبە جێبەجێ بکەن و ئەو ماڵەی لێیان زیادەو گەیشتۆتە ڕادەیەکی دیاریکراو ببەخشن بەسەر کەم دەرامەت و هەژاران، ئایا هەژار بوونی دەمێنێ لەجیهان؟ ئایا هەموان بەخۆشی و کامەرانی ناژین؟

+ بێگومان مامۆستا گەر مرۆڤە هەبووەکان یارمەتی هەژاران بدەن ئەوا دەستەواژەی هەژار بوونی نامێنێ، چون مرۆی وا هەیە کە موڵک و ماڵەکەی لە هەژمار نایە. وەلێ پرسیارێکم هەبوو قوربان، بۆچی خودا هەمووانی چەشنی یەک دروست نەکرد، هێندێکی هەژارەو هێندێکی دەوڵەمەند؟

- کوڕی خۆم، دونیا گۆڕەپانی تاقیکردنەوەیەو ئێمە کاتێکی دیاریکراو تیایدا دەمێنینەوە، ئەوەی گرنگە ڕۆژی پەسڵانە[١٠٢]. ناکرێ ئێمە لەهەموو ڕوویەکدا وەکو یەک بین. بیر لەوە بکەرەوە گەر هەموو سەرمایەدار بان ژیان چی لێ دەهات؟ کێ کرێکاری دەکرد؟ کێ بازاڕو دوکانەکانی بەڕێوە دەبرد؟ کێ پاشەڕۆکانی کۆدەکردەوە؟ هەرکەسەو خۆی ئاغایەک دەبوو بۆ خۆی، کێ لەکۆگاو کارگەکان کاری دەکرد بۆ بەرهەم هێنانی ئەم هەموو پێداویستیەی کەهەیە. پیرەمێرد پەندێکی جوانی هەیە کەدەفەرموێ (من ئاغاو تۆ ئاغا، ئەی کێ جێمان بۆ ڕاخا ). خودا هەندێکی هەژارو هەندێکی دەوڵەمەندو هەندێکی ناوەندی دروست کردووە بۆ ئەوەی سووڕی ژیان بەردەوام بێ و هەموویان تاقی بکاتەوە، ئایا دەوڵەمەندەکە یارمەتی هەژارەکە دەدا، سەروەتەکەی لەچاکەدا بەکاردێنێ؟ ئایا هەژارەکە ڕازیەو شوکرە بەو بەشەی خودا پێی داوە؟ پاشان لەڕۆژی پەسڵاندا پاداشتی هەژارەکە چەند قاتی دەوڵەمەند دەداتەوە گەر کەسێکی شوکر بووبێ.

ئینجا لەوەیە ئەو هەژارە لەچەندین ڕووەوە لەبابای سەرمایەدار خۆشبەخت تربێ. چەند کەسمان بینی بەهۆی سەروەت و سامانەوە خۆشی لێ تێک چووە و ڕۆژو شەو خەیاڵی لای پارەو بازرگانی و سەروەتەکەیەتی، تەنانەت ناپەرژێتە سەر ئەوەی تۆزێ ڕوونیشێ و یادی خودا بکا و خودای لەبیرچۆتەوە. خۆ لە کەتواردا[١٠٣] ئەمە چاکترە ناوی لێ بنرێ هەژاری.

---

١٠٢- پەسڵان: ڕۆژی دوایی.

١٠٣- کەتوار: واقیع.



بزانــە ئازیزەکــەم، هەرکەسـێ بڵـێ زەکات واجـب نییـە پێـی لەدیـن دەردەچـێ، چـون نکوولـی ڕوکنێکـی ئیسـلامی کـردووە، وە کەسـێک گـەر هەبووبـێ و زەکات نـەدا پێویسـتە گـەورەی موسـڵمانان بـەزۆر لێـی وەرگـرێ، جـا گـەر هـەر نەیـدا جەنگـی لەگـەڵ دەکـرێ، چـون ئەمـە مافێکـی هەژارانـە بەماڵەکـەی ئـەوەوە بەسـتراوەو ناکـرێ لێیانـی قەدەغـە بـکا.

خودا لەچەندین شوێنی کتێبەکەیدا دەفەرموێ، نوێژ ئەنجام بدەن و زەکات بدەن.

زەکات لەپێنـج جـۆرە شـتدا واجبـە بـدرێ، یەکـەم: ئـاژەڵ، وەکـو وشـترو ڕەشـە وڵاغ و بـزن و مـەڕ. دووەم: پارەوپـوول و زێـڕو زیـوە. سـێیەم و چـوارەم: دەغـڵ و دان و میوەیـە. پێنجـەم: کەلوپەلـی بازرگانیـە.

ئەمانــەی گوتمــان پێویســتە بگەنــە ڕادەی زەکات ئینجـا زەکاتیــان لــێ دەردەکــرێ، واتـا گـەر کـەم بـوون و نەدەگەیشـتنە ئـەو ڕادەی کەشـەرع دانـاوە بـۆ زەکات ئـەوا زەکاتیــان نــادا.

هەروا پێویسـتە سـاڵێکیان بەسـەردا بـڕوا هەر لەموڵکـی خاوەنەکەیدا مابێ ئینجا سـاڵانە زەکاتـی لـێ دەردەکا، تەنیـا میـوەو دانەوێڵە نەبێ کەمەرج نییە سـاڵێکیان بەسـەردا بڕوا، بەڵکـو دانەوێڵـە لەکاتی دەنک ڕەق بوونی و میوە لەکاتـی بەڵەک بوونی زەکاتیان واجب دەبـێ. ئیـدی بـۆ زانینـی ڕادەو مەرجەکانیـان دەبـێ بگەڕێیتـەوە بـۆ کتێبە شـەرعیەکان، پێویسـت نییـە لێرە پتر لێـی بدوێین چون باسـەکەی ئێمـە بیروباوەڕە.

- ئەوەندە بەس بێ بۆ ئەمڕۆ لەوەیە درەنگ بکەوی؟

+ قوربـان پێـم خۆشـە ئیمـڕۆ ئەرکانـەکان تـەواو بکەیـن، یەشـتا تـۆزێ کات مـاوە و ئیمـڕۆ زووتـر هاتبـووم، بابەتەکانیـش خـۆش و سـانان لـەلام.

- باشە بیخوێنەرەوە.

## + ڕۆژووی ڕەمەزان، پاک بوونەوەی بەندەکانە لەچڵکی تاوان

ڕۆژوو چوارەمین ڕوکنی ئیسلامە      لێت قەدەغەیە هەرچی تەعامــە
تــاکو ڕۆژئاوا، لەکــاتی بەیـــان      هیچ شتێ مەخۆ لە ئاو و لە نان

- سیڕاج گیـان، ڕۆژوو چوارەمیـن ڕوکنـی ئیسـلامە لەمانگـی شـەعبانی سـاڵی دووەمی کۆچـی واجـب کـراوە. بەخششـێکی زۆر گەورەیـە بـۆ موسـڵمانان، چـون دەبێتـە مایـەی ڕازی بـوون و لێخۆشـبوونی خودایـی.

پێویسـتە لەسـەر ئـەو کەسـەی ڕۆژوو دەگـرێ لەبـەری بەیـان تاوەکـو ڕۆژئاوابـوون خـۆی قەدەغـە بـکا لەخـواردن و خواردنـەوەو ئـەو چشـتانەی ڕۆژوو بەتـاڵ دەکەنـەوە. خـودا لـە کتێبـە پیرۆزەکەیـدا دەفەرمـوێ: ئـەی بـڕواداران، ڕۆژووتـان لەسـەر واجـب کـراوە هـەروەک لەسـەر گەلانـی پێـش ئێـوەش واجـب کرابـوو[١٠٤].

هەروەهـا بزانـە کـوڕم کەلەزانسـتی پزیشکیشـدا سـەلماوە کـە کـەم خـواردن بـۆ مـرۆڤ چاکـترە لـەزۆر خـۆری. زۆرێـک لەنەخۆشـیەکانی مـرۆڤ بەهـۆی خواردنەوەیـە، وەلـێ گـەر ئـەم مرۆڤە لەسـاڵی مانگێک بەیانی تـا ئێوارە خـۆی بگرێتەوە لەخـواردن، بێگومان دەبێتـە هـۆی پـاک بوونـەوەی ئەم جەسـتەیە و جگە لـەوەش ڕازی بوونی خـودای تیایە و زیاتـر وات لـێ دەکا هەسـت بەبرسـیەتی و کـەم دەرامەتـی هەژارانیـش بکەی.

خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی گـەر مانگـی یەک شـەوەی ڕەمەزانتـان بینـی بەڕۆژووبن، وەئەگـەر مانگـی یـەک شـەوەی شـەوالتان بینـی بیکەنـە جـەژن، وەلـێ گـەر مانگتـان نەبینـی ئـەوا سـی ڕۆژی شـەعبان یـان ڕەمـەزان تـەواو بکـەن.

+ واتا بۆ زانینی ڕەمەزان یاخود جەژن پێویستمان بەبینینی مانگە.

- ڕێـک وایـە کـوڕم، هەروەهـا بزانـە کەمەرجەکانـی واجـب بوونـی ڕۆژوو چـوار دانەن، یانـی هەرکەسـێ ئـەم چـوار مەرجـەی تیابـێ واجبـە لەسـەری لەمانگـی ڕەمـەزان بـەڕۆژوو بـێ.

یەکـەم: ئیسـلام بـێ، دووەم: بلۆغـی بووبـێ، چـون لەسـەر منـاڵ واجـب نییـە، سـێیەم: عەقڵـی هەبـێ، چـون داوای ڕۆژوو لەشـێت و مرۆڤـی بـێ هۆش ناکـرێ، چـوارەم: توانای ڕۆژوو گرتنـی هەبـێ، چـون مرۆڤـی نەخـۆش و پەککەوتـە ئـەم توانایەیـان نییـە.

---

١٠٤- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ١٨٣.



هەروا ئەو کەسەی ڕۆژوو دەگرێ پێویستە شەوانە نیەتی هەبێ کەوا بەیانی بەڕۆژوو دەبێ، ئینجا خۆی قەدەغە بکا لەخواردن و خواردنەوەو تێکەڵ بوون لەگەڵ خێزانی و خۆ ڕشاندنەوە، تاوەکو ڕۆژ ئاوا دەبێ.

- ڕوونە کوڕەکەم وانییە؟

+ دەمت خۆش قوربان، زۆریش ڕوونە، بچمە سەر بابەتی دواتر؟

- بفەرموو.

+ **حەج کردن، هەنگاو نان بەرەو ماڵی خودا**

حەجیش پێنجەمین ڕوکنە بیزانە　　چوون لەبۆ مەککە و ماڵی یەزدانە

یەک جار واجبە لەنێو تەمەندا　　گەر خودا توانای ڕێگات پێ بدا

+ بفەرموو قوربان.

- ئازیزەکەم سیراج، پێنجەمین ڕوکنی ئیسلام حەج کردنە، لەساڵی شەشەمی کۆچی واجب کراوە. بریتیە لەوەی ئەو کەسە بچێتە ماڵی خودا لەشاری مەککەی پیرۆز، چون خودای گەورە فەرموویەتی: خودا واجبێکی لەسەر خەڵک هەیە کەوا حەج کردنە لەسەر ئەو کەسەی توانای ڕێگای هەبێ[١٠٥].

خودا ئەم شوێنەی پیرۆز کردووە و بەماڵی خۆی داینـاوە تاکو موسڵمانان لەوێ گرد ببنەوەو ئەم هەموو ڕەنگ و زمان و شێوە جودایە تێکەڵی یەکدی بن و یەکتر بناسن و سەری بەندایەتی تێکڕا لەم شوێنە بۆ خودای خۆیان دانەوێنن.

یەکێ لەهاوەڵان پرسیاری لەخۆشەویستمان کرد کە حەج کردن هەموو ساڵێ واجبە یان تەنیا یەک جار، فەرمووی تەنیا یەک جار واجبە و زیاتر سوننەتە.

ئەمەش سۆزو میهرەبانی خودایە کەلەسەرمانی گران نەکردووەو لەهەموو تەمەن یەک جار واجبی کردووە بیکەین.

هەروەها گەر ئەم حەوت مەرجەت تیا هاتەجێ ئینجا حەجت لەسەر واجب دەبێ:

یەکەم: ئیسلامەتیە، داوا لەبێ بڕوایەک ناکرێ حەج ئەنجام بدا، دووەم: بالغ بوونە، واتا لەسەر مناڵ واجب نییە، سێیەم: عاقڵ بوونە، یانی لەسەر مرۆی

---

١٠٥- سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی ٩٧.

شـێت نییـە، چـوارەم: ئـەم مرۆڤـە ئـازاد بـێ و کۆیلـە نەبـێ، شـوکر بـۆ خـوا ئێسـتا کۆیلـە نەمـاون، پێنجـەم: خواردەمەنـی سـەفەرو چشـتێکی سـواری دەسـت کـەوێ بـۆ چـوون و گەڕانـەوە، چـون گـەر ئەمانـەی دەسـت نەکـەوت لەسـەری نییـە حـەج بـکا، شەشـەم:ڕێگای بـێ تـرس بـێ لەپیاوخـراپ و مەترسـی گرتنـی نەبـێ، حەوتـەم: کاتەکـەی مابـێ و بتوانـێ بگاتـە وەسـتانی کێـوی عەرەفـە، وە پێویسـتە ئـەم مەرجانـە لەمانگەکانـی حەجـدا بێنەجـێ.

بـۆ پـتر شـارەزابوون لـەم باسـانە دەتوانـی بگەڕێیـەوە بـۆ کتێبـە شـەرعیەکان، چـون ئێمـە لەبیروبـاوەڕ دەدوێیـن.

+ بەڕاسـتی خـودا گەلـێ بەسـۆزە بەرامبەر بەندەکانـی، لەگەڵ ئەم هەموو نازو بەخشـش وخـواردن و جەسـتە جوانـەی کەپێـی داویـن کەچـی تەنیـا داوای چەنـد بەندایەتیەکـی ئاسـان و کەمـی لـێ کردوویـن کەهەموو کـەس دەتوانـێ بەسـانایی ئەنجامیـان بدا.

منیـش یـەک پرسـیارم هەیـەو ئیـدی دەبـێ بڕۆمـە قوتابخانـە، ئەویـش ئەگـەر کەسـێ بڵـێ ئایـا خـودا چ پێویسـتی بـەم پەرستشـانە هەیـە کەلەسـەر ئێمـەی واجـب کـردووە، تـۆ چـۆن وەڵامـی دەدەیتـەوە؟

- باشـە کـوڕم وێنـای بکـە ئەگـەر کەسـێکی ئازیـزت هەبـێ لـەوەرزی زسـتاندا پێـت بڵـێ کەئـەم چاکەتـە لەبەرکـە تاوەکـو سـەرما بـردوو نەبـی، ئایـا دەکـرێ تـۆ پێـی بڵێـی تـۆ چ پێویسـتت بەمەیـە تامـن لەبـەری کـەم و کارت بەمنـدا چییـە؟ یاخـود نەخـۆش بیـت و دکتـۆرێ پێـت بڵـێ کەئـەم دەرمانـە بەکاربێنـە بـۆ چـاک بوونـت، دەکـرێ پێـی بێـژی تـۆ چ پێویسـتت بەمـە هەیـە کـە ئـەم دەرمانـە بەمـن دەدەی؟

+ بێگومان وەڵامێکی بێ عەقڵانەیە و ناشیرینە.

- دەی خـودا چ پێویسـتی بـە پەرستشـی تـۆ نییـە، بەڵکـو ئـەوە تـۆی تووشـی نەخۆشـیەکی مەعنـەوی بوویـت و شـەیتان و نەفسـی بـەد دەورەیـان داوی و لەڕێـگای ئـەم پەرستشـە ڕۆحیانـە دەگـەی بەمەڵهـەم و چارەسـەرو نزیـک بوونـەوە لەخـوداو دروسـتکەرەکەت. هـەروا لێخۆشـبوونی خـودا بەدەسـت دێنـی و لەکەسـێکی بـێ بـاوەڕ جـودا دەبیتـەوە کەخـودا ناناسـێ، ئەمـە جگـە لەسـوودە جەسـتەییەکانی کەدەتوانـی لەزانسـتی پزیشـکیدا بـەدوای بگەڕێـی.

+ سوپاست دەکەم قوربان، خودا پاداشتت داتەوە و سۆزی خۆی بەسەرتدا هەڵڕێژێ، من گەر نەڕۆم درەنگ دەکەوم، گەر مۆڵەتم بدەن.

- بفەرموو سیڕاج گیان.

سیڕاج بەخێرایی بەرەو قوتابخانە تێی تەقاند، چەند خولەکێک لەکاتی خۆی دواکەوتبوو ئەو ڕۆژە، وەلێ خۆش بەختانە یەشتا وانەکە دەستی پێ نەکردبوو.

کاتێ گەڕایەوە ماڵێ پایسکلێکی جوانکیلەی لەحەوشەکەدا چاو پێکەوت. خێرا ڕای کردە ژوورەوە و مام سلێمانی لەئامێز گرت و دەستی ڕامووسی و سوپاسی کرد.

- ئاگات لێبێ کوڕم، بەزۆر لێم سەندوون، نرخ و نیوێکی خۆیم پێداوە تاپێیان فرۆشتم، خۆت دەزانی ماڵی مام تۆفیق تۆزێ منجڕن.

+ بەسەرچاو باوکە گیان، ئێستا دەڕۆم تۆزێکی پیاسە پێدەکەم، بزانم لێخوڕینی چۆنە.

- باشە ئاگاداری خۆتبە.

سیڕاج بەدڵێکی پڕ لەکامەرانی بەپایسکیلەکەی بەنێو لادێکەدا دەچەرخا،[١٠٦] لەپڕ مام ئیسماعیل لەدوایەوە بانگی لێ کرد: سیڕاج کوڕم، وەرە کارم پێتە.

سیڕاج تۆزێ کشایەوە دواوە و گوتی ؛ فەرموو مام ئیسماعیل.

- حاڵت چۆنە سیڕاج گیان، ماڵەوەتان چۆنن کوڕم؟.

+ شوکر بۆ خودا قوربان هەموو باشین، ئەی ئێوە چۆنن؟

- ئێمەش باشین ئەلحەمدولیلا، تۆزێ کارم پێت بوو، سیڕاج گیان خۆت دەزانی لەم ماوەیەدا مزگەوتی لادێکەمان تۆزێ نۆژەن کردەوە، ئێستا بووە بەماڵێکی جوانکیلە شوکر، مامۆستاش تەنێ ڕۆژی هەینی دێ بۆ وتار خوێندنەوە. من خولێکی قورئانم تیا کردۆتەوە و چیدی لەماڵەوە دەرس بەقوتابیان ناڵێم، تۆش قورئانت خەتم کردووە لەخوا بەزیادبێ، بۆیە دەبێ یارمەتیم بدەی و بەیەکەوە دەرس بڵێینەوە، چون فێرخوازان زۆرن و بەروەستی هەمووان ناکەم.

+ وەڵا زۆرم پێ خۆش دەبێ کەبتوانم کەسانێ فێری گوتەی خودا بکەم، پێم بێژە چ کاتێ بێم؟

---

١٠٦- چەرخان: خولانەوە.

- هەمـوو شـەوێ دوای نوێـژی عیشـا دەسـت پـێ دەکەیـن و کاتێکـی لەبـارە، چـون لـەو دەمـە هەمـوو لەماڵیـن و کارمـان نییـە، بۆیـە هـەر لەئەمشـەو ڕا وەرە.

+ بەسەرچاو مام ئیسماعیل گیان، بێ خەمبە، چ خزمەتی دیکەت نەبوو؟

- تەواو هەر ئەمە بوو، خودات لەگەڵبێ و بیرت نەچێ.

سـیڕاج بەپایسـکیلەکەی دەسـتی بـە چەرخـان کـردەوە، وەپێـش ماڵـی ئەمیـردا تێپـەڕی و ڕوانـی لەبـەر دەرگا ڕوونیشـتووە.

+ ها ئەمیر چۆنی، حاڵت چۆنە؟

- شوکر باشم سیڕاج تۆ چۆنی، چییە ئەم پایسکیلەت لەکوێ هێناوە؟.

+ باوکم بۆی کڕیم، هاتووچۆی قوتابخانەی پێ دەکەم.

- ئەهـا سـیڕاج، چشـتێ هەبـوو دەمویسـت پێتـی بێـژم، ئایـا زریانـت بیـرە کـە لەقۆناغـی سـەرەتایی لەگەڵـمان بـوو؟

+ بەڵێ بیرمە ئەمیر، بۆچی؟

- دوێنـێ لەگـەڵ باوکـی هاتبوونـە ماڵـمان، خـۆت دەزانـی لەگـەڵ باوکـم چەنـد هاوڕێـن. ئیـدی بابەتـی قوتابخانـەو قۆناغـی سـەرەتاییم لەگەڵـی کـردەوە، بـاس و خـواس هاتـە سـەر سـەناریا، ئـەو گوتـی کەئێسـتا ماڵـی سـەناریا لەدێـی چنـارە و بەچـاوی خـۆی لـەوێ بینیویەتـی، چـون ماڵـی زریانیـش لـەوێ دوور نییـە.

سیڕاج پتر نزیک بوویەوە و بەپەشۆکاویەوە کە خەریک بوو دڵی دەوەستا هاتە گۆ:

+ باشە نەیگوت ڕێک چ شوێنێکی لادێکە؟

- وابزانـم گوتـی حەوزێکـی گـەورەی ماسـی لـەوێ هەیـە، ماڵیـان دەکەوێتـە پشـتی حەوزەکـە گـەر هەڵـە نەبـم، پێـم وابـێ تـۆ هێشـتا ئـەوت لەیـاد نەکـردووە وانییـە؟

سـیڕاج چاوەکانـی تـەژی[107] بـوون لەئەسریـن و گوتـی: باشـە ئەمیـر سوپاسـت دەکـەم، مـن دەبـێ بـڕۆم، خـوات لەگـەڵ بـێ.

- بۆ کوێ سیڕاج؟ ئەم کچە پاماڵ[108] کەی چاکترە بۆت برا.

---

١٠٧- تەژی: پڕ.

١٠٨- پاماڵ: پێشێل.

سیڕاج دووبارە ئەوینەکەی وەخەبەر هات کەدەمێ بوو خەواندبووی لەنێو دڵیدا. ئاای لەو ساتەی کەدووبارە عیشق لەدڵدا وەئاگا دێتەوە، تۆ گەرەکتە عیشق کپ کەیتەوە؟

گەرەکتە عیشق دەرکەی لەدەمارەکانی دڵدا؟ ئەو خۆی خاوەنی ماڵە نەوەک تۆ.

ئایا کارێکی لۆژیکیە هەوڵی دەرکردنی خاوەن ماڵێک بدەی لەنێو موڵکەکەی خۆیدا؟

نەک هەر ناڕەواتە دەر، بەڵکو ئەو هەوڵی کپ کردن و سەرگەردان کردنت دەدا تاوەکو چۆک دادەدەی لەبەردەم قاپی مەعشوق.

سیڕاج وەکو شێتێ پایسکیلەکەی لێدەخوڕی و نەیدەگێڕایەوە لە چ بەردو هەورازو نشێوێکدا، تا سەرەنجام لەدۆڵێکدا کەوتە خوارو خەریک بوو دەستی بشکێ و خوێن لەئانیشکی هاتە خوارێ.

بەچاوی پڕ ئەسرینەوە بەرەو ماڵ بوویەوە و لەبەردەم خۆیدا دەیگوت:

ئێستا دووری....
ئەمما لەلام
عومرێکی جاویدانیت هەس
لەخەیاڵی پڵاوی من
هەرگیز هەڵت نەگرتووە دەس.

مەگەر ئەتۆ....
پەری نێو شاری من نەبووی؟
خوێنێکی جاری و ڕەوانی
دەمار دەماری من نەبووی؟

تاکە خونچەی نەپشکواوی
نێو سەریساڵی من نەبووی؟
ئەدی بۆچی ئێستا دووری؟
هی هەرکێ بی
هەر دڵی من
بەیادت دەیبێ سەبووری.

ئـەم ئێوارەیـە هەرچەنـدە خاتـوو ڕەحمـە بانگـی کـرد بـۆ نـان خـواردن نانەکـەی بـۆ نەخـوراو بـە بێتاقەتـی لـەژوورەوە پاڵـی دایـەوە. هەمـوو ئـەو سـاتانەی قوتابخانـەی بیرکەوتنـەوە کەلەگـەڵ سـەناریا بەسـەری بردبـوو.

ئـەو نامەیـەی دەرێنـا کەچەنـد سـاڵێ بوو نووسـی بـووی بـۆ سـەناریا، لەنێـو جانتاکەیدا خەریـک بـوو پەڕپـووت دەبـوو، لـێ قاسـیدێ نەبـوو بیگەیەنـێ. ئاخـی هەڵدەکێشـا و لەبـەر خۆیـەوە دەیگـوت ئـەی نامـەی پـڕ لـە ئەویـن، تـۆ حەقـی خۆتـە لەنێـو قامکـە ناسـکەکانی دولبـەردا بچەرخیـت، وەلـێ داخـی گرانـم لەنێـو ئـەم زیندانـی جانتایـەدا سـەرت ناوەتـەوە و خەریکـە دەنێـو کتێبـان دەپلیشـێیتەوە.

نامەکـەی تـۆزێ دەسـکاری کـردو بەڕێنووسـێکی جـوان سـەرلەبەری خسـتە سـەر دوو پـەڕی نەخشـێنراو و دەنێـو زەرفێکـی کـردن.

دوای نوێـژی عیشـا لـەدەرگا درا، سـەلمان بانگـی کـرد سـیڕاج خێـرا وەرە مناڵێکـە تـۆی گەرەکـە.

سیڕاج بەکزۆڵیەوە هەڵساو چوویە بەر دەرگا: فەرموو کاکە.

- ئـەوە مامۆسـتا سـیڕاج، مـام ئیسـماعیل چاوەنووڕتـە لەمزگـەوت و قـەرارە ئیمشـەو تـۆ دەرس بەئێمـە بڵێی.

+ باشە پێی بێژە ئێستا دێ.

سـیڕاج هەڵوەسـتەیەکی کـردو بیـری کـردەوە، خـۆ ئـەوە پێمـی گـوت مامۆسـتا، یانی من لەمـەودوا مامۆسـتام؟ تـۆزێ بەخـۆ نازیـن لـەم کزۆڵـی و ژاکاویـەدا خـراپ نییـە. خێـرا خـۆی کۆکـردەوە و بـەرەو مزگـەوت وەڕێ کـەوت، بیرکردنـەوە لـەم عیشـقە گفتەکـەی مـام ئیسـماعیلی پـێ لەیـاد کردبـوو.

مـام ئیسـماعیل مناڵەکانـی کـردن بـەدوو بەشـەوە، کەنزیکـەی بیسـت قوتابـی دەبـوون، هێنـدێ لای سـیڕاج و هێنـدێ لای خـۆی.

سـیڕاج ئـەو شـەوە نەختـێ هاتـەوە سـەر خـۆی و هەسـتی بەشـیرینی وانـە وتنـەوە و فێرکـردن دەکـردو سـۆزو ئەوینێکـی پاکـی بنیـات نـا لەگـەڵ قوتابیەکانـی دا.

بـۆ بەیانـی ڕۆژی هەینـی خێـرا نامەکـەی لەنێـو کتێبەکانـی دەرکـردو بڕیـاری چوونـە لای ماڵـی سـەناریای دا، ئەگەرچـی چاکیـش جێگاکـەی پـێ نەدەزانـی، وەلـێ بەرگـەی

نەچوونــی نەدەگــرت.

خــۆی کۆکــردەوە و بەســواری پایســکیلە ســوورەوە وەڕێ کــەوت بــۆ دۆزینــەوەی دڵــدارە ون بووەکــەی. بــاوەڕی بەخــۆی نەدەکــرد کــەدوای ئــەم هەمــوو ســاڵە لەوەیــە ئیمــڕۆ بەختــەوەر بــێ بەدۆزینــەوەی مەنزڵــی دولبــەر.

سـیڕاج بـاش شـارەزای ڕێگاکـە نەبـوو، چـون ڕێـی دووری ئـەو قوتابخانـەو ماڵـێ بـوو، دێـی چناریـش نزیکـەی پانـزە کیلۆمەتـر لەوانـەوە دووربـوو. وەلـێ ئـارەزووی دیـداری یـار بەجـۆرێ ئارامـی لـێ بردبـوو کـە بەهەمـوو هێزیـەوە پایسـکیلەکەی لـێ دەخـوڕی.

ڕێگاکەش گەلێ سەخت و گوپچڕ[١٠٩] بوو، چون پڕبوو لە بەردو دارو هەورازو نشێو.

دەگەیشتە هەرکەسێ پرسیاری دێیەکەی لێ دەکردو ئاڕاستەیان دەکرد.

ڕۆژێکـی تەمـاوی و تاریـک بـوو، کـە بەئاسـتەم بەردەمـی خـۆی دەبینـی و خۆیشـی نەیدەزانـی کەچـۆن ڕزگاری دەبـێ و خـۆی ناکێشـێ بەبـەردو داری سـەر ڕێـگا.

لەپڕێکـدا ڕێـگای گـوم کـردو ئـاگاداری خـۆی نەمـا، کەچاوەکانـی کـردەوە لەنێـو ژوورێکـی بچووکـدا لەسـەر چارپایـەک[١١٠] درێـژ کـراوە و هەمـوو گیانـی ئازاری هەیە.

ژوورێکـی چکۆلـەی تاریـک کـە لەچارپـاو فانـۆس و بەرمـاڵ و چەنـد کتێبێکـی کـۆن پـتر چـی دیکـەی نەدەبینـی. تەسـبیحێکی درێـژی دەنـک سـەوزی گـەورەش لەبەرامبـەری هەڵواسرابـوو، هـەر لەماڵەکـەی مامـە پیـرە دەچـوو.

ویسـتی هەڵسـێتەوە وەلـێ ئـازاری گیانـی ڕێـگای لـێ گـرت و خێـرا هـاواری کـرد، کـێ لێرەیـە؟ مـن لەکوێم؟

پیاوێکـی سـوورو سـپی و تـا ڕادەیـێ نوورانـی، خـاوەن باڵایەکـی تـۆزێ کـورت و سـەرو ڕیشـێکی بـۆز[١١١] وەژووری کـەوت: مەترسـە کـوڕم لەشـوێنێکی سـەلامەت دای، دەتوانـی تـا چـاک دەبیـەوە بـۆ خـۆت لێـرە بـی. گەرچـی منیشـت بـێ جێـگا کـردووە وەلـێ قەینـاکا، مـن هێنـدە لـەژوورەوە نامێنمـەوە، تـۆزێ خورمـام بـۆ هێناویـت هـا بیانخـۆ تـا هێـزت بەبـەردا بێتـەوە.

---

١٠٩- گوپچڕ: دژوار.

١١٠- چارپا: قەرەوێڵە.

١١١- بۆز: ماش و برنج ، تێکەڵە لەڕەش و سپی.

+ وەلێ تۆ کێی؟ من لێرە چی دەکەم؟

- چ پێویست نییە لەئێستادا مـن بناسی، لەکەندەڵانێکدا هەڵم گرتیـەوە، نازانـم خـۆت لەچـی دابـوو وەلـێ جەسـتەت هەمـووی ڕووشـاوەو موددێکـە بـێ هۆشـی. قاچـی ڕاسـتەت خوێنـی زۆر لەبـەر ڕۆییـوە و سەریشـت شـکاوە، برینەکانتـم تیـمار کـردو بەسـتامنەوە، خـەم مەخـۆ ئێـرە شـوێنێکی سـەلامەتە.

ئەوەندەش بانگی سەناریا مەکە، خراپە پیاو هێندە بانگ لە کچان بکا.

+ چی چی؟ کەی من بانگی کەسێکم کردووە !.

- کـوڕم بـەر لـەوەی بەهـۆش بێیتـەوە چەنـد جـارێ بانگـت کـرد، هێندێکیـش بانگـی خـودا بکـە، دێ بەدەمتـەوە.

سـیڕاج سـەری داخسـت و شـەرمی لەخـۆی کـردەوەو گوتـی: وەلـێ مـن نابـێ لێرەبـم، دایـک و باوکـم هـەن، ئێسـتا بەدوامـدا دەگەڕێـن، نارەحـەت دەبـن، ئێسـتا چ کاتێکـە؟

- خـەم مەخـۆ زۆر درەنـگ نییـە، ماوەیەکـە خەڵـک لەنوێـژی هەینـی هاتوونەتـەوە. دوای عـەسر کەتـۆزێ هاتیتـەوە سـەرخۆ لەگـەڵ کەسـێکدا بـە بارکێشـێک[112] ڕەوانـت دەکەمـەوە جێگاکـەت.

+ زۆر سوپاسـت دەکـەم مامـە گیـان کەژیانـی منـت ڕزگار کـرد، مـن قـەرزاری تـۆم، ئـای کەسـەرم ژان دەکا.

- سوپاسـی خـودا بکـە کـوڕم، هێنـدە سەرمەسـتانە بـۆ دولبەرەکـەت هەنـگاو مەنـێ، تـۆ هێشـتا بەدولبـەری حەقیقـی نەگەیشـتووی.

سـیڕاج لەبـەر سـەر ئێشـەکەی زۆر زەینـی بـەلای قسـەکانیدا نەبـوو، بۆیـە بەبـێ دەنگـی چاوەکانـی نووقانـد بەڵکـو تـۆزێ خـەوی پیـا بکـەوێ.

لەخـەودا سـەناریای بینـی لەنێـو گوڵسـتانێکدا بـە عەزیەیەکـی سـپی، کـە لـەوە دەچوو بـۆ ڕۆژی بووکێنـی خـۆی ئارایـش دابـێ، سـیڕاجیش هـەر بـەرەو ڕووی دەڕۆیـی. وەلـێ سـەیر لەوەدابـوو چەنـدە سـیڕاج لێـی نزیکـتر دەبـۆوە سـەناریا دوورتـر دەکەوتـەوە، تـا وای لێهـات لەبـەر چاوانـی ون بـوو. سـیڕاج دەسـتی بەگریـان کـرد، لەپڕێکـدا پیاوێکـی نەنـاسراوی جـل سـپی دەسـتی سـیڕاجی گـرت و لەگـەڵ خۆیـدا بـەرزی کـردەوە بـۆ

---

١١٢- بارکێش: وڵاخ.





ئاسمان، هاواری کرد بۆ کوێم دەبەی؟ بۆ کوێم دەبەی؟ سەناریا ڕۆیی.

پیاوە جل سپیەکە گوتی ؛ لەعیشقەوە لازمە هەنگاو هەڵگرین بەرەو عیشقێکی باڵاتر.

لەگەڵ ئەم گوتەیەدا سیراج ڕاپەڕی لەخەودا، هانەهانی لێوە دەهات، پیاوە نەناسراوەکە خێرا تۆزێ ئاوی پێداو گوتی: چی بووە کوڕم؟

+ هیچ نییە خەوێکی سەیرم بینی.

- ئاساییە، مرۆڤ لەکاتێکدا ئێش و ئازاری هەبێ خەویش دەبینێ، هیوام وایە ئەم خەوەی تۆ لەوانەبێ کەبەزوویی بێنەجێ.

+ وەکو ئەوە دەدوێی کەبزانی خەوەکەی من چییە ! پێم خۆشە ناوت بزانم، تۆ لەمامەپیرە دەچی.

- کوڕی خۆم، ڕۆژگارێ بوو خەڵک کونج بەکونجی ئەم جیهانە دەگەڕا بەدوای بەدەست هێنانی زانست، لەهەر شوێنێک ئوستادێکی لێهاتووی بەدی کردبا چۆکی بۆ دادەنا. وەلێ ئێستا مامۆستاکان بەدوای فێرخوازان دا وێڵن و نەزانەکان برەویان هەیە و مەجلیسی گەرم و گوڕ لای ئەوانە و زاناکان تەنها کەوتوون.

خەڵکی نایان ناسن و لەگەڵیان ڕوونانیشن، چەند کەسێکی کەم نەبێ لەدەورەیان بەدی ناکرێ، پیاوانی خوداش بێ نیازن لەخەڵک و لازمی ناسینی ئەوان نیین، چون ئەوان لەگەڵ عیشقێک دەژین کەهەر دڵۆپێکی دەریایەکی بێ پایانە.

لەئێستادا خەریکی زانست بە کوڕی خۆم، چاوت لەم دونیا پڕوپووچەی خەڵک نەبێ. لێگەڕێ با چشتی پڕوپووچ بۆ ئەوان بێ و تۆ گەوهەر دەسخە، مەحوی مەزن فەرمووی:

دونیا بەکامی هیچ کەسانە هەمیشە دەم
هیچ ئەڵبەتە بەهیچ دەمێ نابڕێ لە هیچ

پیاوێکم تێ گەیاندووە ئێستا دێ بەبارکێشەکەی دەتگەیەنێتەوە و پایسکیلەکەشت لەنێو عەرەبانەکە جێگای دەبێ.

+ نازانم چۆن چاکەت بدەمەوە قوربان.

- دەست بەخوێندنەوە بگرەو چاکەم ناوێتەوە، ئەوە گەیشت کاک سەردار، خۆت ئامادەکە بۆ ڕۆشتن.

+ سەلام وعەلەیکوم یاشێخ، خۆ درەنگ نەکەوتم؟

- عەلەیکە سـەلام، کاک سـەردار بەخێرهاتـی لەکاتـی خۆیدابـوو، یارمەتیـم دە تـا هەڵـی سـێنینەوە و سـواری بکەیـن، ئـاگاداری بـە تاڕادەسـتی ماڵـەوەی دەکەیـەوە.

+ بەسەرچاو قوربان، بێخەم بە.

سـیڕاجیان سـواری گالیسـکەکە کـردو وەڕێ کـەوت بـۆ گەیاندنـەوەی. لەڕێگادا سـیڕاج گوتـی: کاک سـەردار مـن ماڵـم لەشـاخانە، ئەزیەتیشـت دەدەم ڕێگاکە تـۆزێ دوورە.

- دەزانم براکەم، جەنابی شێخ پێی گوتم.

+ چی ! وەڵێ من ناونیشانی خۆم بەم کابرایە نەگوتووە، چی پێ گوتی !

- ناونیشـانی تـەواوی ماڵەوەتـی دامـێ، گوتیشـی کەهیـچ لەبـارەی ئـەوەوە بەتـۆ نەڵێـم، بۆیـە تکایـە پرسـیارم لـێ مەکـەو تەنـێ ئـەوەی لەسـەر منـە گەیاندنـی تۆیـە.

سـیڕاج سەراسـیمە بـوو، ئـەی خودایـە ئەمـە چۆنـی زانـی ماڵـم لەوێیـە ! دووبـارە مامـە پیرەیەکـی دی، ئـای بیـرم کەوتـەوە، خـۆ ئـەو گوتـی هێنـدە سەرمەسـتانە بـۆ دولبەرەکـەت هەنـگاو مەنـێ !

ئای سەرم وەژان کەوت، دواتر بیر لەم چشتانە دەکەمەوە کەباش بووم.

- ئـاوەزت[113] سـەرقاڵ مەکـە بـرا، تـۆ یەشـتا نەخۆشـیت، دواتـر هەوڵـی شـیکارکردنی ئـەم چشـتانە بـدە.

گەیشـتنە بـەر دەرگای ماڵـی سـیڕاج و کاک سـەردار لـەدەرگای داو خاتـوو ڕەحمـە هاتـە دەرێ. کەچـاوی بـەم حاڵـەی سـیڕاج کـەوت لەهارژنـی دا[114]: ئەیـەڕۆ کـوڕم چـاوم دەرێ ئەمـە چیـت لـێ هاتـووە، خێـرا باوەشـی لەسـیڕاج وەرێنـاو دەسـتی بەگریـان کـرد، ئەمـە کـێ وای لەکـوڕی مـن کـردووە؟.

- هیـچ نییـە خاتـوون، ئـەو بەپایسـکیلەکەی ڕێـگای ون کردبـوو، کەوتبوویـە کەندەڵانێـک، خێرخـوازێ هەڵـی گرتۆتـەوە و برینەکانـی پێچاوەتـەوە، ئینشـاڵا زوو بـاش دەبـێ.

---

١١٣- ئاوەز: ژیری ، عەقڵ و هۆش.

١١٤- هارژن: هاوار.



کاک سەردار خێرا سیڕاجی هەڵگرت و بردیە ژوورەوە و لەسەر جێگاکە درێژی کردو پایسکیلەکەشی لەحەوشەکە دانا کەهەردوو تاکانی پەنچەرو سوکانەکەشی خوار ببوو، گوتی: ئیدی من دەبێ بڕۆم.

خاتوو ڕەحمە بەچاوی پڕ ئەسرینەوە: سوپاست دەکەم کوڕی خۆم، ئەزیەتت کێشا بۆمان، گەر لەسەر ڕێگاکە پیرەپیاوێک و گەنجێکت بینی پێیان بێژە بڕۆنەوە ماڵێ و کوڕەکەتان هاتۆتەوە، هاوسەرەکەم لەدوای نیوەڕۆوە بەدوایدا وێڵە.

- خەمت نەبێ دایکی من، دڵنیابە بیان بینم پێیان دەڵێم.

دوای ماوەیەک مام سلێمان و سەلمانیش گەڕانەوە ماڵێ، زۆر ناڕەحەت بوون کەلەم حاڵەی سیڕاجیان ڕوانی. مام سلێمان دەستی بەهات و هاوار کرد لەسەری کەبۆچی بەم چەشنە دوورکەوتۆتەوە و ئاوای لەخۆی کردووە و پایسکیلە تازەکەیشی کردووە بە جەنجەڕ.

وەلێ کەزانی سیڕاج سەرئێشەکەی توندە ناچار وازی لێهێناو چوویە بەر بێڵاییەکە[115] پاڵی دایەوە و خۆشی تووشی ژانەسەر هات.

سێ ڕۆژان سیڕاج نەچوویە مزگەوت بۆ وانە وتنەوە و نەچوویە قوتابخانەش. دوای ئەوە کەتۆزێ حاڵی هاتەوە سەرخۆی لەڕۆژی سێشەممەدا بڕیاری چوونەوە قوتابخانەی دا.

پتر لەبەر وانەی بیروباوەڕەکە بوو کە وازی لەچوونە قوتابخانە بوو، بۆیە ئەو ڕۆژە زۆر زوو هەڵسایەوەو بەجەختیەوە[116] خۆی کۆکردەوە، گەرچی یەشتا ئازاری جەستەیشی مابوو.

خاتوو ڕەحمە داوای لێکرد کەئیمرۆش پشوو بدا، وەلێ سیڕاج پێداگر بوو لەسەر چوونەوە.

خێرا تۆزێ نانی خواردو خۆی گۆڕی، چون پایسکیلەکەی کەلکی هاژۆتنی نەمابوو ناچاربوو بەپێ بڕوا، تاگەیشتە بەردەم ماڵی مامۆستا و لەدەرگای دا.

- ئەتۆی سیڕاج گیان.

+ بەڵێ قوربان منم، دیارە یەشتا منت لەیادە.

---

١١٥- بەر بێڵایی: بەر هەیوان.

١١٦- جەختی: چاڵاکی و چاپووکی.

مامۆستا خێرا دەرگای واڵاکردو گوتی: ئەو مامۆستایەی قوتابیەکەی بیرنەبێ شایەنی وانە وتنەوە نییە.

- ئەمە چیت لێهاتووە کوڕم، ئەم برینانە چین لەڕوخسارت؟

+ هیچ نییە قوربان، با ڕوونیشین بۆتی باس دەکەم.

- فەرموو ڕوونیشە سیڕاج گیان، بێژە کوڕم بزانم چی بووە؟

سیڕاج باسەکەی بۆ مامۆستا بەیان کرد و باسی پیاوە نەناسراوەکەشی بۆ کرد، لێ باسی سەناریای نەکرد، پاشان گوتی تۆ چی دەڵێی لەسەر ئەم پیاوە قوربان؟

- وەکو پێشتر پێم گوتی کوڕم، پیاوانی خوا لەهێندێ کار ئاگادار دەکرێنەوە کەئێمە سەری لێ دەرناکەین و نایزانین. ئەو کەسەی لێی دوای دەیناسم و بەخزمەتی گەیشتووم، وەلێ مادام خۆی نەیویستووە بیناسی منیش پێت ناڵێم کێیە تا کاتی خۆی دێ، بۆیە ئێستا وەسیەتەکەی بەجێ بێنەو دەفتەرەکەت واڵاکە با بخوێنین.

+ قوربان لەوەتەی ئەم پیاوەم بینیوە پتر حەزم لەخوێندنە و پێم خۆشە زیاتر بخوێنین و زوو تەواوی بکەم، بەڵکو بتوانم زانستە شەرعیەکانی تریش لەخزمەتت بخوێنم، خۆت دەزانی کەسێکی خوێنەرم و بابەتەکان لای من سەخت نیین.

- باشە مادام وایە پترت پێ دەڵێم، ئێستا دەست پێ بکە.

## + باسی ئیمان

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمان     بیێ شارەزای تەعریفی ئیمان
ئیمان باوەڕە و لەنێو دڵ دایە     بۆ گشت یاسایەک دەرچووی لای خوایە
پێمان گەیشتبێ لەڕێگای ڕەسوول     بەدڵێکی ساف کردبمان قەبووڵ

+ بفەرموو قوربان.

- کوڕی خۆم، پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ کەوا شارەزابێ لەئیمان و بزانێ پێناسەی چییە.

ئیمان بریتیە لەباوەڕی نێو دڵ بۆ هەموو ئەو یاسایانەی کەوا پەیامبەری خۆشەویست لای خودا هێناونی و قەبووڵیشیان بکەی.

وەلێ پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە لەدڵدا ئیمانی هەیە بەزوبانیش دوو ڕستەی شەهادە هێنان بڵێ، تاکو جیاوازی هەبێ لەگەڵ ناموسڵماناو بڕیارەکانی ئاینی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ بکرێ.

بزانە ئازیزەکەم کە بیروڕای زانا ئەشعەریەکان دەربارەی ئیمان ئەوەیە کە ئیمان بەدڵەو پەیوەندی بەزوبان نییە، ئەمە بۆچوونی ئیمامی ماتوریدیشە. وەلێ گوتنی بەزوبان شەرتە بۆئەوەی بڕیارەکانی ئیماندارانت بەسەردا بچەسپێ و جێبەجێ بکرێ لەدونیادا، وەکو مارەبڕین و داوالێکردنی نوێژو ڕۆژوو زەکات و شاردنەوەی لەگۆڕستانی موسڵمانان و هتد.....

+ ئەها، یانی پێویستە بەزوبان دەری بڕی تەنیا بۆ ئەوەی بڕیارەکانی ئیماندارانت بەسەردا بچەسپێ، ئەینا خۆی شوێنەکەی دڵە.

- بەڵێ کوڕم وایە، چون باوەڕی نێو دڵ لەئێمە دیار نییەو گەر دەری نەبڕێ بەچی بزانین کەموسڵمانە تا بڕیاری ئیمانداری بۆ بدەین، پێویستە عەلامەت و زناکێکی[117] هەبێ کە دەربڕینە بەزوبان ئینجا بڕیارەکانی بەسەردا جێبەجێ بکەین. وەلێ گەر بەزوبان دەری بڕی و لەدڵەوە ئیمانی نەهێنابوو ئەوا کەسێکی دوو ڕووە و ئیماندار نییە لای خودا با ئێمەش بەئیمانداری دابنێین.

کۆمەڵێکی تر لەزانایانی پێشین و فەرموودەناس، هەروەها خەواریج و موعتەزیلەکان کە دوو چین و توێژن لەکاتی خۆیدا لێیان دەدوێین، دەڵێن ئیمان تەنیا باوەڕی دڵ نییە، بەڵکو بریتییە لە باوەڕی دڵ و دەربڕینی بەزوبان و کرداریش، واتا دەیکەن بەسێ ڕوکن.

بەڵام زانایانی پێشین کەباسی کرداریان کردووە مەبەستیان ئەوەیە کردار تەواوکەری ئیمانە و مرۆڤ بەنەکردنی لەدین دەرناچێ، وەلێ موعتەزیلە و خەواریج دەڵێن کردار بەشێکی ئیمانە و بەنەکردنی لای خەواریجەکان لەبازنەی ئیسلام دەردەچی و لای موعتەزیلەش پایەیەکت دەبێ لەنێوان کوفرو ئیماندا.

کۆمەڵێکی دیکەش کە پێشەوا ئەبو حەنیفە و هەندێک لەئەشعەریەکانن دەڵێن ئیمان لە دوو ڕوکن پێک هاتووە، باوەڕی دڵ و دەربڕینی زوبان.

---

١١٧- زناک: نیشانە.




لەسـەر ئـەم بۆچوونـە گـەر کەسـێک بـەدڵ بـاوەڕی هەبـوو وەلـێ بەزوبـان دەری نەبـڕی، لـەلای خـودا بەئیمانـدار دانانـدرێ.

بزانـە کـوڕی خـۆم، کـردار بەشـێک نییـە لەئیـمان، واتـا کەسـێ مـادام بـەدڵ ئیمانـی هێنـا ئیـدی ئیمانـدارە بـا کردەوەشـی نەبـێ، چـون ئەگـەر کـردار ڕوکـن بووایـە دەبوایـە موسـڵمان بـە نەکردنـی واجبێـک کافـر بووایـە چـون ڕوکنێکـی نەکـردووە، کەچـی کافـر نییـە ئـەو کەسـەی تەرکـی واجبێـک دەکا، بەڵکـو پێـی گوناهبـار دەبـێ. ئەوەتـا خـوای گـەورە ئـەو موسـڵمانانەی کـە شـەڕ دەکـەن بەئیمانـداری نـاو بـردوون لەقورئانـی پیـرۆزدا کـە دەفەرمـوێ : ئەگـەر دوو دەسـتە لەموسـڵمانان بـوو بەشـەڕیان، ئـەوا دەسـت بەجـێ ئاشـتیان بکەنـەوە [١١٨].

+ کەواتە شەڕ دەکەن و ئیمانداریشن.

- بەڵـێ ئیمانەکەیـان هەیـە، هەرچەنـدە کەواجبـە شـەڕ نەکـەن، وەلـێ بەهـۆی شـەڕەکەوە گوناهبـارن و پێویسـتە ئاشـت بکرێنـەوە.

هەروەهـا ئەوانـەی دەڵێـن ئیـمان دوو ڕوکنـە، بـەدڵ باوەڕکـردن و بەزوبانیـش دەربڕینـی شـایەدی، ڕوکنـی یەکـەم پێویسـتە هەمیشـە هەبـێ کـە لەدڵدایـە، ڕوکنـی دووەم لەوانەیـە جاروبـار نەمێنـێ کـە دەربڕینـی بەزوبانـە، چـون لەوەیـە لەکاتـی ترسـدا نەتوانـێ ئیمانەکـەی بەزوبـان دەربـڕێ.

دەی ئەگـەر گوتنـی بەزوبـان ڕوکـن بووایـە نەدەبـوو جاروبـار نەمێنـێ، کەواتـە وەکـو گوتمـان ئیـمان لەسـەر هێـزی دڵ دادەمـەزرێ نـەک لەسـەر گوتـەی دەم و زار، وەلـێ گوتنـی مەرجـە تـا بڕیارەکانـت بەسـەردا بچەسـپێ.

+ باشـە قوربـان ئـەم زانـا ئەشـعەریانە کەدەڵێـن ئیـمان تەنیـا بـاوەڕی دڵـە، بەڵگەیـان هەیـە لەقورئـان؟

- بەڵـێ کـوڕم، دەربـارەی هەنـدێ لـە بیابـان نشـینە عەرەبـەکان خـودای گـەورە فەرموویەتـی:

هێشـتا بـاوەڕ نەچۆتـە نێـو دڵەکانتـان و جێگیرنەبـووە [١١٩]. کەوابـوو باسـەکە باسـی دڵـە، ڕوونـە ئازیزم؟.

---

١١٨- سوورەتی حوجوڕات ، ئایەتی ٩.

١١٩- سوورەتی حوجوڕات ، ئایەتی ١٤.





+ بەڵێ قوربان گیان بەردەوامبە.

- ئیمان هێنانێکی تر هەیە پێی دەگوترێ ئیمانی تەقلیدی، واتە دواکەوتنی بیروباوەڕی ئەو کەسانەی کەوا جێی باوەڕن. ئەمەش کێشەی نییەو خاوەنەکەی ڕزگاری دەبێ، چون ئەو کەسە شوێن کەسێکی وا کەوتووە کەئیماندارەو ئەویش وەکو ئەو ئیمان دێنێ، بۆیە بەئیمانداری دادەنێین. وەلێ زانایان دەفەرموون بەو مەرجەی ئیمانەکەی هێندە پتەو بێ گەر بابای شوێن کەوتراویش پەشیمان بوویەوە ئەو پەشیمان نەبێتەوە.

دەربارەی زیادو کەمکردنی ئیمانیش خودا خۆی لەستایشی بڕوادارانداا فەرموویەتی: کاتێ ئایاتی خوایان بەسەردا دەخوێنرێتەوە ئیمانیان زیاد دەبێ[120].

کەوابوو ئیمان بەهۆی کردەوەی باش زیاد دەبێ و بەکردەوەی خراپیش کەم دەبێ.

جا ماوەتەوە ڕوکنەکانی ئیمانت پێ بڵێم کەپێویستە هەموو ئیماندارێ چەشنی ناوی خۆی لەبەری بێ، یەکەم: باوەڕ بەخودای مەزن، دووەم: باوەڕ بەفریشتەکانی خودا، سێیەم: باوەڕ بەکتێبەکانی ئاسمان، چوارەم: باوەڕ بەپەیامبەران درودی خوایان لەسەر، پێنجەم: باوەڕ بەڕۆژی دوایی، شەشەم: باوەڕ بەقەزاو قەدەر.

پێویستە موسڵمان باوەڕی بەم شەشانە هەبێ ئینجا بەئیماندار دادەنرێ. گەرکەسێ باوەڕی بەیەکێکیان نەبێ ئەوا لەدین دەردەچێ پەنا بەخوا، جا ئینشالڵا بەدرێژی ئەم شەشە ڕوون دەکەینەوە.

- ئەگەر ڕوونە بابەتی دواتر بخوێنەرەوە.

+ بەسەرچاو قوربان.

---

١٢٠- سوورەتی ئەنفال، ئایەتی ٢.

## باوەڕ بە خودا

بەدڵ باوەڕکە خوای پەروەردگـار   مەوجوودە و هەیە، بەکەس نیتی کار

ئـەووەلی نییە، ئـاخـری نییـــە   واحـیدە یـەعـنـی شـــەریکی نییـــە

بەوەلەد نەبووە و کەسی لێ نابێ   چـی کـەم و کـوڕیە لەبۆ ئـەو نـابێ

+ بفەرموو مامۆستا گیان.

- کـوڕی خـۆم، یەکـەم ڕوکنـی ئیـمان بریتیـە لەبـاوەڕ بەخـوای پـەروەردگار. پێویسـتە لەسـەر هەمـوو کەسـێ بـەدڵ بـاوەڕکا کەخـودای گـەورە بوونـی هەیـە، وە کاری بەهیـچ کەسـێ نییـە، وەلـێ هەمـوو کـەس کاریـان بـەو هەیـە. ئـەو زاتێـکی وەهایە نەسـەرەتای هەیـە و نەکۆتایـی، واتـا ئەزەلـی و ئەبەدیـە و تـاک و تەنیـا و بـێ هاوبەشـە، وەکـو لەباسـی شـادە هێنانـدا ڕوونمـان کـردەوە.

خـودای گـەورە لەکتێبـە پیرۆزەکەیـدا فەرموویەتـی: (ئەڵـڵا) ئێـوەی دروسـت کـردووە، ئینجـا ڕزق و ڕۆزی داونـێ، ئینجـا دەتـان مرێنـێ و دواتـر زیندووتـان دەکاتـەوە [١٢١].

کەوایـە هـەر خـوا هەمـوو چشـتی دروسـت کـردووە، نـەک ئـەو خـودا درۆینانـەی کەوا بەدەسـت خەڵـکان تاشـیویانەو دەسـەڵاتی هیـچ شـتێکیان نییـەو منداڵێکیـش دەتوانـێ تێکیـان بشـکێنێ.

+ قوربـان ببـوورە کەئـەم پرسـیارە دەکـەم، مـن خـۆم هیـچ گومانێکـم نییـە لەخـودا، وەلـێ گـەر کەسـێ دانـی نەنـا بەهەبوونـی خـودا و بڕوایشـی بەقوڕئـان نەبـوو، چـۆن بەڵگـەی بـۆ دەهێنیـەوە کەخـودا بوونـی هەیـە؟

- ئـەم پرسـیارەی تـۆ بەسـەرهاتێکی پێشـەوا ئەبوحەنیفـەی بیرخسـتمەوە ئـەو دەمـەی هەنـدێ بێبـاوەڕ لەگەڵـی ڕوودەنیشـن. ئەویـش پێیـان دەفەرمـوێ ئێـوە چـی دەڵێـن دەربـارەی کەسـێک پێتـان بڵـێ مـن کەشـتیەکی بارهەڵگـرم بینـی کەپڕبـوو لەچشـتی قـوڕس و گـران، لەنـاکاو شـاڵاوی دەریـا لێـی داو بـای بەهێزیـش لەمـلاو لا بـردی، ئـەم کەشـتیەش لەنێـو ئـەم هەمـوو شـەپۆڵ و بایـەدا ڕاسـت و ڕەوان دەڕۆیشـت بەبـێ ئـەوەی شـۆفێرێکی هەبـێ، ئایـا ئـەم گوتەیـە گونجـاوە لەگـەڵ ئـاوەزدا[١٢٢]؟

---

١٢١- سوورەتی ڕۆم ، ئایەتی ٤٠.

١٢٢- ئاوەز: ژیری ، عەقڵ و هۆش.

ئەوانیش گوتیان بەڕاستی ئاوەز قەبووڵی ئەمە ناکا کەشتیەک بەبێ شۆفێر لەنێو ئەم هەموو شەپۆڵ و زریان و بایەدا ڕزگاری بێ، بێگومان نوقم دەبێ.

ئینجا پێشەوا فەرمووی باشە کە ئاوەزی ئێوە قەبوڵی ئەوە نەکا کەشتیەک بەبێ شۆفێرو یارمەتی کەسێک بڕوا لەدەریادا، ئەی چۆن دەبێ ئەم دونیایە (کەکەشتیەکی هێندە مەزنە) ڕابوەستێ بەم هەموو گۆڕانکاری گەرماو سەرماو شەو و ڕۆژو ئاو و ئاگرو دەریاو زەریا، بەبێ خاوەنێک کە بیپارێزێ و سەرپەرشتی بکا؟!

بێگومان هیچ چشتێ لەخۆیەوە دروست نابێ بەبێ دروستکەرێک. وێنای بکە کوڕم، ئایا دەکرێ وێنەیەک ببینی و بڵێی ئەم وێنەیە بەبێ وێنەکێش خۆی کێشراوە؟

+ بێگومان دەبێ وێنەکێشێک کێشابێتی قوربان.

- دەی ئەم دونیا مەزنە بەم هەموو هەسارەو ڕۆژو مانگ و گەلەئەستێرەو کاکێشانە کە هەر هەمووی سیستەم و یاسایەکی تایبەت بەخۆی هەیەو کاری خۆی جێبەجێ دەکا بەبێ لێ تێکچوون، تخوا چ عەقڵێ قەبوڵی ئەوە دەکا ئەو هەموو چشتە قەشەنگ و پڕ لەیاسایە لەخۆیانەوە هاتبنە بوون؟

+ باشە ئەمە زۆر ڕوون بوو قوربان، وەلێ پرسیارێکی دیکە لێرە بۆ بابای بێباوەڕ دروست دەبێ ، ئەویش ئەوەیە گەر هەموو چشتێ دروستکەرێکی هەبێ ئەی کێ خودای دروست کرد؟

مامۆستا عەبدولڕەحمان بەپێکەنینەوە: جا وانەکەمان دەبێتە بەرپەرچ دانەوەی بێباوەڕان گەر ئاوا بڕوا.

+ مەگەر تۆ سەرەتا نەتگوت هەر پرسیارێ بەهزرت داهات بیکە، دەی منیش ئەمەم بەهزردا هات، بۆ ئەوەی بەیانی پرسێکی ئاوام ئاڕاستەکرا بتوانم وەڵامێکم هەبێ.

- کوڕی خۆم، خودا بۆیە خودایە کە بەدیهێنەرەو بەدیهێنراو نییە، گەر ئەویش بەدیهێنراو بێ کەواتە نابێ خودابێ. ئەم پرسیارە خۆی لەخۆیدا هەڵەیە، چون دەستەواژەی بەدیهێنەرو بەدیهێنراوی تێکەڵ کردووە. زۆر نالۆژیکیە گەر پێت وابێ ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلێکی دروست کردووە خۆشی وەکو ئۆتۆمبێلەکە وایە، چون تۆ وەستاکەو شتە دروست کراوەکەت تێکەڵی یەک کردوون.

ئەگـەر وێنـای بکـەی کـە شـەمەندەفەرێک بەچەندیـن فارگۆنـەوە بەیەکـەوە بـەسراوە، فارگۆنـی دواوە بـەوەی پێشـەخۆی بـەسراوەو ئـەو ڕایدەکێشـێ، ئەویش بەفارگۆنێکـی تـری پێـش خۆیـەوە بـەسراوەو بەهـۆی ئـەوەوە دەجوڵـێ، ئەویـش بەیەکێکـی تـرەوە بـەسراوەو ڕایدەکێشـێ، تـا دەگەیتـە فارگـۆن و بەشـی یەکـەم، لەوێشـەوە بـۆ بزوێنەرەکـە، ئیـدی ئەمـە خاڵـی کۆتاییـە. ناتوانـی بڵێـی ئـەی چ شـتێک بزوێنەرەکـە ڕادەکێشـێ چونکـە ئـەو خـۆی بزوێنـەرە، ئیـدی ناشـتوانی بڵێـی چ شـتێک خـوای دروسـت کـرد، چونکـە ئـەو خـۆی خوایـە و دروسـتکەرەو لەپێـش ئـەوەوە چشـتێکی دیکـە نییـە.

دەتوانـی بڵێـی لەپێـش ژمـارە نـۆ، هەشـت هەیـە، لەپێـش ئەویـش حـەوت هەیـە تاکـو دەگەیتـە ژمـارە (یـەک)، ناکـرێ بڵێـی لەپێـش یـەک ژمـارە چەنـد هەیـە، چونکـە ئـەو خـۆی یەکـەو لەپێـش ئـەوەوە ژمارەیەکـی دیکـە نامێنـێ. ڕوونـە ئازیزەکـەم؟

+ بەڵێ قوربان زۆر ڕوونە، بفەرموو بەردەوامبە.

- بزانـە کـوڕی خـۆم، خـوای گـەورە دوورە لـەوەی لەپارچـە پارچـە پێـک هاتبێ و جیسـم و لاشـەی هەبـێ وەکـو ئێمـە. هەروەهـا دوورە لـەوەی لەجێگایەکدا نیشـتەجێ بـێ، چون ئـەو جـۆرە چشـتانە سـیفەتی بەدیهێنراوانـن و خـوای گـەورە دەوڵەمەنـدە و پێویسـتی بـەم چشـتانە نییـە. ئینشـاڵڵا لەکاتێکـی تـردا پـتر لـەم بابەتـە دەدوێیـن.

خـودای مـەزن خـۆی فەرموویەتـی کـە ئـەو هیـچ کەسـی لـێ نەبـووەو خۆشـی لەکـەس نەبـووە[١٢٣]. هەرچـی کەموکـوڕی هەیـە دوورە لەزاتـی خـودا.

پاشـان کـوڕی خـۆم، بزانـە کەئێمـە بیـر لەزاتـی خـوا ناکەینـەوە، چونکـە ئـاوەزی ئێمـە زۆر لـەوە بچووکـترە خودایەکـی واگـەورەو بەدەسـەڵات بناسـێ، وەکـو خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی: بیـر لەبەخشـشـەکانی خـوا بکەنـەوە، وەلـێ بیـر لەزاتـی خـوا مەکەنـەوە.

هـەر ئـەو حاکـم و دادوەری ڕاسـتەقینەیە، وەکـو فەرموویەتـی: خـودا کـەس ناکاتـە هاوبەشـی بڕیـارو دادڕەوی خـۆی[١٢٤].

وەلێ داخەکەم ئیمڕۆ گشتی دادوەر و بڕیاردەرە لەجێگای خودا.

---

١٢٣- سوورەتی ئیخلاس ، ئایەتی ٣.

١٢٤- سوورەتی کەهف ، ئایەتی ٢٦.



هەروەها خوداوەند بەخۆشەویستەکەی فەرمووە:.باسی ئەوە بکە خودا کاتی خۆی نەوەکانی ئادەمیزادی لەپشتی ئادەمی دەرهێناو کردنیە شاهێد لەسەر خۆیان و لێی پرسین ئایا من خودای ئێوە نییم؟ گوتیان بەڵێ ئێمە شاهێدی ئەم بەڵێنەین، نەوەکو ڕۆژی قیامەت بڵێن ئێمە بێ ئاگا بووین [١٢٥].

+ ببوورە قوربان لەمە نەگەیشتم، یانی چۆن دەری هێنان؟

- خودا ئەم بەڵێنەی لەمرۆڤ وەرگرت لەو کاتەی هێشتا لەپشتی باب ئادەم دابوون و لەڕۆژێکدا تەواوی مرۆڤایەتی لەپشتی ئەو دەرهێنان و پێی گوتن ئایا من خوای ئێوە نییم؟

گوتیان بەڵێ ئێمە شاهێدین، بەڵام بەداخەوە زۆرێک لەوان کەهاتنە دونیا پەیمانەکەیان جێبەجێ نەکرد و بێ باوەڕ بوون بەخودا.

+ باشە قوربان کەوایە بۆچی ئێمە ئەم پەیمانەمان بیر نییە؟

- ئەم پەیمانە لەلایەن ئەو کەسانەی دڵیان پاک کراوەتەوەو پیاوی خودان زانراوە، هەتا بازێ لەپیاوچاکان و پیاوە گەورەکان بیستراوە لێیان کە گوتویەتی من بیرم دێ ئەم پەیمانە چۆن بووە، وەلێ موسڵمانەکانی تر لەم پایەیەدا نیین کەئەمەیان بیرمابێ بەهۆی گوناهـ و بێ ئاگایی نەفسەوە.

بزانە کوڕەکەم، ئێمە شایەدی نادەین بۆ هیچ ئیماندارێک کەدەچێتە بەهەشت یاخۆ جەهەننەم، مەگەر خواو پەیامبەر شایەدیان بۆ دابن.

مەگەر نەتبیستووە کە خۆشەویستمان فەرموویەتی کردەوەی هیچ کەسێ نایباتە بەهەشت و لەئاگر نایپارێزێ، منیش هەر وام، تەنیا بە بەزەیی خوا نەبێ.

سیڕاج گیان، کردەوەکانی ئێمە لەوە کەمترن بمان بەنە بەهەشت مەگەر میهرەبانی خودای لەگەڵ بێ و بەسۆزو بەزەیی خۆی چاوپۆشیمان لێ بکا.

کەوایە تکای لێخۆشبوون بۆ ئیمانداران دەکەین و هەموو کاتێ لەخودا دەترسین.

پێشەوا (تەحاوی) دەفەرموێ: هەرکەس دڵنیابێ و باوەڕی وابێ کەخودا کەس سزا نادا، یاخود بێ ئومێد بێ و باوەڕی وابێ کەخودا ڕەحم بەکەس ناکا، ئەوا ئەم جۆرە دڵنیایی و بێ ئومێدیە مرۆڤ بێباوەڕ دەکەن.

---

١٢٥- سوورەتی ئەعراف، ئایەتی ١٧٢.



خودا خۆی  فەرموویەتی کەس بێ ئومێد نابێ لەڕەحمەتی خوا جگە لەکافرەکان[126].

هـەروا ئەوەشـی فەرمـووە کـە کـەس دڵنیـا نابـێ لەسـزای خـوا جگـە لەکەسـانێکی زەرەرمەنـد نەبـێ[127].

کەوابوو پێویستە موسڵمان لەنێوان دڵنیایی و بێ ئومێدیدا بژی.

ئینجـا کـوڕی خـۆم، مرۆڤـی بـاوەڕدار دەبـێ هەمـوو کات تەوبـە و کاری چـاک پیشـەی بـێ تاوەکـو لەگوناهـ پـاک بێتـەوە، چـون ئـەوە فەرمـوودەی خودایـە کـەوا چاکـەکان خراپـەکان لادەبـەن و دەیـان سـڕنەوە [128].

- ئەوەندە بەسبێ کوڕم؟

+ قوربـان هێنـدێ کاتمـان بەدەسـت مـاوە، چـون ئیمـڕۆ زووتـر هاتبـووم، باچشـتێکی دیـش بخوێنیـن.

- باشە بیخوێنەرەوە مادام هێندە تامەزرۆی.

+ ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار

گەلێ ناوی هەن خودای بێ مەکان    نـەوەد و نـۆیـان کـراون بـەیـان
نـاکرێ سەربەخۆ نـاوێ دابنێین    بـۆ خـودای گـەورە بەکـاری بنێین
بە سیفاتەوە جـا زاتی ئەحـــەد    ئەزەلیە و ئەبـــەد، بێ گومـان و شـەک
هەروەها سیفەت زاتی خـودا نیین    غەیری ویش نیینەو قەت لێی جودا نیین

+ بفەرموو مامۆستای ئازیزم.

- گیانەکـەی مـن سـیڕاج، ناوەکانـی خـوای پـەروەردگار گەرچـی گەلـێ زۆرن و لەژمـارە نایـەن، وەلـێ لەفەرمـوودەدا بـە نـەوەدو نـۆ نـاو هاتـوون، وەک خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی: خـوای گـەورە نـەوەدو نـۆ نـاوی هەیـە، هەرکـەس لەبەریـان کاو ڕەفتاری پـێ بـکا دەچێتـە بەهەشـت.

+ کەواتە تا زووە لەبەریان کەم چاکە قوربان.

---

١٢٦- سووڕەتی یوسف ، ئایەتی ٨٧.

١٢٧- سووڕەتی ئەعراف ، ئایەتی ٩٩.

١٢٨- سووڕەتی هوود ، ئایەتی ١١٤.



- بێگومـان لەبەرکردنیـان خـۆش و ساناشـە بـۆ کەسـێک خـودای خۆشـبوێ. ئینجـا بزانـە کـوڕی خـۆم، ناکـرێ ئێمـە بەگوێـرەی ئـاوەزی خۆمـان ناوێـک بـۆ خـودا دانێیـن و بـەکاری بێنیـن ، بەڵکـو دەبـێ لەڕێـی قوڕئـان و فەرموودەکانـەوە وەری گریـن.

ئینجـا سیڕاج گیان، ناو و سـیفەتەکانی خودا سـێ بەشـن، یەکەم: (ناوی زاتـی خودا)، کە بریتیـە لـە (ئەڵـڵا)، دووەم: (سـیفاتی زاتـی خـودا)، واتا ئـەو سـیفەتانەی خودا کـە مانای پەیاکردنـی هیچ شـتێکی لـێ وەرنەگیرێ، وەکـو: زیندوویی، توانین، بیسـتن.

ئەمانـە هەمـووی سیفەتی خـودان، چـون خـودا زینـدووە و توانایـەو دەبیسـتێ، وەلێ ئەم سـیفەتانە چشـتێکی دیکەیان لـێ پەیدا نابێ، بۆیە پێیـان دەگوترێ سـیفەتانی زاتی خودا.

سـێیەم (سـیفاتی کـردار): ئـەو سـیفەتانەی کردارییـن و مانـای پەیداکردنـی چشـتێکیان لـێ وەردەگیـرێ، وەکـو: دروسـتکردن، زینـدوو کـردن، ئەمانـە هـەردوو سـیفەتی خودان، لەگـەڵ ئەوەشـدا مانـای پەیداکردنـی چشـتێکیان لـێ وەردەگیـرێ کـە دروسـتکردن و زیندووکردنـەوەی بوونەوەرانـە.

جـا خـوای گـەورە بەهەمـوو سـیفاتەکانیەوە ئەزەلـی و ئەبەدیـە، وەکـو پێشـتر مانـای ئـەم دوو وشـەمان ڕوون کـردەوە، واتـا سیفاتەکانیشـی لەگـەڵ خۆیـدا هەرهەبـوون و هـەر دەشـمێنن.

بزانـە کـەوا سـیفاتەکانی خـوا بریتـی نییـن لـە خـودی خـوا، وە شـتێکیش نییـن جیابـن لەخـوا، چـون هەرگیـز ئـەم سـیفەتانە لەزاتـی خـوا جیـا نابنـەوە و زاتـی خوایـش لەمـان جیـا نابێتـەوە.

+ باشـە قوربـان چـۆن دەبـێ شـتێک خـودی شـتەکە نەبـێ و لەویـش جـودا نەبـێ، ئەمـە چۆنە ؟

- کـوڕی خـۆم ئـەم بابەتـە قسـەی زۆری لەسـەرە، ناکـرێ بڵێیـن ئـەم سـیفەتانە خـودی زاتـی خـوان، چـون هەرگیـز سـیفەت یـەک نییـە لەگـەڵ زاتـدا، سـیفەتەکان بەهـۆی ئـەوەوە ڕاوەسـتاون.

چـۆن شـتێک کەبـە جگـە لەخۆیـەوە ڕاوەسـتابێ یـەک دەبـێ لەگـەڵ شـتێک کەبـە خۆیـەوە ڕاوەسـتاوە. دواتـر گـەر بڵێیـن ئـەم سـیفەتانە خـودی زاتـی خـوان دەبـێ دروسـت بـێ بڵێیـن کەئەوانیـش دروسـتکەری خەڵکـن و پەرسـتراون.

کەوایە دەبێ بڵێین (عیلم) کە سیفەتی خوایە ئەویش وەکو خودا دروستکەرو پەرستراوە، ئەمەیش شتێکی پووچە.

هەروەها ناشکرێ بڵێین ئەم سیفەتانە جگە لە خودان، چون هەموویان بەخوداوە وەستاون و لەو جیا نابنەوە و سیفاتی ئەون.

ئەمە بابەتێکی درێژەو قسەی زۆر هەڵدەگرێ، تۆش هێشتا سەرەتاتە، ئینشاڵڵا ئەگەر کتێبی ترمان خوێند پتر دەڕۆینە نێو بابەتەکان.

ئینجا کوڕی ئازیزم، سیفەتەکانی ئەزەلی زاتی خوا حەوت دانەن، یەکەم: (حەیات) واتا زیندوویی، کەبە پێشەوای سیفەتەکان ناسراوە، دووەم: (عیلم) واتا زانین، وەلێ بزانە کە زانینی خودا وەکو زانینی ئێمە نییە، چون زانینی ئەو ئەزەلیە و هەر هەبووە، وەلێ ئێمە بە زانستەکەشمانەوە دروستکراوی ئەوین، سێیەم: (ئیرادە) واتا ویستن، یانی هەرچیەک خودا بیەوێ ببێ دەست بەجێ ڕوودەدا، چوارەم: (قودرەت) واتا توانین، چون خودا بەهەموو کارێ تواناو دەسەڵاتدارە، پێنجەم: (سەمع) واتا بیستن، شەشەم: (بەسەر) واتا بینین، چون هیچ چشتێ نییە خودا نەیبیستێ و نەیبینێ، حەوتەم: (کەلام) واتا گفتوگۆ، وەلێ گفتوگۆیەک بەبێ پیت و بێدەنگ کەوا چۆنیەتیەکەی نازانرێ.

+ باشە قوربان یانی گفتوگۆی خودا بەبێ پیت و دەنگە، ئەمە چۆن دەبێت، جێگای سەرسامیە؟

- هیچ چشتێ بۆ خودا جێگای سەرسامی نییە کوڕم ، ئەوەتا لەم سەردەمەی خۆمان دەژنەوین کەچەندین ئامێر هەن دەتوانن قسەو نووسراوەکان بگوازنەوە بەبێ ئەوەی پێویستیان بەدەربڕینی دەنگ و پیتەکان هەبێ. کەئامێرێکی دروستکراوی مرۆڤ وابێ ئیدی چۆن بۆ خودا جێگای سەرسوڕمانە؟ چون ئەگەر بڵێین گفتوگۆی خوا پیت و دەنگی لەگەڵە دەبێ بڵێین کە خودا ئەندامی دەرچوونی دەنگی هەیە کە (دەم)ە، ئەوەش بۆ خودا ناگونجێ چون خودا جیسم و لاشە نییە وەکو ئێمە، بەڵکو هیچ چشتێ لەخوا ناچێ. خودای گەورە دەسەڵاتدارە و دەتوانێ بێ پیت و بێ دەنگیش گوتەکانی خۆی بگەیەنێتە دڵ و هۆشی پەیامبەران و فریشتەکانی، بەڵکو ئەوە سیفەتەکانی ئێمەن پێویستیان بەلاشە هەیە، وەلێ سیفەتەکانی ئەو ئەزەلین و جیان لەهی دروستکراوان.

ئـەم حـەوت سـیفەتەی لێـی دوایـن سـیفەتی ئەزەلـی خـودی خـوان و هەرگیـز دژی ئەمانـە بـۆ خـوای گـەورە ناگونجـێ.

ئینجـا ئـەوەش بزانـە کە لەلای پێشـەوا ئەشـعەری هـەم پێشـەوا ماتوریدی سـیفەتەکانی ئەزەلـی زاتـی خـوا هەشـتن. پێشـەوا ئەشـعەری فەرموویەتی (بەقا) سـیفەتی هەشـتەمە، واتـا مانـەوە، چـون خـودا هەتاهەتایـی دەمێنێتـەوە، پێشـەوا ماتوریـدی دەفەرمـووێ (تەکویـن) سـیفەتی هەشـتەمە، بەواتـای دروسـتکردن و داهێنانـی چشـت. وەلـێ ئـەم حەوتـە پـتر بەربـڵاون لەنێـو خەڵکیـدا.

- با بەس بێ بۆ ئیمڕۆ سیڕاج گیان.

+ قوربان خەریک بوو خۆشم پێت بێژم، کاتی قوتابخانە هاتووە دەبێ بڕۆم.

- بفەرموو گیانەکەم، ئازادی لەڕۆیشتن، خودات لەگەڵبێ.

سـیڕاج وەڕێ کـەوت بـۆ قوتابخانـە، لـەوێ بەهەرکـەس دەگەیشـت پرسـیاری برینەکانی ڕوخسـاریان لـێ دەکـرد و وەڕەز ببـوو لـە وەڵامدانـەوە، بۆیـە هەڵسـاو لەسـەر تەختـە ڕەشـەکە نووسـی (گـەر لەبرینەکانـی سـیڕاج دەپرسـی ئـەوا بزانـە لەسـەر پایسـکیل بەربۆتـەوە).

ئـەم وانەیـە کیمیایـان هەبـوو، ئـەو دەمـەی مامۆسـتا وەژووری کـەوت و چـاوی کەوتـە سـەر تەختەکـە گوتـی: ئـەوە کام خێـر لەخـۆ نەدیـو لەسـەر پایسـکیل بەربۆتـەوەو تەختەکـەی پیـس کـردووە لێـمان؟

سیڕاج دەستی بەرزەوە کردو گوتی: منم قوربان.

- ئاوا، یانی ناشترسی؟

+ بەرامبەر زۆردارێک نەوەستاوم تا بترسم، بەڵکو بەرامبەر مامۆستاو مرۆیەکی قەڵەم بەدەست و ڕۆشەنبیرم، دواتر ئێوەش مرۆڤێکن وەکو من، دەی جا لەچی بترسم.

پۆلەکـە ژاوەژاوێکـی زۆری تێکـەوت بـەم گوتەیـەی سـیڕاج، خێـرا مامۆسـتا هەڵـی دایـێ و گوتـی: ئافەریـن کـوڕم، هەڵوێسـتەکەت بوێرانەبـوو، گەرچـی کارێکـی هەڵەیشـت کـردووە، وەلـێ خێـرا دانـت نـا کەتـۆی و نەتخسـتە سـەر کەسـێکی دی، لـێ بۆچـی ئەمـەت نووسـیوە؟

+ ویستم هەمـوو بزانـن کەبۆچـی ڕوخسـارم وایـەو چیـدی مانـدوو نەبـن بەپرسـیار کـردن و منیـش وەڵام نەدەمـەوە، چـون ئـەم بابەتانـە زۆر شـایەنی قسـە لەسـەرکردن نییـن و هیـچ زانسـتێکی پـێ وەدەسـت نایـە.

مامۆسـتا ویسـتی وەڵامـی داتـەوە، لەپڕێکـدا بەڕێوەبـەر خـۆی کـرد بـەژووردا و دوای سـڵاوکردن گوتـی: قوتابیانـی ئازیـز پێـم وابـێ بیرتـان مـاوە کەچەنـد ڕۆژێـک لەمەوبـەر گوتـم ڕۆژی چوارشـەممە لازمـە هەمـوو باوکتـان بێنـن لەگـەڵ خۆتـان و گردبوونەوەیـەک ئەنجـام دەدەیـن بـۆ پـتر ڕۆشـەنبیری بـاوکان و ئاگابوونیـان لەنمـرە و ئەنجامـی ڕۆڵەکانیـان. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش مامۆسـتا عەلـی جیهانگیرمـان بانـگ کـردووە کـە سـیمینارێک پێشـکەش دەکات تایبـەت بەڕۆڵـی بـاوکان لەخوێندنـی ڕۆڵەکانیـان و ڕەخسـاندنی ژینگەیەکـی لەبـار بۆیـان.

هـەروا چەنـد میوانێکـی بەڕێزیشـمان بانـگ کـردوون، وەلـێ پێـم خۆشـبوو یەکێـک لەقوتابیەکانمـان ئـەم بوێریـە بەخـۆی بـدا کـە چەنـد گوتەیەکـی جوانمـان پێشـکەش بـکا لـەم ڕۆژەدا، تاوەکـو هەموولایـەک لەجەختـی قوتابیانمـان ئاگابـن و هـەم ئێـوەش فێربـن لەگردبوونـەوەی ئـاوادا بێنەگـۆ، کـێ ئامادەیـە بـۆ بەیانـی؟

قوتابیـەکان هەمـوو سـەیری سەروسـەکوتی یەکدیـان دەکـرد و کـەس هیچـی نەدەگوت، لەپـڕ مامۆسـتای کیمیـا هاتەگـۆو گوتـی: مـن دەزانـم کێ لەبـارە بـۆ قسـەکردنی بەیانی. بەڕێوەبەر سەرێکی بۆ لەقاندو گوتی: کامیان؟

- سـیڕاج قوربـان، یەکێکـە لەقوتابیـە بوێرەکانمـان کەناترسـێ و زوبانێکـی پاراویشـی هەیـە بـۆ قسـەکردن، یـەڵا هەڵسـە سـیڕاج خـۆت نومایـان کـە [١٢٩].

بـەم گوتەیـە هەمـوو چـاوەکان کەوتنـە سـەر سـیڕاج و ئەویـش بـە نابەدڵـی هەڵسـایەوە و گوتـی: منـم قوربـان، هەرچەنـدە خۆیشـم ئامـادە نەکـردووە بـۆ کارێکـی وا، وەلـێ پشـت بەخـوا ئامـادە دەبیـن بـۆ بەیانـی و گوتـەی مامۆسـتام ناشـکێنم کەمنـی هەڵبـژارد.

دوابـەدوای وانـەکان سـیڕاج خـۆی کۆکـردەوە بـۆ گەڕانـەوە، زۆر دڕدۆنـگ [١٣٠] بـوو کەبڕیارێکـی وای داوە. کەوتبوویـە دڵەڕاوکێیەکـی سـەیر، چـون تـا ئێسـتا لەبـەردەم کۆمەڵـێ کـەس گوتـاری پێشـکەش نەکـردووە، ئینجـا بـاوکان و کەسـێکی دەرونزانـی

١٢٩- نومایان: دەرخستن.

١٣٠- دڕدۆنگ: دوودڵ.

نـاوداری وەکـو مامۆسـتا عەلـی جیهانگیـر و بەڕێوەبـەرو تـەواوی مامۆسـتایانی دی ئامادەبـن، ئەمـەش وای کردبـوو کەهێنـدێ لەقوتابیـان پێـی بێـژن، لەهیـچ و خـۆڕا خـۆت تووشـی سەرئێشـە کـرد.

لەبـەر خۆیـەوە دەیگـوت دەی دەی سـیڕاج، لەچـی دەترسـی، خـۆ تـۆ چەندیـن جـار لـەلادێ و لـەدەوری کانیەکـە بـۆ هاوڕێیـان دواوی و هۆنـراوەت بـۆ خوێندوونـەوە، دەی ئەمـەش هـەر چشـتێکی وایـە ئیـدی.

لـەو خەیاڵانـە دابوو کە ڕوانی وا لەسـەر ڕێگاکـەی کچ و کوڕێکی تـازە لاو دەمەقاڵیانە. سـیڕاج پـتر چوویـە پێـش و ورد بوویـەوە، وەلـێ چـی بینـی! سەراسـیمە بوو ئـەو دەمەی چـاوی بـە ئیلهـام کەوت، کچـی مامۆسـتاکەی لەگەڵ ئەم کـوڕەدا لێرە چـی دەکات!.

ویسـتی ڕێگـەی خـۆی بگـرێ و خـۆ لـەم باسـە نەگەیەنـێ، وەلـێ لەدڵیـدا دەیـان خەیـاڵ چـێ ببـوو، ئاخـر ئیلهامێکـی هێنـدە بەشـەرم و شـکۆ کـە مـن بەرامبـەری ئـارەق دەکەمـەوە چـۆن دەبـێ ئێسـتا لەگـەڵ ئـەم کەسـە نامۆیـە لێرەبـێ! دەی بابـە مـن چ کارم پـێ داوە، لەوەیـە خزمێکـی بـێ یاخـود هاوڕێیەکـی قوتابخانـەی بـێ و لەبابەتـی وانەکانـەوە بدوێـن. ئـاخ منیـش چەنـد گەمـژەم، ئاخـر وانە کـەی پێویسـتی بـە دەمەقاڵـی و هـاژە هـاژە، وا خەریکـە دەنگـی ئـەم لاوە دەژنـەوم، لـەوە دەچـێ شـەڕی پـێ بفرۆشـێ، بەڵـێ دڵنیـام شـەڕی پـێ دەفرۆشـێ، دەی بـا پـتر نزیـک کەومـەوە.

ئـەو دەمـەی پـتر چوویـە پێـش دەنگـی بەسـۆزی ئیلهامـی بیسـت کـە لەگـەڵ گریانـدا تێکـەڵ ببـوو، دیاربـوو کـە ئـەم لاوە سـەر ڕێگاکـەی لـێ گرتـووە و بەرۆکـی بەرنـادا.

ئیلهـام بەگریانـەوە دەیگـوت: ئەگـەر واز نەهێنـی باوکـم ئـاگادار دەکەمـەوە لێـت، مـن چیـم لـە خۆشەویسـتیەکی وەهـا ئارەزووبازانـە داوە لەکاتێکـدا زۆربـەی دەم جگـە لـە نـان و ئـاو چشـتێکی دیکەمـان لەماڵـێ دا نییـە، تـۆ کـە هێنـدە خـۆش گوزەرانـی چیـت لـە منێکـی دامـاو داوە.

لاوەکـەش دەیگـوت: ڕاسـتە مـن ئارەزووبـازی دەکـەم و پەیوەندیـم لەگـەڵ چەنـدان هـەن، وەلـێ تـۆم بەڕاسـتی دەوێ و لازمـە تـۆش خۆشـت بوێـم. پێویسـتیش نییـە باوکـە شـێتەکەت ئـاگاداری ئـەم باسـەبێ، گەرنـا بەرگەشـتەت[١٣١] دەکـەم. ئـەوەش بزانـە کەلەگـەڵ مـن پـارەت دەسـت دەکـەوێ پـارە، چ ئاقڵـێ ئەمـە لەکیـس خـۆی دەدا !

١٣١- بەرگەشتە: بەدبەخت.



سیڕاج کەئەمەی ژنەوت هۆشی لەسەر نەما، چۆن کەسێ مامۆستا دڵسۆزەکەی بەشێت ناوزەد دەکا و ڕێگا لە کچەکەی دەگرێ و شەڕی پێ دەفرۆشێ، بۆ مەگەر عیشق ڕێگا گرتنە! ئەمە هەرگیز هی بێدەنگ بوون نییە. هەرچەندە ئەو مرۆیەکی ڕق لەشەڕ بوو، وەلێ ئەم جارە بەرۆکی گرتبوو، ناچار بوو، بۆیە خێرا بەڕاکردن بۆ لاوەکە چوو تاکو هێزی هەبوو بۆکزێکی خێواندە بنا گوێی و سووڕاندی و دای بەزەویدا.

لاوەکە خوێن لەلووت و زاری فڕکەی کردو لەهۆش چوو. ئیلهام کەلەم دیمەنەی ڕوانی وەکو بەهێ زەرد هەڵگەڕا و تەواوی جەستەی دەلەرزی، بەگریانەوە هاتە گۆ: کاکە سیڕاج لەوەیە خۆت ئاگادار بووبی کەچۆن شەڕی پێم دەفرۆشت، چەندین جارە یەخەم دەگرێ و داوای خۆشەویستی و پەیوەندی نادروستم لێ دەکا. من چی لەکەسێکی وا بوودەڵە بکەم کە هەمیشە دێتە بەردەمی قوتابخانە و بەدوای کچانەوەیە، خۆت دەزانی من کچی کێم.

سیڕاج بەپەشۆکاویەوە: باشە باشە خاتوونەکەم، خێرا با لێرە بڕۆین تاکەس نەیدیوین و تووشی چشتێ نەهاتووین.

سیڕاج و ئیلهام بەتاڵووکە بۆی دەرچوون، کەتۆزێ دوور کەوتنەوە ڕوانیان واچەند کەسێ لەسەر لاوەکە گردبوونەتەوە و یەکێ لەوان بەدەست ئاماژە بۆلای ئەوان دەکا و خەریکن بەدوایان دابێن، بۆیە هەنگاوەکانیان خێراتر کردو ترسێکی زۆریان لێ نیشت.

سیڕاج یەکەم جاریەتی بەم شێوازە بەرەنگاری کەسێک ببێتەوە، جگە لەمەش بۆکزێکی خراپی خێواندوەتێ.

هەردوو بە پرزەی[132] سوارەوە خێرا دەڕۆیشتن، سیڕاج ناوە ناوە لای دەکردەوە بۆ دواوە و ترس سەراپای جەستەی داگرتبوو، چون ئەو چەند کەسە یەشتا بەدوایانەوە بوون.

بە پەشۆکاویەوە وازیان لەڕێگاکە هێنا و خۆیان بەنێو لێڕەوارەکە دادا[133]. لەو دەمەیدا مامۆستا عەبدولڕەحمان بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، لە نکاوێک بینی دووکەس بەخێرایی خۆیان بەنێو لێڕەوارەکەدا کێشا کە زۆر لەسیڕاج و ئیلهامی کچی دەچوون.

---

١٣٢- پرزە: هەناسە.

١٣٣- لێڕەوار: دارستان.

مامۆسـتا بـەم دیمەنـە تـەواو کەوتـە خەتـەرەو خەیاڵاتـەوە. ئاخـر ئـەو کچـەی خـۆی چـاک دەناسـی کـە چۆنـی گـۆش کـردووە و چ ئەدەبێکـی داداوە، هـەروا سـیڕاج متمانـە پێکراوترین قوتابییەتـی کەلەلایـەن شـێخی مەزنـەوە بـۆی نێـردراوە، تـۆ بڵێـی ئـەم دووانـە چشـتێکی نهێنیـان لەنێـوان هەبـێ و ئـەو نەیزانیبـێ؟!.

نـا نـا نابـێ ئـەوان بـن، دڵنیـام چاوەکانـم هەڵەیـان کـردووە، ئـاخ ماندوویەتـی مـرۆڤ چـی لێدەکـەی، لەوانەیـە دووبـارە تـام گرتبـێ بۆیـە ئـەم خەیاڵـە سـەیرانە بـە مێشـکمدا ڕادەبـوورن، دڵنیـام ئێسـتا ئیلهـام لەماڵێیـە.

چەنـد جـارێ شـەیتانی بەنەفـرەت کـردو لەدڵـی خۆیـدا دەیـان پۆزشـی دەهێنایـەوە، وەلـێ هـەم دیسـان چەندیـن خەیاڵـی دی دڵـی گـەورەی مامۆسـتایان دەتەنیـەوە.

سـیڕاج و ئیلهـام بـەردەوام بـوون لەڕۆیشـتن بەنێـو دارسـتانە چوغورەکـەدا،[134] کام لایـەی چڕتـر بووایـە ڕوویـان لـەوێ دەکـرد بەبـێ ئـەوەی بزانـن هەنـگاو بـەرەو کـوێ هەڵدەگـرن. ئاخـر لـە دەمـی ئـاوادا مـرۆڤ خەیاڵـی پەرتـە و تەنـێ بـەدوای خـۆ ڕزگارکردنەوەیـە و هیچـی دی.

لەوەیە ئەم گەنجە لەگەڵ بۆکزەکەدا مردبێ و تووشی بەڵایەکی نەخوازراو بێن، هەریەکەیان لەوە ناڕەحەت بوو کە ئەوی دیکەی تووشی چورتم و ناخۆشی کردووە.

ئیلهـام کـە نەیدەتوانـی بـاش بـڕوا چەنـد جارێـک لـەدواوە سـەرپەلۆکی دەبـرد[135] و دەکەوتـە نێـو دڕووان. تـاو ناتـاوێ ڕوودەنیشـت و دەسـتی بـە گریـان دەکـرد. لەپـڕدا دەنگـە دەنگـی چەنـد پیاوێـک لـەدواوە هـات کـە هێنـدەی دی تـرس و تۆقینـی پـتر کـردن و خێراتـر بـۆی دەرچـوون.

نەیان دەزانی کاژێر چەندە و چەند وەختە ئەو جەنگەڵە تەی دەکەن، هەر هێندەیان زانی گەیشتن بە زۆنگاوێکی درێژ کە پەڕینەوەی لێ ئەستەم بوو، وەلێ ڕەنگیان هاتەوە بەر ئەو دەمەی ڕوانیان پردێکی باریکی دارین بەسەریەوە چێ کرابوو بۆ ئەوبەر.

ئەگەرچـی پردەکـە تـەواو نارێـک و کـۆن بـوو، وەلـێ سـیڕاج خێـرا بەسـەریدا گـوزەری کـرد و لەوبـەر چاوەنـووڕی ئیلهـام بـوو.

---

١٣٤- چوغور: چەم و دۆڵی چڕ، جەنگەڵ.

١٣٥- سەرپەلۆکی دەبرد: دەکەوت و هەڵدەستایەوە.



کچـەی ژاکاو هێنـدەی دی جەسـتەی دەلـەرزی و ڕەنگـی ڕوخـی تـەواو پـەڕی بـوو، دەتگـوت نووکـە عیزرایـل دێتـە سـەردانی و ڕۆحـی هەلدەفڕێنـێ. تاوێـک وەسـتا و نەیدەوێـرا بەسـەر پردەکـەدا ڕابـووڕێ، هەسـتی دەکـرد تـەواوی دونیـا لەبـەر چـاوی دەچەرخـێ و خەریکـە بەردەبێتـەوە.

سـیڕاج لەوبـەرەوە بـە شـڵەژاوی بانگـی دەکـرد کـە پردەکـە مەترسـی نییـە و دەتوانـێ بەسـانایی بەسـەریدا تێپـەڕێ. ترسـی ئـەوەی هەبـوو پێیـان بگـەن و تووشـی بەڵایەکـی ناهەمـوار بێـن.

دوای چەنـد خولەکێ لەوەسـتان کچـە بەناچاری خۆی لەپـردی دارین داو بە لـەرزە لەرزو هێواشـی بەسـەریدا ڕێـی دەکـرد. هـەر هێنـدەی گەیشـتە کۆتایـی پردەکـە قاچـی لەسـەر تەختـە دارێکـی ڕزیـو دانـا و لەژێر پێیـدا قرچەی هـات. ئیلهـام لەگەڵ شـکانی تەختەکە هاوسـەنگی نەمـا و کەوتـە خـوارێ بۆ نێو قـوڕ و لیتـەی لێـواری زۆنگاوەکە.

بـە هەناسـە بڕکێـوە سـەری دەرێنـا و قـوڕو لیتەکـە تـا نێـو قـەدی هاتبـوو. هەنسـکە هەنسـکی هەناسـەی لەگـەڵ دەنگـی بولبولانـی دارستانەکە تێکەڵـی یەکـدی ببـوون و دەتگـوت بولبـولان گۆرانـی دەچـڕن و ئیلهامـی ژاکاو مۆسـیقایان بـۆ لێـدەدا.

سـیڕاج خێـرا لقـە دارێکـی درێـژی شـکاند و لەنێـو قـوڕو لیتەکـە ئیلهامـی پـێ دەرێنـا، ئەمـا هێنـدە ماندووبـوون کـە چیـدی توانـای ڕۆشـتنیان نەمابـوو.

هـەردوو لەوبـەری زۆنگاوەکـە لەنێـو چاڵێکـدا دوور لە یەکـدی ڕوونیشـتبوون و نقەیان لێـوە نەدەهـات. ئیلهـام تـا دەهـات لەرزینەکـەی پـتر دەبـوو، ئاخـر جگـە لەترسـەکەی تـەواوی گیانـی لەنێـو قـوڕاودا بـوو، وەکـو کەسـێکی سەراسـیمە پشـتی لـە سـیڕاج کردبـوو، فرمێسـکە گەرمەکانـی بەسـەر جەسـتەی ساردیدا دەهاتنـە خـوارێ.

وورده ورده تاریکایـی باڵـی دەکێشـا بەسـەر ناوچەکـەدا، جیکەجیکـی تەیـران و قـوڕە قـوڕی بۆقـەکان تێکەڵـی یەکـدی ببـوون. ئـەم دوو لاوە گـەر پێـش هاتنـی شـەو نەگەڕێنـەوە ئـەوا گەڕانـەوە لەشـەودا زۆر ئەسـتەمە.

سـیڕاج خەریـک بـوو لەخەمانـدا خـۆی دەخـواردەوە، هـەر جـارەی لـە ئیلهامـی دەڕوانـی حەجمانـی نەدەمـا، ئاخـر بۆچـی ئـەم کچـەم تووشـی ئـەو دەردی سـەریە کـرد، دەکـرا بەشـێوازێک لـە شـێوازەکان لاوەکـە بترسـێنم و دووری بخەمـەوە، یـان بـەم شـێوازە تونـدە لێـم نەدابـا، باشـە ئـەوە لێمـدا، خـۆ دەکـرا بەتەنیـا هاتبامـە نێـو لێڕەوارەکـە و ئـەو

بوودەڵانـەم دوای خـۆم خسـتبا و کچـەم ڕەوانـە کردبایـەوە، ئاخـر ئـەو بۆچـی وەدوای مـن کـەوت و نەچوویـەوە ماڵـێ.

باشـە چـی وەڵامـی مامۆسـتا بدەمـەوە؟ بڵێـم کچەکەتـم لەدەسـت بوودەڵەیـەک ڕزگار کـرد، بابـە نەخـۆت کـەو نـە ڕزگارکردنـت. ئـەدی ئێسـتا چـۆن لەگەڵـی بدوێـم و پێـی بێـژم بگەڕێینـەوە؟ ئاخـر ڕوخسـاری تۆقیـوی ئـەو بـەم هەمـوو فرمێسـکەوە دەمکـوژێ، هەڵـم دەواسـێ و لـەت و پەتـم دەکا. بەخـوا زۆری شـەرم لـێ دەکـەم، کچێکـی بـە حەیـا و حیشـمەت و شـکۆم ڕەگـەڵ خـۆم خسـتووە لـەم دارسـتانەدا بەبـێ ئـەوەی گـوێ بدەمـە هیـچ داب و نەریتێـک. ئاخـر بەیانـی خەڵـک چـی لەبـارەوە دەڵێـن؟ پێویسـتە هـەر ئێسـتا بگەڕێینـەوە، بەڵـێ گـەر بەمردنیـش بـێ دەبـێ بگەڕێینـەوە.

+ خاتوونەکەم، خەریکە شەومان بەسەر دادێ، گەر نەگەڕێینەوە دەبێ ئەمشەو لێرەبین.

سـیراج ئەمـەی گـوت و هیـچ وەڵامێکـی نەژنـەوت، دووبـارە هەوڵـی دایـەوە وەلـێ بێئەنجـام بـوو. زانـی ئیلهـام جارێکـی دی ناوێـرێ بەسـەر پردەکـەدا بـڕوا، وەلـێ خـۆ چارەیەکـی دیکـە نییـە و هـەر ئـەم ڕێگایـە دەیـان گەیەنێتـەوە ماڵـێ.

دەی بـاواز لەترسـی ئیلهامیـش بێنیـن و گریـان ئەویـش ڕۆیـی، ئایـا سـیڕاج چـۆن دەتوانـێ لەنێـو ئـەم دارسـتانە چـڕەدا ڕێـگای ماڵـەوە بزانـێ؟

سـیڕاج هەسـتی بـە برسـێتی و بـێ تینـی دەکـرد، گـەر لەبـەر ئیلهـام نەبوایـە هـەر زوو ڕێـگای گەڕانـەوەی دەگـرت، وەلـێ خـۆ ناکـرێ ئـەم کچـە لێـرەدا تەنیـا جـێ بێڵـێ. بیـری لـەوە دەکـردەوە کەمـن نانـی نیوەڕۆشـم خـواردوە هێنـدە بـێ تیـن بـووم، ئـەم کچـە دەبـێ لـە کەیـەوە نانـی نەخواردبـێ، هـەر خـوا دەزانـێ !.

بـەر لـەوەی تـەواو تاریـک بـێ هەنـدێ دارو پـووش و پەڵاشـی لـە نزیـک ئیلهـام کۆکـردەوە و بـە لەیـەک خشـاندنی بـەردان گـڕی لـە پووشـەکە بـەردا و ئاگرێکـی گـەورەی داگیرسـاند. خـۆی لـەدووری ئاگرەکـە ڕوونیشـت سـا بەڵکـو ئیلهـام تۆزێکـی گـەرم بێتـەوە. خەیاڵـی وەی دەکـرد کـە ئەگـەر تۆڕێکـم پـێ بووایـە ئێسـتا لـەم زۆنگاوە هەنـدێ ماسـیم دەگرتـن و لەسـەر ئـەم ئاگـرەدا دەمـان برژانـد، ئاخـر ئـەم کچـە دەمـرێ لـە برسـا. ئەگـەر شـتێکی لێبـێ مـن بـە چ ڕوویـەک بڕۆمـەوە، نـا هەرگیـز ناچمـەوە، لەشـوێنێک خـۆم ون دەکـەم کـە هیـچ مرۆیـەک نەمبینێتـەوە، ئـەی هـاوار مـن ئـەم خەیاڵانـەم لـە چییـە، بۆچـی ئـەم بەسـەزمانە لـە هیـچ و خـۆڕا دەمرێنـم.



چەندە خەیاڵ مێشکی سیڕاجیان داگرتبوو، دوو ئەوەندە هزری ئیلهامیان تەنی بوو کە ئەم لاوە بەهۆی منەوە لەم سەغڵەتی و تەنگیە دایە.

دوای ئەوەی دونیا تەواو تاریک بوو لەپڕدا هاواری کەسێکیان لەدوور ڕا هاتە گوێ. سیڕاج خێرا خۆی گەیاندە دەو زۆنگاوەکە و چەند جارێک لە هارژنی دا کە ئێمە لێرەین.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت قیڕو سیا خۆ گەر دوژمنیش بێ لەوە چاترە کە لێرە بمرین.

لەگەڵ هاوارەکەی سیڕاج دەنگە دەنگەکە نزیکتر بوویەوە، ئەو دەمەی تەواو هاتە پێش ڕوانی وا مامۆستا لەگەڵ دراوسێیەکی دا بە چرایەکەوە بەدوایاندا وێڵن، هێندەی نەبرد ڕوخساری مام سلێمان و سەلمانیش دەرکەوت لەپشتی چراکەوە.

لەگەڵ دەنگە دەنگەکە ئیلهامیش ڕووەو زۆنگەکە هەنگاوی ناو بە بینینی باوکی فرمێسکەکانی قەتاریان بەست. دیمەنێکی یەکجار شادومان و غەمناک بوو، مام سلێمان زۆر تووڕە و ماندوو دیاربوو، وەلێ مامۆستا بەهێمنی هات و کچەی لە ئامێز وەرێنا و پەڕاندیەوە.

سیڕاج کە باوکی هێندە تووڕە و توند بینی دەمی تەتەڵەی دەکرد و نەیدەزانی چیان پێ بێژێ، وەلێ مامۆستا خێرا مام سلێمانی سارد کردەوە و گوتی لازمە کە قسەکانیان بژنەوین بەر لەوەی هیچ بڕیارێکی هەڵەیان بەسەردا بدەین.

دوای ئەوەی سیڕاج بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە تەواو دەروونیان داسەکنا و بە شادومانی بەرەو ماڵ بوونەوە. لەڕێگادا مامۆستا گەلێکی سوپاسی سیڕاج کرد و گوتی کە لەمەودوا خۆم هاتووچۆ بە ئیلهام دەکەم و نایەڵم تووشی حاڵەتی وا بێتەوە، تۆش زۆر ئاگاداری خۆت بە کوڕم، نەبادا تووشی کێشەیەکت بکەن. بەچەشنێ تووڕەبوونی مام سلێمان دامرکابوویەوە کە لەگەڵ مامۆستادا دەمی لە ستایشی کوڕەکەی نابوو.

ئەو دەمەی مام سلێمان و کوڕەکانی گەیشتنەوە تازە دەمی نوێژی عیشا بوو، وەلێ دونیا لە لێرەوارەکەدا هەر زوو تاریک دەینوان.

سیڕاج کە پای خستە ژووریێ ڕوانی وا هەردوو ماڵە خوشکانی خاتوو سارا و سەوسەن بە خێزان و مناڵەوە لەوێن و تێکڕا چاوەنووڕی گەڕانەوەی ئەون. خێرا خۆی کرد بەباوەشی دایکی و خوشکەکانی دا و ئەسرین و خەندەیان تێکەڵی یەکدی کرد.

موددێکـی زۆربـوو خوشـکەکانی نەبینـی بـوو، چـون ئـەوان لەشـار دەژیـان و زۆر بەکەمـی سـەردانی ماڵـە باوانیـان دەکـردەوە، وەلـێ ئـەو ڕۆژە لەبەختـی سـیڕاجدا هـەردوو وێکـڕا هاتبوونـەوە.

خێزانـی خاتـوو سـارا، کاک ئـادەم دوکانێکـی بچووکـی شـیرینی هەبـوو لەشـار، کاک جەوهەریـش کەهاوسـەری خاتـوو سەوسـەن بـوو کاری پۆلیسـی دەکـرد.

سـیڕاج زۆر بەخێرهاتنـی لەهەردووکیـان کـردو یەکەیەکـە مناڵەکانـی ڕاموسـی[١٣٦] و لەئامێـزی وەرێنـان کـە هەریەکـە کۆڵـێ مناڵیـان هەبـوو.

تاکـو خاتـوو ڕەحمـە و کچـەکان نارەحـەت نەبـن مـام سـلێمان باسـی ڕووداوەکـەی نەکـرد و هـەر هێنـدەی گـوت کـە سـیڕاج ئیمـڕۆ بـە ڕێگایەکـی دیکـە هاتۆتـەوە و لەوێـدا گـوم بـووە، ئیـدی زوو بابەتەکـەی بڕانـدەوە.

خاتـوو ڕەحمـە لەگـەڵ کچەکانـی یـەک مەنجەڵـی زەبـەلاح تـرش و کفتەیـان چاخکردبـوو،[١٣٧] لـێ لـە چاوەنـوورِی سیڕاجدا نەیـان خواردبـوو. ئیـدی خـواردن تێکـرا و کاک ئادەمیـش بەکارتۆنـێ شـیرینیەوە دەگـەڕا بەسـەر دانیشـتواناندا. ئـەو شـەوە دەتگـوت جەژنێکـی بچووکـە لەماڵـی مـام سـلێمان.

لـەدوای نـان خـواردن ئیـدی بـوو بەمەجلیـس و هەڵدانـەوەی بـاس و خواسـی کـۆن و ئـەو موددەیـەی کـە یەکدیـان نەدیـوە، هەموویـان دەو شـەوەدا قەرەبـوو کـردەوە.

بـاس و خواسـی ژن هێنانـی سـەلمان کەوتـە ئـاراو خاتـوو ڕەحمـە دەیگـوت: بەخـوا کەسـێکم بـۆ دۆزیوەتـەوە هـەر خـۆم دەزانـم چ کابـان و خانەدانێکـە، لـەم ڕۆژانـە قـەرارە بچینـە پێـش لێیـان، گەلێکـم دەربـارەی پرسـیوە، باسـی ڕێـزداری و سـەنگینی بنەماڵەکەیـان هەرناکـرێ.

خاتـوو سـارا هاتـە دەنـگ و گوتـی: ئـەی بـۆ سـیڕاجی بـرا جوانەکـەی مـن قـەرار نییـە خاتوونـێ بدۆزنـەوە؟.

خاتـوو سەوسـەن هەڵـی دایـێ: بـێ خـەم بـن هـی سـیڕاج مـن دەسـت نیشـانی دەکـەم، ئـەو کەسـێکی خوێنـەوارە و دەبـێ کچـی شـاری بـۆ بێنیـن.

---

١٣٦- ڕامووسین: ماچکردن.

١٣٧- چاخکردن: سازکردنی شت.



سیڕاج وازی لەم باسانە نەبوو، بیری کەوتەوە کە نزیکەی کاژێرێکە بانگی عیشای داوە و لەوەیە ئێستا قوتابیەکانی لە مزگەوت چاوەنووڕی بن. ئەو دەمەی هەڵسا و ویستی بڕوا خێرا خاتوو سارا لێی هاتە دەنگ: بۆ کوێ برا؟ دەڵێی وازت لەم باسانەی ئێمە نییە، ناکا کەپڵ و مەپڵت گرتبن ئاوا بۆی دەردەچی؟ خۆت تازە هاتوویتەوە !.

ئیدی دانیشتنەکە بەم گوتەی خاتوو سارا بوویە قاقاو تریقانەوە،[١٣٨] خاتوو سەوسەنیش دەیگوت: برای من ئەم چشتانە نازانێ، وازی لێ بێنن داماوە بۆ وای لێدەکەن. ئەو هەر لەگەڵ خوێندن گەورە بووە، لەکوێ سەر لەعیشق و چشت دەردەکا، برا جوانەکەم پیاوێکی گەورەیە.

سیڕاج لەبەر خۆیدا گوتی (بەڵێ بەڕاستی سەر لەعیشق دەرناکەم)، خێرا دەرچوو بەرەو مزگەوت و دوای کردنی نوێژەکەی قوتابیەکانی کە هێندێکیان نەڕۆشتبوون بەزوویی لێی گردبونەوە. ئەو دەمەی تێی ڕوانین درکی بەوە کرد دانەیەکیان نوێیە، گوتی وادیارە تۆ تازەی کاکە، بێژە پێم ناوت چییە و پۆلی چەندی؟

- ناوم ئەحمەدە مامۆستا، پۆلی پێنجی سەرەتاییم.

سیڕاج سەری بەرزکردو جوان تێی ڕوانی، کوڕێکی قژ زەردی سپیکەلەی برۆ هیلالی چاو سەوز، کە تاڵەکانی قژی لا برۆیەکیان داپۆشیبوو، وەلێ نەهاتبوونە سەر چاوانی. وێدەچوو قژی درێژ بووبێ و تازە بڕابێ، ئەمما دیاربوو کە وەستایەکی کارامە نەیبڕیوە و لایەکی پتر درێژە. سیڕاج خەریک بوو لەنێو چاوی سەوزیدا خۆی ون بکا، وادیاربوو ئەمە یەکەم چاوسەوزە کە بینیبێتی لەدوای سەناریا. لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەی خودایە، چاوانی ئەم مناڵە چەندە لەچاوی سەناریا دەچن !

- چی بوو مامۆستا؟

+ هیچ نییە ئەحمەد گیان، چاوەڕێبە تا ئەم قوتابیانە دەخوێنن، تۆ لەدوای ئەوان بخوێنە، خۆ پەلەت نییە؟

- نا ئاساییە مامۆستا گیان.

+ تۆ پێشتر هیچت خوێندووە کاکە، یاخود لەسەرەتاوە دەست پێ دەکەی؟

---

١٣٨- تریقانەوە: پێکەنینی بەدەنگ.

- هێندێ لەسوورەتە کورتەکانم لای باوکم خوێناوە، وەلێ باوکم پتری نەدەزانی، منیش زۆر دڵگران بووم و قەرارم دابوو هەمووی بخوێنم. بەخوشکە نازک و دایە چنارم گوت ئەوانیش نەیان زانی و گوتیان خوێنەواریمان نییە، بۆیە لەهارژنی گریانێم داو پێم وابوو ئیدی ناتوانم ژینی جاویدانی[139] بەهەشتێ دەسخەم. دواتر فەرهەنگی هاوڕێم ئاگاداری کردم کەلای تۆ دەخوێنێ و منیش هاتم بۆ لات.

+ ئەی گیان، چەندە شیرینی، باشە خۆ دایە و بابەت ئاگادار کرد لەهاتنت بۆ ئێرە؟

- ئەی چۆن باسی تۆم لای داپیرە ڕەیحانیش کرد، ئەویش ماچی کردم و گوتی زۆرم پێ خۆشە کە ببیە قورئان خوێن و ڕۆژانە بەدەنگی عەبدولباست بۆمی وەخوێنی.

+ دەی کەوایە دەبێ زیرەک بی ها.

- بێگومان زیرەک دەبم، دەبینی کە لەبەریشی دەکەم.

+ ماشەڵا گیانەکەم، دەیبینین.

سیڕاج بەبینینی ئەحمەد هێندە کەیف خۆشبوو کەماندووبوونی لێرەوارەکەی لەیاد چوویەوە ، نەیدەزانی دڵخۆشیەکەی تەواو هۆکاری چییە، ئایا هی ئەوەیە کەئەم منداڵە چاوانی لەچاوی سەناریا دەچن؟ یاخود منداڵێکی زیرەک و ژیرە؟ یاخود هی ئەم قسە خۆشانەیەتی؟ ڕەنگە ئەمانە هەموو هۆکاربن، بۆیە تا ئەحمەد پتر بمێنێتەوە هەمیشە کۆتا منداڵ وەڕێی دەکرد.

لەو ڕۆژە بەدواوە سیڕاج جۆرە ئولفەت و خۆشەویستیەکی لەگەڵ ئەم منداڵە بۆ دروست ببوو.

زۆری حەز دەکرد کەتەواو گرنگی پێ بداو پێی بگەیەنێ، چون ئەم منداڵە تەواو جودا بوو لەگەڵ فێرخوازانی تری. هەمیشە باسی گرنگی کتێبی بۆ دەکردو هێندێ جاریش چیرۆکی منداڵانی پێ دەدا تا بیخوێنێتەوە.

لەپڕێکدا بیری کەوتەوە کە یەشتا دەربارەی کۆبوونەوەکە هیچی بەباوکی نەگوتووە، بۆیە دوای بەڕێ کردنی ئەحمەد خێرا بەرەو ماڵ بوویەوە و بەمام سلێمانی گوت کەدەبێ بەیانی بەهەر شێوەیەک بێ ئامادەبێ و ئەویش وتارێک پێشکەش دەکا.

---

١٣٩- جاویدانی: هەتا هەتایی.

- باشە کوڕم هەرچەندە لەگەڵ ئەم جۆرە چشتانە تەبا نیم، وەلێ لەبەر دڵی تۆ بەیانی ئامادە دەبم.

سیڕاج خێرا چوویە نێو کتێبەکانی و هێندێکی هەڵگرتن و لەگەڵ خۆیدا بۆ بانەکە بردنی. ئاخر دەبوایە بەم ماندوویەتیە بابەتێ بۆ بەیانی ئامادە بکا، لەگەڵ ئەوەشدا ماڵەوەیان پڕیەتی لەمناڵ و چشت، هەر دەڵێی هەفتیانەی بووکێیە.

هەرچۆنێ بوو بەخێرایی بابەتێکی لەسەر خوێندنەوە و گرنگی دان بەمناڵ ڕێکخست و هەر زوو لە هیلاکیان خەو بردیەوە. ئەو شەوە بۆ یەک دەقەش چاوە پڕ لەئەسرینەکانی ئیلهام بەرۆکیان بەرنەدەدا و هەر لە دەو زۆنگەکە خەریکی شین و شەپۆڕ بوون.

بۆ بەیانی بەر لەنیوەڕۆ خۆی کۆکردەوە و گوتیە باوکی کەلازمە تۆ کاژێر دووی دوای نیوەڕۆ لەوێ بی و خێرا بۆی دەرچوو تاکو گەییە بەر ماڵی مامۆستاو لەدەرگای دا.

- کێیە؟

+ قوتابیەکەتم قوربان، دەڵێی بیرت نەماوم؟.

- ئەها سیڕاج تۆی، ئەوا هاتم کوڕم.

مامۆستا خێرا دەرگای لێ کردەوە و دوای سڵاوو چاک و چۆنی پێی گوت با وانەکە بخوێنین.

+ ئیمڕۆ ساردتر دەتبینم لەڕۆژان قوربان، خێرە؟ خۆ نەساغ نییت؟

- نا کوڕم هیچم نییە شوکر بۆ خوا، بڕۆ بەرامبەرم و دەست پێ بکە.

+ ئاخر گەر نەساغیت کێشەم نابێ کە نەخوێنم، ئیمڕۆ بەو زەردەکەنیەی جارانەوە نەتم بینی.

- تەنێ تۆزێ بێ تاقەتم و چشتێکی وا نییە کە وانەکەی بۆ بچوێنین، دەی دەست پێ بکە سیڕاج گیان.

## + ویستن و حەزکردنی خوا

بزانە گشت شت بەویستی خوایە    چاک بێ یا خراپ وەکو یەک وایە
هەرچی حەزبکا دێتەجێ و دەبێ    هەرچی حەزنەکا و نەیهەوێ نـابێ

+ بفەرموو قوربان.

- بزانـە کـوڕم، هەمـوو چشـتێک بـە ویسـت و حەزکردنـی خوایـە، جا ئـەو چشـتە چـاک بـێ یـا خـراپ بـێ، هەرچـی خـودا حەزبـکا و بیـەوێ ببـێ دەبـێ و هەرچـی حەزنـەکا و نەیهـەوێ نابـێ. وەکـو دەفەرمـوێ: ئێـوە حـەز ناکـەن چشـتێک ببـێ یـا نەبـێ مەگـەر خـوای گـەورە حەزبـکا و ویسـتی لەسـەربێ[١٤٠].

+ کەوایـە مامۆسـتا گیـان ئێمـە تابەیانـی ویسـتمان لەسـەر چشـتێ بـێ، گـەر خـودا ویسـتی لەسـەر نەبـێ نایەتـە جـێ.
- بەڵێ بێ گومان.

+ کەوابـوو بۆچـی خـودا ویسـتی لەسـەر ئـەوە نەبـوو کەهەمـوو بـڕوادار بیـن، لەکاتێکـدا پێشـی خۆشـە؟.

- ئاخـر کـوڕی خـۆم، خـودا ڕێنمونـی هەمووانـی کـردووە و پەیامبـەران و کتێبـی بـۆ نـاردوون، وەلـێ تـۆ کەخـۆت نەتـەوێ ئیـمان بێنـی خودا بۆچـی بـەزۆر بیکاتە دڵـت؟ ئەو دوای ئـەوەی ڕێگاکـەی بـۆ ڕۆشـن کردوویتـەوە سەرپشـکی کـردووی کەڕێـگای ئیـمان و سـەربەرزی هەڵدەبژێـری یـان کوفـرو تاریکـی، ئەینـا دەیتوانـی هەمووومـان بـەزۆر ئیمانـدارکا، وەلـێ ڕێـزی لـێ نایـن بەسەرپشـک کـردن کـە فەرمـووی ئـەوەی حـەزدەکا بـا بـاوەڕ بێنـێ و ئـەوەی حـەزدەکا بـا بێبـاوەڕ بـێ[١٤١]. تـۆ گـەر ڕێـگای کوفرەکـەت گرتەبـەر خـوداش کوفـرو بـێ بـاوەڕی لەدڵتـدا دروسـت دەکا، بەپێچەوانـەوەش.

ئینجـا بزانـە، ویسـتنی خـوا دوو بەشـە، یەکـەم: ویسـتنی فەرمانـە شـەرعیەکان، کەپەیوەنـدی بەچاکـەو خراپـەوە هەیـە، واتـا خـوای گـەورە فەرمـان بەچاکـە دەکاو پێـی ڕازیـە، هـەروا فەرمـان بەخراپـە نـاکاو پێـی ڕازی نییـە، جـا چاکەکـە یـا خراپەکـە بکـرێ یـا نەکـرێ، چـون تـۆ سەرپشـکی کامیـان ئەنجـام دەدەی.

---

١٤٠- سوورەتی ئینسان ، ئایەتی ٣٠.

١٤١- سوورەتی کەهف ، ئایەتی ٢٩.



دووەم: ویستن و بڕیاری ئەزەلی، کەپەیوەندی بەهەموو بوونەوەرو ڕووداوێکەوە هەیە، واتا هەرچشتێ لەئەزەلدا خودا بڕیاری بوونی دابێ ئەوا دێتەجێ، وەهەر چشتێ بڕیاری نەبوونی دابێ ئەوا نایەتەجێ.

+ باشە قوربان لێرەدا چشتێکی تر دروست دەبێ، خودا خۆی فەرموویەتی من هەرکەسێکم بووێ ڕێنموونی دەکەم، ئەی کەسانێکی تاوانبارو بێ ئیمان لێرەدا چ تاوانێکیان هەیە کەخوا ڕێنموونی نەکردوون؟ ئەمە تەنێ دەمەوێ بۆم ڕوون بێتەوە.

- زۆرچاکە کوڕم، ئێمە دوو جۆر ڕێنموونیمان هەیە، ڕێنموونی ڕێ نیشان دان و ڕێنموونی یارمەتی دان. خودا ڕێنموونی یەکەمی کە ڕێ نیشان دانە بەهەموویان بەخشیوە، ئەوەتا قوڕئان و پەیامبەری بۆ هەموو مرۆڤایەتی ناردووە، وەلێ ڕێنموونی دووەم کە یارمەتی دانە، ئەمەی تەنیا بەو کەسانە بەخشیوە کە پەیامبەرو قوڕئانەکەیان بەڕاست داناوەو قەبووڵیان کردووە، ئیدی خوداش زیاتر کۆمەکی کردن بۆڕێی ڕێنموونی و سەرفرازی.

مەگەر نەتبینیوە خودا لەکتێبەکەیدا فەرموویەتی ئێمە گەلی سەموودمان ڕێنموونی کرد ، واتا ڕێگامان نیشان دان، وەلێ ئەوان کوێری و تاریکی کوفریان پێ خۆشتربوو، ئەویان هەڵبژارد [١٤٢]. کەواتە خودا ڕێگا نیشانی هەموویان دەدا، وەلێ ئەوە بەندەکانن هەڵی دەبژێرن بەکام ڕێدا دەڕۆن.

وێنای بکە کەسێک بیەوێ بچێتە شوێنێک و ڕێی لێ ون بووبێ، لەڕێگادا بگا بەکەسێک و ئەویش ڕێگای ڕاستی نیشان بدا، ئیدی کەزانی ئەو کەسە ڕێی نیشان داوە دەستی بەسوپاس کردنی کردو گوتی سوپاس بۆ خوا کەتۆم بینی و گەیشتمە تۆ، بەڕاستی تۆ کەسێکی باشی، تۆ نەبوویتایە سەرگەردان دەبووم.

ئەویش گوتی مادام تۆ وا جوانت سوپاس کردم و منت پێ باش بوو، ئەوا منیش لەگەڵت دێم تا دەتگەیەنم، چون لەڕێگادا چەند بەربەستێکت دێنە پێش و من شارەزایی چاکم هەیە.

سەیری ئەم نموونە بکە، یەکەمجار تەنیا ڕێی نیشاندا، وەلێ کەزانی کەسێکی وا باش و سوپاسکەربوو ئیدی کۆمەکیشی کرد . کەواتە ئەو ڕێنموونیەی بەمانا کۆمەکی و یارمەتی دانە تەنیا شایەنی ئەو کەسانەیە کە سوپاسگوزارن بۆ خودا.

---

١٤٢- سوورەتی فوسیلەت ، ئایەتی ١٧.

ئینجا بزانە، گەیاندنە ڕێی ڕاست و ڕێنموونی، بەمانا دروستکردنی ئیمان و کردنە ئیمانداری کەسێک، یانیش دروست کردنی کوفرو کردنە کافری کەسێک، گشتی تایبەت بەخوایە، کەس ناتوانێ ئیمان یان کوفر لەدڵی کەسێک دروست بکا، وەکو خودا بەخۆشەویستەکەی فەرمووە: تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت دەوێ بیکەیە ئیماندار، وەلێ هەرکەس خوا بیەوێ دەیکاتە ئیماندار،[143] واتا مادام ئەو خوداو قورئانەکەی قەبووڵ بێ، خوداش پتر کۆمەکی دەکا بۆ ئیمان و ئیمانی لەدڵدا دروست دەکا.

وەلێ شارەزاکردن بۆ ڕێی ڕاست یاخود گومڕاکردن و بردنە سەر ڕێی چەپ، خەڵکیش دەتوانن بیکەن، وەکو خودا بەخۆشەویستەکەی فەرمووە: تۆ بانگەوازی و شارەزایی خەڵک دەکەی بۆ ڕێگایەکی ڕاست [144]. هەروەها فەرموویەتی: فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕاکردو شارەزای ڕێی ڕاستی نەکردن[145].

ئەمەش واتا مرۆڤ دەتوانێ خەڵکی شارەزاکا بۆ ڕێی ڕاست یان ڕێی خراپ، وەلێ کەس ناتوانێ ئیمان یان کوفر لەدڵی کەسدا دروست بکا جگە لە خوا.

- ئێستا بابەتێکی تر بخوێنەرەوە.

+ **بینینی خودا**

| | |
|---|---|
| بینینی خـــودا لای ئەهلی سوننـە | ڕەوایـە لێرە و هەمیش لە جـەننە |
| بەڵام لەحـاڵی بێداری چ کـــەس | نەیبینیوە قـەت، زاتی فریـادڕەس |
| بێجگە(موحەممەد) بێ خەیاڵ و خەو | بینی بەچـاوی لەشەوی شەوڕەو |
| وەلێ لەقیامەت گـشت ئیمـانداران | وەک مانگی چواردە دەبینن یەزدان |

+ بفەرموو قوربان.

- سیراج گیان، بینینی خودا لای زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە کارێکی ڕەوایە، جا لەدونیابێ یاخود لەڕۆژی پەسڵان[146] و لەبەهەشت. وەلێ لەلای خەواریج و

---

١٤٣- سوورەتی قەسەس ، ئایەتی ٥٦.

١٤٤- سوورەتی شورا ، ئایەتی ٥٢.

١٤٥- سوورەتی تەها ، ئایەتی ٧٩.

١٤٦- پەسڵان: ڕۆژی دوایی.



موعتەزیلەو جەهمیە و هەندێ لەگروپەکان کە لەکاتی خۆی لێیان دەدوێین خودا هەرگیز بەچاوی سەر نابینرێ، لێ گوتەکەیان پووچەڵ دەبێتەوە بەفەرمایشتی خودا کە دەفەرموێ: چەند ڕوخسارێک لەڕۆژی پەسڵان سەیری خوای خۆیان دەکەن و دەیبینن[١٤٧].

ئەو کاتەی پەیامبەر موسا داوای بینینی خوای گەورەی کرد، خودا نەیفەرموو هەرگیز خۆمت نیشان نادەم، هەروا نەیفەرموو هەرگیز نابینرێم، بەڵکو فەرمووی تۆ نامبینی، واتا تۆ بەم بارودۆخ و نیشانەو شێوە ماددیەوە من نابینی، چون چاوێکی ماددی دونیایی لاواز ناتوانێ گەورەیی و نووری زاتی خودا ببینێ.

هەروەها کۆمەڵێک لەزانایان فەرموویانە دەکرێ خودا ببینرێ لەکاتی نوستوویی بەشێوەی خەو بینین، وەهەندێ لەزانایانیش بینیویانە لەخەودا، خوداش زاناترە.

وەلێ لەحاڵەتی بێداری ئەم خەڵاتە مەزنە بەس بۆ پەیامبەری ئێمە بوو، بۆ کەس دەست نادا. ئەو دەمەی لەشەوی میعراجدا لەسنووری ئەم دونیایە دەرچوو، خوای پەروەردگاری بەچاوی سەر بینی، کەلەکاتی خۆی باسی میعراجیش دەکەین ئینشاڵلا.

بەڵام لەڕۆژی دوایی هەموو ئیماندااران دەیبینن، وەکو خۆشەویستمان دەفەرموێ لەڕۆژی دوایی خودا دەبینن هەروەکو ئەم مانگە دەبینن، بەبێ پاڵەپەستەو ستەم کردن، چون لەهەموو لایەک دەیبینن.

وەلێ چۆنیەتی بینینی خودا نازانرێ و واچاکە کەوا لێی نەدوێین.

+ باشە قوربان ئێمە ئەوەمان زانی کەوا لەدونیا کەس خودا نابینێ مەگەر لەخەودا ئەویش بۆ کەسانی تایبەت، وە لەڕۆژی دواییش خۆی نیشانی موسڵمانان دەداو دەبینرێ. وەلێ بۆچی ناتوانین هەر لەدونیادا بەچاوی سەر تێی بڕوانین؟

- کوڕی خۆم وێنای بکە گەر خودا خۆی نیشانی هەمووان بدا ئەوا هەموو ناچار دەبن ئیمان بێنن و هیچ مانایەک بۆ تاقی کردنەوە نامێنێتەوە، چون ئێمە هەموو لەتاقی کردنەوە داین. ئایا گەر من وەڵامی تاقی کردنەوەکە لەسەر تەختەکە بنووسم، ئەی تاقی کردنەوەم لەچی؟ وەلێ گەر هێندێ سەرەداوم پێدان، دەتوانن بە عەقڵتان وەڵامەکە بدۆزنەوە. پاشان خوای گەورە لەم دونیایەدا چاوێکی ماددی کزی پێداوین کەناتوانین زۆرێک لەبوونەوەرو چشتەکانی دیشی پێ

١٤٧- سوورەتی قیامە، ئایەتی ٢٢، ٢٣.



ببینین. ئەوەتا دەیەها میکرۆب و ڤایرۆس هەن ناتوانین بەچاوانمان بیان بینین، ناتوانین ئەو هەوایە ببینین کەلە چواردەورماندا بوونی هەیە، ناتوانین وزەی کارەبا ببینین، ئێش و ئازارو نارەحەتی و دڵخۆشی و غەمباری ناتوانین بەچاو ببینین، هەستەکانمان، عەقڵمان، ڕۆحمان، هیچیان نابینرێن، خۆ کەسیش ناتوانێ نکوڵی لەهەبوونی ئەم چشتانە بکا و بڵێ بوونیان نییە.

دەی کەنەتوانین ئەم چشتە کەمانە ببینین کەهەمووی دروستکراون، چۆن دەتوانین بەم چاوە کزۆڵەی دونیا نوورو تەجەلای ئەم زاتە مەزن و بەدیهێنەرە ببینین.

وەلێ دەتوانین بەچاوی عەقڵمان هەستی پێ بکەین، وەک چۆن تامکردن بەچاوی سەر نابینرێ وەلێ بەچاوی زمان و چەشتن دەیبینین، وەک چۆن دەنگەکان بەچاو نابینین وەلێ بەچاوی گوێچکە دەیبیستین، خوداش بەچاوی سەر نابینین وەلێ بەچاوی عەقڵ دەیبینین، ڕوونە کورم؟

+ بەڵێ قوربان، زۆریش جوان بوو، بابەتێکی دی بخوێنمەوە؟

- بفەرموو.

+ **خودا لەجیسم و لاشە پێک نەهاتووە**

| | |
|---|---|
| خوای گەورە دوورە لەجیسم و لاشە | لاشە هەر لەبۆ مەخلووقات باشە |
| گەر هەر ئایەتێ بتخاتە شوبهە | بزانە کەوا موتەشابیهە |
| تەفویزی دەکەین بەوێنەی سەلەف | یاوەخۆ تەئویل بەمیسلی خەلەف |

+ بفەرموو مامۆستای ئازیز.

- بزانە کورم، خوای گەورە هەرگیز لەجیسم و لاشە پێک نەهاتووە، چون دروستکراوەکانی خودا جیسم و لاشەیان هەیە، وەباسی ئەوەشمان کرد کەخودا لەهیچ کام لەدروستکراوەکانی ناچێ، وەک دەفەرموێ: هیچ چشتێ هاووێنەی خودا نییە[١٤٨].

کەوابوو ئەوانەی ئەندامی جەستە بۆ خودا بڕیار دەدەن، ئاگایان نییە لەوەی خودایان بە دروستکراوان چواندووە.

+ باشە قوربان، ئەی ئەو ئایەتانەی باسی دەست و پێ و ئەندام دەکەن مانایان چییە؟

---

١٤٨- سوورەتی شورا، ئایەتی ١١.



- هەمیشە پەلە دەکەی لەپرسیارەکانت سیراج، کورەکەم هەر ئایەتێ یا فەرموودەیێ بتخاتە گومان لەوەی کەمانای جەستە و لاشە بدات، ئەوا پێی دەڵێن (موتەشابیهـ)، واتا: وێکچوو، وە مانای ئەو ئایەتە وێکچووانە ئاشکرا نییە بەئاشکراییەکی تەواو، وەکو سەرەتای هەندێ لە سورەتەکان ( ق ، الم ، حم)، یاخود ئەو ئایەتانەی باسی روخسارو چاو و دەست و پێ دەکەن بۆ خودا، یان هەر ئایەتێکی تر کەمانا ئاشکراکەی وا بگەیەنێ کەخودا جەستەی هەبێ، ئەوا زانایانی پێشین کەلە سەدەی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆچی ژیاون، دەفەرموون: ئێمە بەم ئایەتانەدا دەرۆین و چۆن هاتووە دەیخوێنینەوەو لێیان ناکۆڵینەوە، باوەڕیشمان وایە مانای ئاشکرای بۆ خودا بەکارنایێ.

کەوابوو زانایانی پێشین ئەو ئایەتانەی باسی جیسم و ئەندامن دەیدەنە پاڵ زانستی خوداو دەڵێن هەر ئەو مانای ڕاستەقینەی دەزانێ.

بەڵام زانایانی پاشین کەلەدوای سەدەی سێیەمەوە هاتوون، دەفەرموون ئێمە بەمانایەک لێکیان دەدەینەوە کەلەگەڵ خودا بگونجێ، جا بەهیچ شێوەیەک دروست نییە مانای ئاشکرای ئەم ئایەتانە بۆ زاتی خوا بەکاربێن.

کەواتە ئەو ئایەتانەی باسی سیفەتی (وەجهـ) دەکەن، واتا ڕوخسار، زۆرێک لەزانایانی پێشین و پاشین فەرموویانە مەبەست پێی خودی خوایە نەک ڕوخساری خوا. کەوابوو کە خودا فەرموویەتی ڕووی خودای تۆ دەمێنێ،[149] مەبەستی ئەوەیە کە خودی خوا دەمێنێ و لەناو ناچێ ، نەک مەبەستی ڕوخسار بێ، چون مانای نییە تۆ بڵێی ڕوخساری خوا دەمێنێ.

هەروەها سیفەتی (عەین) واتا چاو، لەقورئاندا بۆ خوا بەکارهاتووە. ئەمەش زانایانی پێشین دەیدەنە پاڵ زانستی خوا، وەلێ زانایانی پاشین دەفەرموون سیفەتێکی خوایە و مەبەست پێی پاراستن یاخود بینینی خوایە، نەک ئەو چاوەی ئێمە بیری لێ دەکەینەوە.

ئینجا لەهەندێک شوێنی قورئاندا باسی (یەد)کراوە، واتا دەست، وەلێ مەبەستی ئەو ئەندامە خوێن و گۆشتە نییە، وەکو لەشوێنێکدا خودا فەرموویەتی دەستی خوالەسەرەوەی دەستی ئەوانە [150].

---

١٤٩- سوورەتی ڕەحمان ، ئایەتی ٢٧.

١٥٠- سوورەتی فەتح ، ئایەتی ١٠.

زانایانـی پێشـین وەکـو گوتمـان لێـی نادوێـن و بـۆ زانسـتی خـودای دەگێڕنـەوە، بـەڵام پاشـینەکان دەفەرمـوون بەمانـای دەسـەڵاتە، یاخـود توانینـە، یـان پەیمانـی خوایـە، نـەک ئـەم دەسـتەی ئێمـە بیـری لـێ دەکەینـەوە.

کەواتـە گوتـەی ئـەو موجەسـیمانە ڕەد دەکەینـەوە کـە کۆمەڵێکـن دەڵێـن خـودا لاشـەی هەیـەو ئـەو ئایەتانـە دەکەنـە بەڵگـەو دەڵێـن مەبەسـت پێـی ئەندامـی ڕاسـتەقینەیە.

وە خودای گەورە باسی قاچیش دەکاو دەفەرموێ: لەو ڕۆژەی لوولە قاچ وەدەر دێخرێ[١٥١].

زانایـان لەمـەش دواون و فەرموویانـە مەبەسـت لەدەرخسـتنی قـاچ ئاشـکرابوونی تەنگانـەی قیامەتـە، یاخـود ئاشـکرابوونی نوورێکـی گەورەیـە.

ئینجـا بزانـە کـوڕم، هەمـوو ئایـەت و فەرمـوودە وێکچـووەکان، کەمانـا ئاشـکراکەی واتـای جیسـم و لاشـە بـدا بـۆ خـودا، بـەم شـێوەیە یـان وەکـو زانایانـی پێشـین دەڵێـین هـەر خـودا خـۆی دەزانـێ مەبەسـتی چییـە، یـان وەکـو پاشـینەکان لەمانایـەک بـەکاری دێنیـن کـە لەگـەڵ گەورەیـی خـودا بگونجـێ.

خـودای گـەورە بـۆ نزیـک خسـتنەوە لەعەقڵـی ئێمـە هەنـدێ دەسـتەواژە بەکاردێنـێ، خۆشـت دەزانـی هـەر وشـەیەک لەزوبانـی عەرەبـی ڕەنگـە بەچەندیـن مانابـێ، چـون زوبانێکـی فـراوان و پـڕ لـە ڕەوانبێژیـە.

جـا پێویسـتە موسـڵمان خـۆی هێنـدە خەریـک نـەکا بەمانـای ئـەو وێکچوانـە، بەڵکـو یەکێـک لـەم دوو ڕێگایـە بەکاربێنـێ کەگوتمـان، چـون خـودا فەرموویەتـی: ئـەو خوایە زاتێکـە کەقوڕئانـی بۆسـەر تـۆ نـاردە خـوارێ، بەشـێک لەئایەتەکانـی دامـەزراوو ڕوون و ئاشـکران، ئەمانـە بنچینـەو بناغـەی قوڕئانەکـەن، هێندێکـی تریشـی واتـای جۆراوجـۆر هەڵدەگـرن و بەئاسـانی نازانرێـن، جـا ئەوانـەی لەدڵیانـدا لاری و لادان هەیـە خۆیـان بـەو ئایەتـە وێکچووانـە خەریـک دەکـەن کەمانـای جۆربەجـۆرو فراوانیـان هەیـە، بـۆ ئـەوەی ئاشـوب و ناکۆکـی و دووبەرەکـی دروسـت بکـەن، یـان بـۆ ئـەوەی لێکدانـەوەی هەڵـەی بـۆ هەڵبەسـتن بەدڵـی خۆیـان[١٥٢].

جـا ئێمـە کـە ئەهلـی سـوننەین باوەڕمـان بەهەمـوو ئایەتەکانـی خـودا هەیـە بەبـێ جیـاوازی.

---

١٥١- سوورەتی قەڵەم ، ئایەتی ٤٢.

١٥٢- سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی ٧.



- بابەتێکی تریش بخوێنین یان بۆ ئیمڕۆ بەس بێ؟

+ پێم خۆشە ئەم بابەتەش بخوێنین، چون پەیوەندیشی هەیە لەگەڵ ئەمەی پێشەوە.

- باشە بیخوێنەرەوە، هێندە بەپەرۆشی بۆی.

## + خوای گەورە پێویستی بەشوێن و جێگا نییە

خــودا پێویستی بەهیچ شــوێن نییە    چــونکە شــوێن وەک ئەو ئـــەزەلی نییە
شەش لاکان خودا قەت لەخۆ ناگرن    پێش و پاش و سەر، ڕاست و چەپ و بن

+ بفەرمووو قوربان.

- بزانــە کــوڕی خــۆم، خــوای گــەورە پێویســتی بەهیــچ شــوێنێ نییــە کــەوا تێیــدا نیشــتەجێ بــێ چونکــە شــوێنەکان گشــتی دروســتکراوی خــوان، وەلــێ خــوای گــەورە ئەزەلیــەو هــەر هەبــووە پێــش ئــەوەی هیــچ شــوێنێک بوونــی هەبــێ.

پێشــەوا تەحــاوی لــەم بــارەوە دەفەرمــوێ: شــەش لایــەکان خــودا لەنێــو خۆیــان ناگــرن وەکــو چشــتە دروســتکراوەکان، کەبریتیــن لــە پێشــەوە و پشــتەوە و ڕاســتە و چەپــە و ســەرەوە و خــوارەوە.

ئایــا چۆن ڕەوایــە کەخودایــەک هەمــوو شــوێنێکی دروســت کردبــێ و ئــەو شــوێنەکانی کردبــن بەشــوێن، خۆیشــی پێویســتی بەوەبــێ لەشــوێنێکدا ڕووبنیشــێ؟!.

مەگــەر خــودا پێشــی شــوێنەکەش هــەر نەبــوو؟ ئیــدی کــە دروســتی کــرد چ پێویســتی بەشــوێن دەبــێ؟.

ئینجــا بزانــە کــوڕم، جەهمیــە کــەوا کۆمەڵێکــن دەڵێــن خــودا لەهەمــوو شــوێنێکە، وە بەڵگەکەیــان فەرموودەیەکــی خودایــە کــە فەرموویەتــی خــوای گــەورە لەگــەڵ ئێوەیــە لەهــەر کــوێ بــن [١٥٣]. هــەروا چەنــد ئایەتێکــی تریــان کردۆتــە بەڵگــەی خۆیــان.

جــا ئــەم گوتەیــەی ئــەوان چشــتێکی پووچەڵــە، چــون قســەکەیان وای لێــدێ کــەوا مــرۆڤ گــەر لەشــوێنێکی پیسیشــدابێ خــوای گــەورە لــەوێ بــێ، ئەمــەش لەگــەڵ گەورەیــی خــودا ناگونجــێ پاکــی و بێگــەردی بــۆ ئــەو.

---

١٥٣- سوورەتی حەدید ، ئایەتی ٤.

وە موجەسیمە کە کۆمەڵێکی ترن دەڵێن خوا لەسەر عەرشە و لەئاسمانە، ئایەتێک بەبەڵگە دێننەوە کە واتا ئاشکراکەی وا دەگەیەنێ کە خودا لەسەر عەرش جێگیر بووە لەئاسماندا [١٥٤].

خۆشەویستمان دەفەرموێ خوا لەئەزەلدا هەبوو جگە لەو هیچ چشتێکی دی نەبوو، ئینجا عەرشی خۆی لەسەر ئاو دروست کرد.

کەوابوو عەرش دروستکراوی خوایەو خودا پێش عەرشیش هەر هەبووە، ئایا گەر ئێستا لەسەر عەرش بێ بەگوتەی ئەوان، ئەی پێش عەرش لەکوێ بووە؟

+ کەوابوو مامۆستا، گەر لەئاسمان نەبێ و لەسەر عەرش نەبێ کەواتە لەکوێیە؟ بابەتەکە تۆزێ ناچێتە عەقڵمەوە.

- کوڕی خۆم، وەک چۆن خودا لەئەزەلدا پێش دروستکردنی ئاسمان و عەرش و هەموو شوێنەکان هەر هەبووەو پێویستی بەشوێن نەبووە، دەی پاش دروستکردنیانیش ئەم سیفەتە ئەزەلیەی خودا ناگۆڕێ و پێویستی بەشوێن نابێ. ئەوە ئێمەین لەجەستە و لاشە پێک هاتووین و شوێنێک داگیر دەکەین، ناکرێ هەمان بڕیار بەسەر خوادا بچەسپێنین، ئەی نەمان گوت خودا لەدروستکراوەکانی ناچێ، مەگەر بیرت چوو؟

+ بیرمە قوربان، وەلێ چۆن وەڵامی بەڵگەکانی ئەم دوو لایەنە دەدەیتەوە؟

- زانایانی ئەهلی سوننە فەرموویانە، ئەو ئایەت و فەرموودانەی جەهمیە کردوویانەتە بەڵگەی خۆیان و دەڵێن خوا لەهەموو شوێنێکە، دەبێ مانایان بە زانست لێک بدرێتەوە، واتا دەڵێین خوا لەگەڵتانە بەزانستی خۆی، یان بەسۆزو میهرەبانی خۆی، نەک بە خودی خۆی لەهەموو شوێنێ بێ، بەڵکو بەو مانایەی لەهەرکوێ بین بەزانستی خۆی لەگەڵمانە و ئاگادارمانە.

هەروەها ئەو ئایەتەی  کە موجەسیمەکان دەڵێن مانای وایە خوا لەسەر عەرش جێگیربوو، زانایانی پێشین لەبارەیەوە دەفەرموون چۆن هاتووە ئاوا دەیخوێنینەوە بەبێ چۆنیەتی و وێکچواندن و لەکارخستن، هەروا مانای ئاشکرای بەکار نایێ چونکە هیچ چشتێ وەکو خوا نییە.

---

١٥٤- سوورەتی تەها ، ئایەتی ٥.



وە هەنـدێ لەزانایانـی تـر دەفەرمـوون خـوا بـەرز بـوو لەسـەر عـەرش، مەبەسـت بـەرزی پلـەو پایـەی خوایـە، نـەوەک بـەرزی لاشـەو لەشـوێنێکدا جێگیربـوون، چـون جێگیربـوون لەشـوێن وەکـو گوتمـان بـۆ کەسـێکە لەئەنـدام و لاشـە پێـک هاتبـێ.

ئینجـا خـودا فەرموویەتـی لەسـەرەوەی فریشـتەکان لـەڕۆژی دوایـی هەشـت فریشـتە عەرشـی خـودا هەڵدەگـرن [١٥٥].

کەواتـە عـەرش وەک گوتمـان لەسـەر ئـاوەو هەڵگیـراوی هەشـت فریشـتەیە، جـا گـەر بڵێیـن خـوا لەسـەر عەرشـە دەبـێ بشـڵێین کەخـوا لەسـەر ئـاوە و هەڵگیـراوی هەشـت فریشـتەیە ! ئـەم گوتەیـەش بەتـاڵ و پووچـە پەنـا بەخـوا.

ئینجـا کـوڕم، هـەر ئایەتێکـی تـر یـان هـەر فەرموودەیـێ، مانـای ئاشـکرای وابـێ کەخوا لەهەمـوو شـوێنە یـان لەئاسـمانە یـان لەسـەر عەرشـە، ئـەوا بـەم شـێوەیە یـان دەڵێیـن هـەر خـودا مەبەسـتەکەی دەزانـێ، یـان لەمانایـەک بـەکاری دێنیـن لەگـەڵ گەورەیـی خـودا بگونجـێ، بـەم شـێوازەی کەزانایـان لێـی دواون نـەک بەهـەواو هەوەسـی خۆمان، لەمـەش پـتر دەم لـەم باسـە نادەیـن.

+ باشـە قوربـان یـەک پرسـیاری تـر، کەوایـە ئێمـە بۆچـی لەنزاکانمـان دەسـت بـەرەو ئاسـمان بـەرز دەکەیـن؟

- ئەمـە لەبـەر ئەوەیـە چـون ئاسـمان قیبلـەی دوعایـە، هـەروەک چـۆن لەنوێـژەکان ڕوومـان لەکەعبـە دەکەیـن، خـۆ مانـای ئـەوە نییـە خودالـەوێ بـێ.

+ تێگەیشـتم قوربـان، خـودا پاداشـتت بداتـەوە، گـەر مۆڵـەت بـدەن پێویسـتە مـن بـڕۆم، چـون کاتی هاتـووە.

- بفەرموو کوڕم، خوا ئاگادارت بێ.

سـیڕاج وەڕێ کـەوت بـۆ قوتابخانـە، تـاو نـا تـاوێ یـادی سـەناریای دەکـردەوە کەچەنـدە خـۆش دەبـوو ئەویـش لێـرە بـاو ئیمـڕۆ وتارەکەمـی ژنەوتبا. ئـای خوایـە چەنـدەم پـێ خـۆش بـوو ئێسـتا بیزانیایـە کـە هەمـوو قورئانـم تـەواو کـردووە و قوتابیـم هەنـە و دەرسـیان دەدەم.

خۆ گەر لێرەبا پێم دەگوت کە وانەی بیروباوەڕیش دەخوێنم و زۆر چشتی دیم پێدەگوت.

---

١٥٥- سوورەتی حاقە ، ئایەتی ١٧.

دەی کاتـی ئـەوە نییـە سـیڕاج، دەی وەئـاگا وەرەوە، ئیمـڕۆ دەبـێ جەختـی[156] و توانـات نیشـان بـدەی بەهەمـووان.

لەڕێگاکـەدا بەبـەردەم دوو کەسـدا ڕابورد، بیسـتی کـە یەکێکیان بەوی دیکـەی دەگوت ئـا ئەمـە ئـەو کوڕەیە کـە دوێنێ لەگـەڵ ئیلهـام دەرچووبوو. سـیڕاج کە تێـی ڕوانی زانی ئـەوە هەمـان ئەو دراوسـێیەی ماڵی مامۆسـتایە کە دوێنـێ بەدوایاندا وێڵ بـوو، لێ هیچی نەگـوت و خێـرا بۆی دەرچوو. ئـەوکات تێگەیی کە مامۆسـتا ئیمڕۆ بۆچـی هێندە وەڕەز و بـێ تاقـەت بـوو، هـەر دیارە لـەم جۆرە گوتانـە بەر گوێـی ئەویـش کەوتوون. لـەوە بێئاگا بـوو کـە ئـەم هەواڵـە لـە دوێنـێ شـەوەوە بـە چ چەشـنێ بـڵاوەی کـردوە و کەوتۆتە سـەر زاران. ئیلهامـی ژاکاو لـەو کاتـەوە لەژێـر جێـگا دایـە و تـاو لەرزێکـی تونـدی گرتـووە، وەلـێ مامۆسـتا نەیهێشـتووە ئەو هەسـتی پێ بکا.

سـیڕاج گەیشـتە قوتابخانـەو دوای خوێندنـی دوو وانـەی سـەرەتا، کاژێـر دوو گردبوونەوەکـە دەسـتی پێکـرد. گۆڕەپانـی قوتابخانەکـە تـەژی[157] بـوو لەباوکان. سـەرەتا بەڕێوەبـەر میوانەکانـی بەخێرهێنـان و دەسـتی کـرد بەچەنـد گوتەیـەک دەربـارەی قوتابیـان و قوتابخانەکـە ، دواتـر مامۆسـتا عەلـی جیهانگیـر وتارێکـی پێشـکەش کـرد دەربـارەی ڕۆڵـی بـاوکان و گرنگـی خوێنـدن، کەکاریگەریەکـی باشـی دروسـت کـرد لەسـەر ئامادەبـووان. پاشـان هـەر باوکێـک کارتێکی پێ درا سـەبارەت بە هەڵسـوکەوت و نمرەکانـی کوڕەکـەی. لەکۆتاییـدا بەڕێوەبـەر ئامـاژەی بـەوەدا کەنـەڕۆن و یەکێـک لەقوتابیەکانمـان بەنـاوی سـیڕاج سـلێمان، چەنـد پەیامێکـی قەشـەنگی بۆمـان هەیـە.

- بفەرموو سیڕاج گیان.

سـیڕاج بەبوێریـەوە هاتـە پێـش و ترسـەکەی لەناخیـدا بەپەنهانـی هێشـتبوویەوە. سـەیرێکی حەشـاماتەکەی کـردو باوکـی لەنێویانـدا بـەدی کـرد کەتێـی دەڕوانـی، ئەمـەش گڕوتینێکـی باشـی پـێ بەخشـی و دەسـتی پـێ کـرد:

+ بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان.

بەخێرهاتنـی گشـت لایەکتـان دەکـەم و خـۆم بەخۆشـحاڵ دەزانـم بەپێشـکەش کردنـی چەنـد گوتەیـەک هەڵبژێـردراوم. هەرچەنـدە خـۆم لـەو ئاسـتەدا نابینـم، وەلێ ئومێـدەوارم

---

١٥٦- جەختی: چالاکی و چاپووکی.

١٥٧- تەژی: پڕ.




بەگوێی دڵ بیژنەون و لەکەم و کوڕیەکانم ببەخشن.

ڕۆژگارێ بوو خەڵک لەجەهل و نەزانی بێزاربوو، نەزانین ئازاری دەدا، هەوڵی بەدەست هێنانی زانستی دەدا تا بەهۆیەوە بەرزو سەنگین بێ، ئەما ئیمڕۆ نەزانین پادشاییە و عیلم بووە بەکۆیلەی. گەر تا دوێنێ نەزانین دەیکوشتی ئیمڕۆ عیلم دەتکوژێ.

بەم چەند گوتەیەی سەرەتا ژاوەژاوێکی لەنێو مامۆستاکان چێکرد و هەر یەک لەوی دی دەڕوانی و دەیگوت ئەمە چی دەڵێ ! تۆ بڵێی ئاگاداری خۆی بێ؟

سیراج بەردەوام بوو: ئیمڕۆ بەچاوی ئاشکرا دەبینین کەچۆن زاناکان ڕێزیان لێ ناگیرێ، کەچۆن ئەوانەی شارەزان تووشی چورتم[158] و گرتن و تانەو تەشەر دەبنەوە، هەروەک بێکەس گوتی: من کە زانیم حاڵی دانا حەپسە، نەفیە ، یا شەقە هەر کتێبێکم هەبوو دوێنێ لەداخانا دڕیم وەلێ هەموو چاک بزانن گەر بمانەوێ نەوەیەکی ڕۆشەنبیر دروست کەین دەبێ دووبارە دەست بە زانستەوە بگرین، دەبێ مناڵەکان بکەینە هاوڕێی کتێب، دەبێ هەموو بەیەک دەستی بخوێنینەوە، ئایا پێم بێژن خوێندەواری چ سوودێکی هەیە گەر کتێبێ نەخوێنیتەوە؟ کەنەت خوێندەوە واتا نەخوێندەواری هەرچەندە بەرزترین بڕوانامەشت هەبێ.

باوکانی ئازیز، کوڕەکانتان، کچەکانتان، پێویستیان بەکتێبە بۆ فێربوون. ئەوان پێویستیان بەگوتەی خۆش و هاوڕێیەتی ئێوەیە، تکاتان لێ دەکەم گەر دەتانەوێ ملکەچی قسەکانتان بن خۆشەویستیان پێ ببەخشن. چی دەبێ گەر بە گیانەکەم و ڕۆڵەکەم و ناوی قەشەنگەوە بانگیان بکەن و بەخۆشەویستیەوە گۆشیان بکەن.

مەهێڵن بەکرداری پڕوپووچەوە خەریک بن، بەڵکو لەمناڵیەوە بیان کەن بەهاوڕێی کتێب گەر گەرەکتانە تووشی هاوڕێی خراپ نەیەن. چی تیایە گەر لەهەموو ماڵێکدا کتێبخانەیەکی بچووک بوونی هەبێ؟

فێریان کەن کەبۆنی گوڵەکان بکەن، لەڕەنگی سوورو زەردی گوڵان و سەوزی گەڵاکان چێژ ببینن. با پرزەکانیان بەفیڕۆ نەڕۆن و لەسەر پەڕی زەردو سپی کتێبەکان بنیشنەوە. دەمەو بوولێڵ[159] ئاوابوونی خۆریان نیشان بەن، با دووبارە چاوەنوڕی

١٥٨- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

١٥٩- بوولێڵ: کاتی ئێوارە کەدونیا لەنێوان ڕووناکی و تاریکی دایە.

گەڕانەوەیەکی دی بکەن، تاکو بزانن هیچ ڕۆیشتنێک مانای کۆتایی نییە.

لەکاتێکدا کەشەوی تاریک باڵ دەکێشێ بەسەر شارو لادێکاندا، بەدیمەنی شەوق بەخشی هەیڤ و ستێرەو ئاسمانی پڕ لەجوانیدا ئاشنایان بکەن، با چاوە بچکۆلانەکانیان بەم دیمەنانە ئۆقرە بگرن.

تکاتان لێ دەکەم گەر دەتانهەوێ ئەوان مرۆی گەورەبن بەچیرۆک و حەکایەتی پڕ پەندی پیاوە مەزنەکانەوە با شەوان خەو بیان باتەوە. بۆ بەیانی کەچاوانیان هەڵێنا بەجریوە جریوی پاساری و دەنگە خۆشەکەی کەناری و قاسپەقاسپی کەوو هەناسەی پڕ چێژی بەیانیان ئاشنایان بکەن.

خۆشەویستی تەواوی گیاندارو بێ گیانەکان بخەنە دڵیانەوە. ڕجاتان لێ دەکەم ئەوان پاکن و لەکرداری ئێوە دەڕوانن و ئەوە دووبارە دەکەنەوە کەلەئێوەی دەبینن، بۆیە جگە لەخۆشەویستی لەبەردەمی ئەواندا چشتێکی دیکە مەڵێن و کارێکی ناپەسەند ئەنجام مەدەن بەیانی ئەوان پێی هەڵبستنەوە.

ئێوە ئاوا ڕایان بێنن و گوێ مەدەن بەوەی کە مناڵی کەسانێکی دی جگە لەبۆنی ئەو چشتانەی سکیان تێر دەکا بۆنی دیکە بەلووتیاندا گوزەر ناکا. جگە لەڕەنگی ڕەشی ئەو تەکنەلۆجیایەی لەژێر دەستیانە ناتوانن لەڕەنگاو ڕەنگی سروشت ڕابمێنن. چاوەکانیان لەدیمەنی پەڕی زەردو وشە قەشەنگەکانی نێو کتێبان بێ بەشەو پرزەکانیان بەفیڕۆ دەڕۆن. ئەوان ناتوانن لەئاوابوونی خۆر بگەن، هەمیشە ئەو چشتە پووچانەی پێیەوە مژووڵن بێ بەشیان دەکا لەدیمەنی مانگ و سەرژمێرکردنی ستێرە ئاورینگ[١٦٠] دارەکان.

ئایا چی دەزانن دەربارەی خوێندنەوەی پەرتووکە ئاینیەکان و هۆنراوەو پەخشان و ڕۆمان و چیرۆک و تەواوی بابەتە جیاجیاکان؟ گوێچکەی مناڵەکانمان تەژی بووە لەدەنگی هەڵیت و پەڵیتی جنێو و گوتەی بێ ماناو ئەو چشتانەی کەناویان ناوە هونەر.

تکایە جوانیەکان ببینن و هەر ئەوانیش بەمناڵەکانتان نیشان بەن. هێمنیش گوتی:

جیلوەیی جوانی لەهەرچیدا هەبێ خۆشم دەوێ
زەردەپەڕ ، کاروان کوژە ، تاریک و ڕۆنی سوبحەدەم

١٦٠- ئاورینگ دار: بریسکەدار.



هەرکە سیڕاج تەواو بوو سەرپاکی مامۆستاو باوکان و قوتابیان چەپڵە ڕێزانیان کرد بەهۆی ئەم گوتە قەشەنگانەوە، تەنانەت مامۆستای جیهانگیر بانگی کردو موستیلەکەی لەپەنجەی خۆی دەرکردو لەپلی سیڕاجی خست و نێوچەوانی ماچ کرد.

بەڕێوەبەریش گفتی دیاریەکی پێ داو یەکە یەکە مامۆستاو قوتابیان دەست خۆشیان لەسیڕاج کرد، ئەویش سوپاسی هەموویانی کرد و دەستی باوکی ڕامووسی و لەگەڵیدا گەڕایەوە ماڵێ.

ماڵەکە تەواو چۆڵ ببوو بەچوونەوەی خوشکەکانی، بۆیە هەستی بە وەڕەزی کردو دووبارە ئەو نامەیەی دەرکردەوە کەبۆ سەناریای نووسیبوو. بیری لەوە دەکردەوە کەدەبێ کەی بتوانێ پێی بدا. لەلایەکی دیکەیش خەیاڵی بۆ ئەوە دەچوو کەئێستا من کەسێکی دیکەم، فێرخوازەکانم بەمامۆستا بانگم دەکەن، هاوڕێیان نازناوی مەولەویان پێداوم، جگە لەمەش سلوکێکی ئاینیم گرتۆتە بەر. چۆن دەبێ خۆم بەکەسێکی دیندار نومایان[١٦١] کەم و عیشقی کچێک لەدڵمابێ؟ تۆ بڵێی ئەم دوو چشتە دژی یەکتر نەبن؟ وەلێ خۆ تۆ دەزانی خودایە کەناتوانم دەستی لێ بەردەم. خوایە لێم خۆشبە گەر کارێکی هەڵەم کردبێ بەخۆشەویستی ئەو، بەڵام تۆ ئاگاداری کەئەمە لەدەسەڵاتی من بەدەرە. ئینجا خەمی ئیلهامیش لەلایەکی دیکە بوەستێ، دەترسم ئەم کچە بێ گوناهە ببێتە جێ تیری توانجی خەڵکی، خۆ من بەهەزار دەنگۆی ئاواش هەڵنالەرزم، وەلێ ئەو خودایە، من خەمی ئەومە. لەم خەیاڵانەدابوو کە لەدەرگا درا، خاتوو ڕەحمە دەرگاکەی کردەوە و گوتی: ئەمە تۆی سیروان.

+ ئەرێ وەڵا پوورێ گیان، هاتووم بەدوای مەولەویدا گەر بۆمی بانگ کەن.

- مەولەوی کێیە کوڕم، ئەم ناوە سەیرەت لەکوێ هێناوە؟

+ ئۆ دیارە ئاگادار نی کەسیڕاج ناوی بۆتە مەولەوی پوورێ؟

- ئای ئای لەئێوە گەنجینە، هەر لەمەمان کەم بوو.

خاتوو ڕەحمە بانگی کرد: کوڕم سیڕاج، سیروان تۆی گەرەکە.

سیڕاج خێرا بەرەو دەرگاکە چوو گوتی: بفەرموو سیروان گیان، وەرە ژوورێ.

---

١٦١- نومایان: دەرخستن.



- نا کاکە سیڕاج، ببوورە مەولەوی، ماوەیەکە نەمدیبووی، پێم خۆشە پیاسەیێ بکەین.

ئێستا ئەمیرو عوسمانیش دێنەدەر، ئیمڕۆ قەرارە ئەم چوارەمان بەرەو سەر کانی بڕۆین و جەوێ بگۆڕین.

+ خراپ نییە با بڕۆین، منیش لەماڵێ وەڕەز دەبم.

- پێم بێژە ئەو مامۆستایەت دۆزیەوە کەبەدوای دەگەڕای؟

+ بەڵێ زۆر سوپاسی تۆش دەکەم کەیارمەتی دەرم بووی.

- دەکرێ بزانم چ کارت پێی بوو؟

+ وازی لێبێنە با پیاسەی خۆمان بکەین بابە.

ئەو ڕۆژە هەر چواریان کۆبوونەوەو بەیەکەوە دەورو خولێکی گوندەکەیان داو بەرەو لای کانی گەورەی گوند وەڕێ کەوتن.

لەوێ عوسمان گوتی: دەی مەولەوی لەم دیمەنە لێوانلێو لەڕۆمانسیەدا بمان هەژێنە بەهۆنراوەکانت.

ئەمیر هەڵی دایێ: جا چۆنە کوڕینە لەمەودوا بەسیڕاجی مەولەوی بانگی بکەین، خۆ ناوێکی خۆشیشە ها.

سیڕاج گوتی: جەوتان خۆش دیارە هاوڕێیان، چۆنی بانگم دەکەن کێشەم نییە، سیڕاج یان مەولەوی یان سیڕاجی مەولەوی، کامەی هاتە سەر زار بیڵێن.

عوسمان هاتەوە دەنگ: دەی کاکە چاوەڕێی زاری تۆین چشتێ بڵێی.

سیڕاج دەستی پێ کرد:

سەد هێندەی ئەو ئاوە مەستەی دڵۆپ دڵۆپ کەوا سەما دەیڕژێنێ
سەد هێندەی ئەو گەڵایانەی ، لەئەزەلدا بادی سەبا دەیوەرێنێ
خۆشم دەوێی.

لەو دەمەیدا کەدوو دڵدار دەست لەدەستن،لەبەهاری خۆشی وشادی
نا وادیارە هەر لەڕۆژی قالو بەلا منی عاشق بەئازادی
خۆشم دەوێی.

لــەو کاتــەدا ســیڕاجی مەولــەوی ســەری بــەرزەوە کــرد، تــۆزێ لەولاتــر منداڵــێ ڕوونیشــتبوو کەپشــتی لــەوان بــوو، لەکەســێکی غەریــب نەدەچــوو، خێــرا وازی لەهۆنراوەکــە هێنــاو بــەرەو ڕووی چــوو.

+ ها ئەحمەد ئەوە تۆی، چی دەکەی لێرە برا؟ ئەوە بۆ دەگری کاکەی من؟!

ئەحمــەد بەچــاوی تــەڕی لەئەسریــن هەڵهــات و ئەوێــی جێهێشــت. مەولــەوی خەریــک بــوو دوای بکــەوێ، ئەمیــر لــەدواوە دەســتی گــرت و گوتــی: چــی دەکــەی بــرا، دەتــەوێ ســێ کــەس جێبێڵــی بــۆ منداڵێــک؟ ئــەم منداڵــە کێیــە مەولــەوی؟

+ ئــەوە ئەحمــەدە، یەکێکــە لــەو قوتابیانــەی کــەزۆرم خــۆش دەوێــن، نازانــم لێــرە چــی دەکــردو بــۆ دەگریــا، پێویســت بــوو کــە لەگەڵــی بدوێــم و بزانــم چیەتــی. ئەفســووس[١٦٢] ئەمــە لــەم تەمەنــە بزانــێ ئــازار و گریــان چییــە.

- جا ئەمە خەمی تۆیە؟

+ گــەر وانەبێژێــک خەمــی قوتابیەکانــی نەبــێ ئــەوا دەســت لەپرۆســەی فێرکــردن هەڵگــرێ چاتــرە.

- باشە گریان کێشەیەکی لەماڵەوە هەبوو، دەتوانی چی بۆ بکەی؟

+ چارەیــەک هــەر دەبــێ، هیــچ نەبــێ دەتوانیــن فێــری ئۆخــژن[١٦٣] گرتنــی بکەیــن کــە نەگری.

- تۆ بڵێی ئەویش سەناریایەکی نەبێ؟

+ قسەی قۆڕ مەکە ئەمیر، ئەو منداڵێکە و لەوەیە کێشەیەکی هەبێ لەماڵێ.

- بۆچی نا، خۆ ئێمەش ئەو کات منداڵ بووین کەلەسەر عیشق تێک هەڵغژاین[١٦٤].

+ وەلــێ ئێمــە جــودا بوویــن، هــەر زوو خۆمــان لەدەریــای خوێندنــەوەو ئەویــن دا. مــەرج نییــە هەمــوو منداڵــێ چەشــنی ئێمــە بــێ ئەمیــر.

سیروان و عوسمانیش هاتنە پێش و پرسیان کەچی لێرە ڕوودەدا.

---

١٦٢- ئەفسووس: بەداخەوە.

١٦٣- ئۆخژن: ئارام.

١٦٤- تێک هەڵغژان: شەڕکردن.

مەولەوی ئاماژەی کرد کەهیچ نییە و با بگەڕێینەوە شوێنەکەمان.

تـا دەمەوبوولێـڵ ئـەم چـوار هاوڕێیـە بەگوتـەی خـۆش و گێڕانـەوەی زەمەنـی منالّـی و هۆنـراوە و مەتـەڵ و چیـرۆک ڕایـان بوارد. وەلـێ مەولەوی لەتـەواوی کاتەکـەدا خەیاڵی هـەر لای ئەحمـەد بـوو. چـاوە سـەوزە قەشـەنگەکانی بەمژۆڵـە[١٦٥] تەڕەکانیـەوە وەک خەدەنگێـک[١٦٦] لەدڵـی مەولـەوی چەقـی بوون، کـە نەیدەتوانی بیرو هۆشـی لەسـەر لاببا.

بـۆ شـەو خێـرا خـۆی کۆکـردەوە و چـووە مزگـەوت، هـەر زوو چـاوی لەئەحمـەد گێـڕا و لەنێـو نوێـژ خوێنانـدا بـەدی کـرد. دوای تـەواو بوونـی نوێـژ قوتابیەکانـی دەورەیـان دا کـەڕۆژ بـەڕۆژ پـتر دەبـوون. ڕێـک دوای چـاک و چۆنـی چاوەکانـی خسـتنە سـەر ئەحمـەدو بەزەردەکەنیـەوە گوتـی:

+ خێر بوو دوێنێ لای کـانیەکە ڕوونیشتبووی بەتەنیـــــا؟

ئەحمەد سەری داخست و دووبارە لەهارژنی گریانێی دا.

+ چی بووە ئەحمەد گیان، تۆ بەم ڕەفتارەت ئازارم دەدەی ها، وەڵامم بەرەوە کاکە.

یەکـێ لەفێـر خـوازان گوتـی: مامۆسـتا مـن دەزانـم چییەتـی، چـون ئـەوان دراوسـێی ئێمـەن. باوکـی ئەحمـەد لەگـەڵ مامیـدا بووەتـە کێشـەیان لەسـەر باغـێ، مامـی پیاوێکـی خراپـەو شـەڕاب خۆریشـە و دەیهـەوێ بـەزۆر دەسـتی بەسـەردا بگـرێ. دوێنـێ بەچەکـەوە هاتبـوو، دونیایـەک هەڕەشـەی لەباوکـی ئەحمـەد کـرد، لەوکاتـەوە ئەحمـەد چاوەکانـی تـەڕن.

+ لاحەولە وەلا قوەتە ئیللا بیللا، سامانی دونیا چۆن مرۆڤەکان بە دڕندە دەکا!

کاشـکی[١٦٧] ئـەم چشـتانەم هـەر نەدەبیسـتن. ئەحمـەد گیـان خـەم مەخـۆ، ئینشـاڵڵا هەمـووی تێدەپـەڕێ و نێوانـی ئەوانیـش چـاک دەبـێ. لای خـودا هیـچ فەرامـۆش ناکـرێ، تـۆ تەنـێ پێویسـتە لەئێسـتادا گرنگـی بەخوێندنەکـەت بدەیـت و نەگـری. بیـرت نەچـێ ئێمـە هەمـوو بـراو کەسـی تۆیـن، دڵنیابـە گیانەکـەم مـن هێنـدەی برایەکـی بچووکـی خـۆم خۆشـم دەوێـی.

---

١٦٥- مژۆڵ: برژانگ.

١٦٦- خەدەنگ: تیر.

١٦٧- کاشکی: خۆزگە.



ئێستا وانەکەت بخوێنە و ئەسرینەکانت بسڕەوە کاکە، من برای تۆم، مەگەر پێت خۆش نییە من برات بم؟

ئەحمەد بەگریانەوە: بێ گومان مامۆستا زۆریشم پێ خۆشە وەلێ دەشترسم.

+ مەترسە کەسەکەم، تۆ لەلای منیت ئیدی لەچی دەترسی، دەی دەست پێ بکە.

ئەو ڕۆژە مەولەوی هێندە خەمبار بوو کەتنۆک تنۆک فرمێسک لەچاوانیدا ئۆقرەیان نەدەگرت، ئاخر ئەفسووس مناڵێکی وا ببێتە قوربانی ئەم کێشمە کێشمەی سەروەت و ماڵی دونیا. بۆچی دەبێ هەمیشە لە کێشەی گەورەکاندا مناڵان زەرەرمەند بن؟.

لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەوەتا چاو سەوزێکی دیکە گریاندمی، وەلێ ئەم جارە گریانی بەزەیی پیاهاتنەوەیە، خۆشەویستیشە بۆ نا، خۆ ئەو هێندەی برایەکی بچووکی خۆم ئازیزە لام.

سیراجی مەولەوی بۆ بەیانی زۆر درەنگ لەخەو هەڵسا، چون شەو سەناریا و ئیلهام و ئەحمەد یەخەیان بەرنەدەداو خەویان زڕاندبوو. بیری دەکردەوە کەدەبێ چیم پێ بکرێ بۆ ئەم مناڵە. لەلایەکی دیش خەیاڵی ئەوەی هەبوو دووبارە بڕواتەوە بەدوای ماڵی دولبەردا، وەلێ ئەم جارە دەبێ ناونیشانەکە بەباشی وەرگرێ و ڕێگای لێ ون نەبێ، لازمە پایسکیلەکەش چاک بکاتەوە.

دووبارە بەر لەنیوەڕۆ هاوڕێ لەگەڵ ئەم خەیاڵانەدا وەڕێ کەوتەوە بۆ قوتابخانە و سەرەتا وەکو هەموو جارێ بەرەو ماڵی مامۆستا هەنگاوی نا. لەم لاوەش دەنگۆی دەرچوونی ئیلهام لەگەڵ ئەم گەنجە شارەدێکەی تەنی بوو، بەچەشنێ ئەم زارو ئەو زاری دەکرد کە گومان لە دڵی گەورەی مامۆستاشدا چێ ببوو. ئەو ڕۆژە کە ئیلهام تۆزێ هاتبوویەوە سەرخۆی مامۆستا چوویە لای و گوتی:

+ کچی شیرینم، دەربارەی تۆ بازێ قسەی خراپم بیستووە، ئەگەر تۆ لەوانە بەریت ئەوا خودا پشت و پەناتە و پاکیت دەردەخا، وە ئەگەر خوانەخواستە کەوتوویتە نێو گوناهێکەوە تەوبە بکە و داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، چون هەر خودا تەوبە وەرگرە.[١٦٨]

---

١٦٨- ئاماژەیە بۆ ئەو بوختانەی بەحەزرەتی عائیشە کرا لەغەزای بەنی موستەلەق، دواتر خودا لەسوورەتی نوور پاکی ئەوی دەرخست.

ئیلهـام پێشـتر ئـەم دەنگۆیـەی لـە دەمـی ئیسـڕاوە بیسـتبوو، وەلـێ کـە ئـەم قسـانەی لەبابـی ژنـەوت جگـە لـە ڕژانـی فرمێسـک چـی دیکـەی بـۆ نەگوتـرا، هـەر دەتگـوت زوبانـی بـەسراوە و ناتوانـێ جارێکـی دی گـۆ بـکا.

سیڕاج گەیشتە بەردەم ماڵی مامۆستا و لەدەرگای دا. ئەم جارە ئیسڕا دەرگاکەی کردەوە.

- بفەرموو کاکە سیڕاج ئێستا باوکم دەگەڕێتەوە، چوو هەندێ ئاو هەڵێنجێ لە بیرەکە.

سـیڕاجی مەولـەوی بەشـەرمەوە چوویـە ژووریّ و سـەری خـۆی داگرتبـوو، ئـەو دەمـەی ڕوونیشـت خاتـوو خەدیجـە و ئیسـڕا بەخێریـان هێنـا و چوونـە ژوورەکـەی ئەودیـو کـە کچـەی ژاکاوی تێـدا کەوتبـوو. هێنـدەی نەبـرد مامۆسـتا هـاوڕێ لەگـەڵ دۆڵچـە ئاوێـک وەژووریّ کـەوت، نەیویسـت سـیڕاج هەسـت بـە ناڕەحەتیەکـەی بـکا و گوتـی:

- ئـای سـیڕاج هاتـی کـوڕم، بمبـوورە لـەوەی کەمـێ درەنـگ کەوتـم، ئیـدی ژیانیـش مانـدوو بوونـی گەرەکـە، ژن هێنـان ناڕەحەتیشـی تیایـە وەلـێ ئافرەتـی چـاک گەوهەرێکـە و لازمـە بـۆی بچیتـە ژێـری دەریـا. تـۆ هێشـتا خێزانـت پێـک نەهێنـاوە بۆیـە چـاک لـەم کارانـە نازانـی.

سـیڕاج بەپێکەنینـەوە: لێـی نازانـم وەلـێ دەتوانـم وێنـای بکـەم ئـەو ڕۆژەی مـن دوو دوو سـەتڵ هەڵدەگـرم.

مامۆسـتا بەزەردەکەنیـەوە[١٦٩] ڕوونیشـت و گوتـی یـەڵا بـا دەسـت پـێ بکەیـن و لـەوە زیاتر دوا نەکەوی، گەشتینە کوێ کوڕم، بیخوێنەرەوە بۆم.

سیڕاج دەستی پێ کرد:

+ **باسی کوفر**

| | |
|---|---|
| کـــافر کـــەسێکە باوەڕی نەبێ | بۆ ئەو یاسایەی لای خـــوداوە بێ |
| بە دڵ کـوفر کـا یاخـــۆ بە زوبان | یا کـــارێ بکـــا دەرچێ لە ئیمان |
| جگە لە کـــــوفر، بەهەر تاوانێ | کـــەس نابێ موئمین بەکـــافر دانێ |

+ بفەرموو قوربان.

---

١٦٩- زەردەکەنی: زەردەخەنە.



- سیراج گیان، کافر کەسێکە کەوا باوەڕی نەبێ بەو یاسایانەی لای خوداوە دەرچوون، جا بەدڵ نیازی کوفری هەبێ یاخود بەزوبان دەری ببڕێ، یان کاروکردەوەیەک بکا کەوا پێی دەرچێ لەدین. کەوابوو هەرکەسێ باوەڕی بە هەر بەشێکی ئەم دینە نەبێ ئەوا بەموسڵمان دانانرێ.

ئینجا کوڕی خۆم، مرۆڤی موسڵمان بەکردنی گوناه نابێتە کافر، هەرچەند لەگوناهە گەورەکانیش بێ. وەلێ هەر کەسێ بەدڵ نیازی کافربوونی هەبێ ئەوا دەست بەجێ کافر دەبێ.

+ بەڵام زۆر جار قوربان وەسوەسەو خەیاڵی خراپمان دێتە دڵ بەرامبەر خودا یان پەیامبەری خودا، ئایا زیانی هەیە بۆمان؟

- بێگومان هەموو مرۆڤێ تووشی وەسوەسە و خەیاڵی خراپ دەبێ، بەمە کەس لەدین دەرناچێ، بەڵکو واباشە زوو لەخەیاڵتی لاببەی بەیادی خودا و پەناگرتن بەو لەشەیتانی نەفرین لێکراو. وەلێ ئێمە دەڵێین ئەگەر بەدڵ نیازی ئەوەت هەبوو کەکافر ببی، نەوەک وەسوەسەت بۆ دروست بێ، چون بێگومان ئەم وەسوەسەیە تۆ پێت ناخۆشە کەدروست بووە.

یان ئەگەر کەسێک حەڵاڵێک حەرام بکا یاخود حەرامێک حەڵاڵ بکا ئەوا پێی کافر دەبێ، یاخود مرۆڤی سەرخۆش ئەگەر کوفری بەدەمدا بێ، پێی لەدین دەردەچێ هەرچەندە عەقڵیشی لای خۆی نییە، چون بۆخۆی وای کردووە کەسەرخۆش بێ.

ئینجا بزانە کوڕم، چوار جۆرە کوفر هەیە، یەکەم: دان نەهێنان بەهەبوونی خودا، واتا کەسێک بڵێ خوا بوونی نییە، وەکو کوفری فیرعەون، هەروەک خوای گەورە دەربارەی فەرموویەتی: فیرعەون وتی ئەی خەڵکینە نەم زانیوە جگە لەمن هیچ خوایەکتان هەبێ[١٧٠].

دووەم: ڕقەکاری، وەکو کوفری ئیبلیس کەباوەڕی بەخودا هەبوو وەلێ بەیاسای خوا ڕازی نەبوو، هەروەک خودا دەربارەی فەرموویەتی: شەیتان گوتی ئایا کڕنووش بۆ کەسێ ببەم کەلە قوڕت دروست کردووە[١٧١].

---

١٧٠- سوورەتی قەسەس ، ئایەتی ٣٨.

١٧١- سوورەتی ئیسرا ، ئایەتی ٦١.

ئەمەش لەبەر خۆ بەگەورە زانینی بوو کەڕەخنەی لەخودا گرت و پاشانیش سووڕ بوو لەسەر گوتەکەی و نەگەڕایەوە، هەر بۆیە خودا بەنەفرەتی کرد.

سێیەم: هاوبەش دانان بۆ خوا، کەسێ دان بەخوا بنێ و بزانێ بوونی هەیە وەلێ هاوبەشی بۆ دابنێ و چشتێکی تر بپەرستێ لەگەڵ پەرستنی ئەودا، وەکو هەموو ئەو کەسانەی پێیان وایە چشتانێکی دیکەش هەن وەکو خودا دەسەڵاتیان هەیەو زیان و سوودیان پێ دەگەیەنن.

چوارەم: دووڕوویی، ئەوەیە بەزوبان شایەدی بدا بەهەبوونی خوا، وەلێ بەدڵ درۆ بکاو باوەڕی نەبێ. خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: کاتێ دەگەیشتنە باوەڕداران دەیان گوت ئێمە باوەڕدارین، وەلێ کاتێ دەچوونەوە لای دۆستە شەیتانەکانیان دەیان گوت ئێمە لەگەڵ ئێوەین و گاڵتەمان بەوان کرد [١٧٢].

- بابەتێکی تر بخوێنەرەوە سیڕاج گیان.

+ بەسەرچاو قوربان.

### خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە

لە پێناو خودا چی موسوڵمانە  خۆشت بوێ و هەم بەدۆست بیزانە

ڕقت لەکافر هەم دوژمنی دین  هەرچەندە خزم و کەست بن لەژین

+ بفەرموو قوربان.

- بزانە سیڕاج گیان، مرۆی موسڵمان پێویستە خواو پەیامبەرو هەموو موسڵمانانی خۆش بوێ لەپێناوی خوادا و باوەڕداران بەدۆستی خۆی بزانێ.

خۆشەویستمان فەرموویەتی: بەڕاستی خودا لەڕۆژی قیامەت دەفەرموێ کوان ئەوانەی یەکتریان خۆشدەوێ لەبەر گەورەیی و شکۆمەندی من، ئیمڕۆ لەژێر سێبەری خۆم دەیان حەوێنمەوە کەلەم ڕۆژەدا هیچ سێبەری دیکە نییە.

کەواتە پێویستە هەموو یەکتریمان خۆشبوێ و ڕق لەدڵ و دەرونمان هەڵنەگرین بەرامبەر هیچ باوەڕدارێ. وە لەبەر هیچ هۆکارێ ئەم خۆشەویستیە بنیات نەنێین بەڵکو لەبەر خودی خۆی کەسەکەمان خۆشبوێ و لەپێناوی خودادا بێ، کەئەمە

---

١٧٢- سوورەتی بەقەڕە، ئایەتی ١٤.



بەرزترین پلەی خۆشەویستیە.

وە ئەوەی کەسێکی بەتوندی خۆشبوێ وای لێدێ کەهەر چشتێک پەیوەندی بەو کەسەوە هەبێ ئەوانیشی خۆشبوێ، هەروەکو ژیانی عاشقەکان شایەدی ئەم ڕاستیەن.

+ باشە قوربان ئەی گەر کەسێ ڕەگەزی بەرامبەری خۆشبوێ، نەک لەبەر ئەوەی باوەڕدارە، بەڵکو مەبەستم عیشقی نێوان کچ و کوڕە، ئەمە چۆن دەبینی؟

مامۆستا بەپێکەنینەوە: خۆ تۆش لەوانە نییت سیڕاج؟

+ قوربان من پرسیارم کرد تا شارەزابیم لەبڕیارەکەی.

- هەرچەندە ئەوە پەیوەندی بەباسی ئێمە نییە، وەلێ هیچ کەسێ لەسەر ئەم خۆشەویستیە لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێ، چون ئەمە کارێکە لەسەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤە. لێ ئەوانەی ئیمڕۆ بانگەشەی عیشق و خۆشەویستی دەکەن لەگەڵ کاری قەدەغە و نادروستدا تێکەڵی دەکەن و هەوڵ دەدەن لەڕێگای خودی ڕەگەزی بەرامبەرەوە بڕۆنە پێش و نامە گۆڕکێ و یەکتر بینینی نادروست ڕوودەدا، کە ئەگەر لەدەرگاوە بۆی بڕۆن ئەوا کارێکی زەم کراو نییە، حاڵیت وانییە؟

+ بەڵێ قوربان ڕوونە چی دەبێژی.

- ئینجا لەبەرامبەر دۆستایەتیدا چەمکی ڕق یان دوژمنایەتیمان هەیە، کەئەمەش دەبێ لەپێناو خوابێ، نەک لەبەر ئارەزووی خۆت ڕقت لەکەسێ بێ. کەواتە پێویستە لەبەر خوا ڕقت لەمرۆی بێ بڕواو دوژمنی دین بێ لەبەر کوفرەکەی، هەرچەندە خزم و کەس و کارت بن لەژیاندا، وە پێشت خۆشبێ کەڕۆژێ واز لەم بێ بڕواییە بێنن و بگەڕێنەوە. گەر بتوانی نزای ڕێنموونیشیان بۆ بکەی، چون تۆ وەکو مرۆڤێک خۆشت دەوێن کە دروستکراوی خوان ، وەلێ ڕقت لەکوفرەکەیانە. خودای گەورە دەفەرموێ: دۆستی ئێوە خواو پەیامبەرو باوەڕدارانن، ئەو باوەڕدارانەی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و ملکەچن [١٧٣].

کەواتە بێجگە لەو سێ تاقمە تۆ دۆستێکی دیکەت نییە، وەک چۆن کەسانێکت خۆش دەوێ چونکە فرمانی خودایان بەجێ هێناوە، بەهەمان شێوە ڕقت لەکەسانێکە سەرپێچی خودا دەکەن و دژایەتی دین دەکەن، چون بێ گوێیی مەعشوقەکەتیان کردووە.

---

١٧٣- سوورەتی مائیدە ، ئایەتی ٥٥.

+ بەڵام قوربان کێشەکە لەوەدایە کە یەکێک بەندایەتی خودا دەکات، وەلێ لەهەمان کاتیش تاوان و سەرپێچی ئەنجام دەدا، ئایا ئێمە خۆشمان بوێ یان ڕقمان لێی بێ، گەر هەردووکی پێکەوە کۆکەینەوە، نابن بەدوو شتی دژ؟

- نەخێر کوڕم نابێتە دژ، چونکە لەمرۆڤێکدا چەندین خەسڵەت و ڕەفتاری جۆراوجۆر هەن، دەکرێ هەندێکیانت خۆشبوێ و ڕقت لە هەندێکیان بێ. بۆ نموونە: ئەگەر کەسێک هاوسەرێکی جوانی ڕەوشت خراپی هەبێ، لەلایەک خۆشی دەوێ لەبەر جوانیەکەی لەلایەکیش ڕقی لەڕەوشتە خراپەکەیەتی، ئەمانە دژی یەک نیین، تۆش دەبێ بەقەد گوناهەکەی خۆشەویستیت بۆی کەم بێ.

ئینجا گەر بەڵگەکان بێنینەوە، خوای گەورە دەربارەی بێباوەڕان دەفەرموێ: بەڕاستی ئەوان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن [174]. مەبەستی لە شەڕخوازەکانە، نەک ئەوانەی بەئاشتی لەگەڵ موسڵمانان دەژین. هەروەها دەربارەی ستەمکاران دەفەرموێ: دڵتان بەلای ستەمکاراندا نەچێ، نەوەک ئاگری دۆزەخ بتان گرێ [175].

دەربارەی شەیتانیش دەفەرموێ: بێگومان شەیتان دوژمنی ئاشکرای مرۆڤەکانە [176].

وە دەربارەی هەواو نەفس دەفەرموێ: شوێن هەواو نەفس مەکەوە، نەوەک گومڕات بکاو لەڕێی خودا لات بدا [177].

کەوابوو دووربە لەو چوار تاقمەی کەباسمان کردن و خۆشیانت نەوێ، چون خۆشەویستمان فەرموویەتی مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا کۆدەکرێتەوە لەڕۆژی دوایی، بۆیە دەبێ وریابی و بزانی کەکێت خۆشدەوێ و دۆستایەتی کێ دەکەی.

- گەر پرسیارت نەبوو بڕۆ سەر بابەتێکی تر کوڕم.

+ بەسەرچاو قوربان.

---

١٧٤- سوورەتی نیسائ، ئایەتی ١٠١.

١٧٥- سوورەتی هوود، ئایەتی ١١٣.

١٧٦- سوورەتی ئیسرا، ئایەتی ٥٣.

١٧٧- سوورەتی ساد، ئایەتی ٢٦.

## باوەڕ بە فریشتەکانی خوا

دووەمین ئەرکـان لەبـاسی ئیمـــان     بـــاوەڕکـــردنـــە بە مەلائیکـــان
هەموو سەراسەر جەستەیـان نـــوورە     هەرچی گونـــــاهە لەئەوان دوورە
دوورن لەزاوزێ و نێرو مێ و خواردن     خوا نەبێ هیچ کەس نازانێ چەندن

+ فەرمووی قوربان گیان.

- کاکـە سـیڕاج، دووەمیـن ئەرکانـی ئیمان ئەوەیـە باوەڕکـەی بەفریشـتەکانی خـوا، کەوا جـۆرە مەخلووقێکـن خـوای گـەورە لەنـوور دروسـتی کـردوون و دوورن لەهەمـوو جۆرە گوناهێک.

ئـەم فریشـتانە شـەو و ڕۆژ لەژێـر فەرمانـی خـودان و هـەردەم لەپەرسـتش دان و ملکەچـن بـۆ خـودا.

هـەروەک خـودا فەرموویەتـی فریشـتەکان هەرگیـز لاملـی ناکـەن لەفەرمانـی خـوا بەڵکـو هەرچـی فەرمانیـان پـێ بکـرێ جێبەجێـی دەکـەن [١٧٨].

ئینجـا کوڕەکـەم بزانـە کـەوا فریشـتە وەکـو ئێمـە نییـن نێـرو مێیـان هەبـێ، هـەروا دوورن لـەزاوزێ و خـواردن و نوسـتن، وە خـوا نەبـێ کـەس ژمارەیـان نازانـێ، وەک خـۆی فەرموویەتـی جگـە لەخـوا کـەس ژمـارەی لەشـکرانی خـوا نازانـێ [١٧٩].

فریشـتەکان دەتوانـن لەهـەر وێنەیـەک بیانـەوێ خۆیـان دەرخـەن، جوبڕائیـل جـار جـار لەشـێوەی دوحیـە کەپیاوێکـی ڕێـک و پێـک و جـوان بـوو دەهاتـە لای خۆشەویسـتمان. هەروەهـا بەپێـی پایەیـان باڵیـان پێوەیـە، هێنـدێ دوو، هێنـدێ سـێ، هێنـدێ چـوار، تەنانـەت خۆشەویسـت لەشـەوی میعـڕاج جوبڕائیلـی بـە شـەش سـەد بـاڵ دیـوە.

ئینجـا لەسـەر ئـەم دوو فریشـتەیە بەهەڵـەدا نەچـی کـە ناویـان هـاڕوت و مـاڕوت بـوو، خەڵکیـان فێـری جـادوو دەکـرد، بـەم هۆیەوە بڵێـی فریشـتەکان گوناهـ ئەنجام دەدەن.

بەڵکـو لەوڵاتـی بابـل سـیحرو جـادوو هێنـدە زۆربـوو بەشـێوەیەک خەڵکەکـە جیـاوازی سـیحرو پەرجـۆی [١٨٠] پەیامبەرانیـان نەدەکـرد، بۆیـە هـاڕوت و مـاڕوت بەفەرمانـی خـوا

---

١٧٨- سووڕەتی تەحریم ، ئایەتی ٦.

١٧٩- سووڕەتی مودەسیڕ ، ئایەتی ٣١.

١٨٠- پەرجۆ: موعجیزە.



خەڵکیـان فێـری جـادوو دەکـرد تاکـو پێیـان بڵێـن ئـەی خەڵکینـە جـادوو لەگـەڵ پەرجـۆی پەیامبـەران زۆر جیـان، ئەوەتـا جـادوو زانسـتێکەو بەخوێنـدن و فێربـوون بەدەسـتی دێنـن، وەلـێ پەرجـۆ کارێکـی لەعـادەت بـەدەرە و شـیاوی پەیامبەرانـە و بەخوێنـدن دەسـت ناخـرێ.

جگـە لـەوەش خەڵکەکەیـان ئامـۆژگاری دەکـرد کەئـەم زانیاریـە بـۆ ناچـاری نەبـێ بـەکاری مەهێنـن، واش مەزانـن بەبـێ خواسـتی خـودا ئـەم جادووکردنـە سـوودی هەیـە، بەبـێ توانیـن و خواسـتی خـودا هیـچ چشـتێ ڕوونـادا.

پاشـان هەرچـی خـوای گـەورە دروسـتی کردبـێ ئـەوا فریشـتەیەک دیـاری دەکـرێ بـۆ نیگابـان[181] و پـەروەردە کردنـی. هـەروەک خـودا خـۆی سـوێندی خـواردووە بـەو فریشـتانەی کاروبـاری بوونـەوەر هەڵدەسـووڕێنن [182].

ئـەم فریشـتانە ئـەم مرۆڤـە دەپارێـزن لـەوەی کـە شـەیتان ئـازاری پـێ بگەیەنـێ، هـەروەک خـودا فەرموویەتـی خـوا دەسـەڵاتداری بـێ سـنوورە بەسـەر بەندەکانـی و چەندەهـا پاسـەوان دەنێـرێ بۆیـان [183].

ئینجـا هێنـدێ لـەو فریشـتانە خزمەتکردنـی دانیشـتوانی بەهەشـتیان پـێ سـپێرراوە و گەورەکەیـان نـاوی ڕەزوانـە، وە هێندێکـی تـر پێیـان دەڵێـن زەبانیـە، کـەکارو بـاری سـزای دۆزەخیـان پـێ سـپێردراوە و گەورەکەیـان نـاوی مالیکـە. وەکـو خـودای گـەورە فەرموویەتـی نـۆزدە فریشـتە لەسـەر دۆزەخـن [184].

هەروەهـا حەفـەزە بـەو فریشـتانە دەڵێـن کـە کاروبـاری مـرۆڤ دەنووسـن، دوو فریشـتە لەشـەوداو دووانیـش لـەڕۆژدا، یەکیـان لەسـەر شـانی ڕاسـتەیەو یەکیـان لەسـەر شـانی چەپـی مرۆڤـە. فریشـتەی ڕاسـتە چاکەکانـی ئـەو مرۆڤـە دەنووسـێ و ئـەوەی لای چەپیـش خراپەکانـی.

---

١٨١- نیگابان: پاسەوان.

١٨٢- سوورەتی نازیعات ، ئایەتی ٥.

١٨٣- سوورەتی ئەنعام ، ئایەتی ٦١.

١٨٤- سوورەتی مودەسیر ، ئایەتی ٣٠.



خـوداش دەربارەیـان دەفەرمـوێ  بێگومـان ئێـوە چاودێرتـان لەسـەرە لەفریشـتە بەڕێـزە تۆمـارکارەکان [١٨٥].

+ باشە قوربان ئەم نووسینەیان بۆچییە لەکاتێکدا خودا خۆی کارەکان دەبینێ؟

- سـیراج گیـان، ڕاسـتە خـۆی دەیـان بینـێ، وەلـێ بـۆ ئـەوەی لـەڕۆژی دوایـی نووسراوەکانیـان پـێ بـدا کـە چ چاکەیـەک و چ خراپەیەکیـان کـردووە، خۆیـان لێـی بڕوانـن و نەڵێـن خـودا زوڵمـی لێـمان کـردووە.

ئینجـا دوو فریشـتەی تـر کەناویـان مونکـەرو نەکیـرە، پرسـیار لەمـردوو دەکـەن لەنێـو گـۆڕدا، وە ئەوانـەی کاری سـزادانی مـردووە تاوانبـارو بـێ باوەڕەکانیـان پـێ سـپێرراوە گەلـێ زۆرن، هـەر خـودا دەزانـێ چەنـدن.

پاشـان گـەر باسـی پلەکانیـان بکەیـن، ئـەوا چـوار کۆمەڵـە هـەن لەفریشـتەکان لەئەوانـی تـر گەورەتـرن. یەکـەم: موقەڕڕەبیـن: واتـا نزیکانـی بـارەگای خـودا، دووەم: کەڕڕوبـی، کـەوا سـزایان پـێ سـپێرراوە، سـێیەم: ڕوحانـی، کەفریشـتەی خێـرو پیرۆزیـن، چوارەم:حەمەلەتـول عـەڕش، ئەوانـەی عەڕشـی خوایـان هەڵگرتـووە.

جـا موقەڕڕەبـەکان چواریـان ناویـان زانـراوە، یەکـەم: جوبڕائیـل، کـەوا وەحـی بـۆ پەیامبـەران هێنـاوە، دووەم: میکائیـل: کەفەرمانـی دان و گرتنـەوەی ڕزق و ڕۆزیـە، سـێیەم: عیزڕائیـل: کـەوا گیانـی هەمـوو گیانلەبـەران دەکێشـێ، چـوارەم: ئیسـڕافیل: کـەوا فـوو دەکات بـە سـووڕدا. ئـەم سـووڕە شـاخێکە بەژمـارەی گیانلەبـەران کونـی تێدایـە و ئیسـڕافیل دووجـار فـووی پێـدا دەکات، بەیەکـەم فـوو هەمـوو گیانلەبـەران دەمـرن، ئەمـەش لـەڕۆژی پەسـڵان ڕوودەدا، بەفـووی دووەم هەرچـی مـردووە زینـدوو دەبێتـەوە.

جـا پەیامبـەران پایەیـان لەهەمـوو فریشـتەکان بەرزتـرە، بـەو چـوار کۆمەڵەشـەوە کەگوتمـان، وەلـێ ئـەم چـوار کۆمەڵـەی فریشـتەکان پایەیـان بەرزتـرە لەپیاوچاکـی مـرۆڤ و ئـەم پیاوچاکانـەش بەرزتـرن لەفریشـتەکانی تـر جگـە لـەم چـوار کۆمەڵـە.

هەروەهـا فریشـتەکان بەگشـتی پایەبەرزتـرن لەمرۆڤـی نـا دادپـەروەرو گوناهبـار، چـون ئـەوان دوورن لـە گوناهــ کردن.

---

١٨٥- سووڕەتی ئینفیتاڕ ، ئایەتی ١٠ ، ١١.



- کات ماوە یان بەس بێ؟

+ قوربان تۆزێ کات ماوە گەر ئەم بابەتەش بخوێنین.

- دەی بفەرموو کێشە نییە.

+ **باسی جن**

درووست بووی ئاگر جنۆکەی نێوە ... خۆیان دەگۆڕن بەچەندین شێوە

نێرو مێ و زاوزێ و خوردو خەویان هەس ... جودان لە مەلەک، دەزانێ گشت کەس

هەندێ کافرن هەندێ ئیماندار ... هەم بێ گوناه و هەمیش گوناهبار

+ بفەرموو مامۆستا گیان.

- باشە سیراج گیان، دوای ئەوەی لەفریشتەکان دواین باسی جنەکانیش دەکەین. ئەوان کۆمەڵە خەڵکێکن کەوا لەئاگر دروست بوون، توانایان هەیە خۆیان بگۆڕن بۆ هەر وێنەیەک کە بیانەوێ، وەکو خودا فەرموویەتی کە جنی لەبڵێسەی ئاگر دروست کردووە[186].

ئینجا بزانە کەوا جن گەلێ جیان لەگەڵ فریشتەو تێکەڵیان نەکەیت، چون جنۆکە وەکو مرۆڤ نێرو مێیان هەیەو زاوزێ دەکەن و هەم دەخۆن و دەشخەون، وەلێ فریشتە ئەمانەیان نەبوو. ئینجا جنۆکە هێندێکیان کافرن و هێندێکیش باوەڕدار، وە لەباوەڕدارەکانیش گوناهبارو بێ گوناهیان هەیە.

ئەوان پێشی پەیامبەر ئادەم لەسەر زەوی دەژیان، وەک چۆن ئێستاش بوونیان هەیە.

وە ئەوان ئێمە دەبینن وەلێ ئێمە ناتوانین ئەوان ببینین، ئەمەش حیکمەتەکەی هەر خودا خۆی باشتر دەزانێ، وەلێ لەڕۆژی پەسڵاندا[187] پێچەوانە دەبێتەوە، واتا ئێمە ئەوان دەبینین و ئەوان نامان بینن.

ئەوەش بزانە کەشەیتان لەچینی جنەکانە نەک لەچینی مرۆڤ و فریشتە. وەلێ لەبەر ئەوەی کاتی خۆی زۆری پەرستش کردووە و ڕێزدار بووە و زۆریش لەناو کۆمەڵی فریشتان بووە هاتۆتە ڕیزی ئەوانەوە. لێ ئەو کاتەی کڕنۆشی ڕێزی

---

١٨٦- سوورەتی ڕەحمان، ئایەتی ١٥.

١٨٧- پەسڵان: ڕۆژی دوایی.

بۆ پەیامبەر ئادەم نەبردو فەرمانی خوای شکاندو خۆی بەگەورە زانی، خوای گەورە نەفرەتی لێکردو دووری خستەوە لەسۆزی خۆی. وەکو دەفەرموێ: کاتێ بەفریشتەکانمان گوت کڕنۆش بۆ ئادەم ببەن هەموو کڕنۆشیان برد، وەلێ ئیبلیس کەوا لەجنەکان بوو لەفەرمانی خوا دەرچوو [188].

جا هەرکەسێ ڕێگای ئەم دوژمنەی خوا بگرێ ئەوا دەیفەوتێنێ و بەرەو ئاگری دۆزەخ پەلکێشی دەکا.

- ئێستا دەتوانی بڕۆی کوڕم، دەزانم درەنگتە، تۆزێ ڕوخسارت ئاڵۆز دەبینم.

+ ڕاست دەکەی قوربان تۆزێ درەنگە، خوا پاداشت و سۆزی خۆیت بەسەردا ببارێنێ، لەسەر مۆڵەتت من دەبێ دەرچم.

- بفەرموو ڕۆڵەکەم، خودات لەگەڵ.

سیراجی مەولەوی وەکو هەموو جارێ بەرەو قوتابخانە وەڕێ کەوت، لەپڕێکدا لەنزیک باغێکی گەورە سێ تازە لاو بەرەو ڕووی هاتن. سەرەتا وای زانی لەچشتێک دەپرسن، وەلێ هەر زوو هەستی بەتووڕەیی و شەڕکرد لەنێوچاوانین. ئەو دەمەی پتر نزیک بوونەوە تێبینی کرد ئەوە هەمان ئەو گەنجەیە کەپێشووتر لێی دابوو.

بەخێرایی هەرسێ لاوەکە دەورەیان لەمەولەوی گرت، ئەو دانەیەی پێی کەوتبوو خێرا هاتە دەنگ: ها برادەر، ئێستا بەرەو کوێ ڕادەکەی لەدەستم، جاری پێشووتر کەئاگادار نەبووم نامەردانە چاکت وەشاند، وەلێ ئەم جارە نۆرەی ئێمەیە بیوەشێنین.

لەو کاتەدا مەولەوی بیری لەڕێگایەکی دەرچوون دەکردەوە، ئاخر جگە لەوەی ئەو وازی لەشەڕکردن نییە ئەوان سێ کەسن و ئەو تەنیایە و دەورەیشیان لێ گرتووە.

زانی کە ئەستەمە بتوانێ بەساغی بۆی دەرچێ، بۆیە بەناچاری شەڕی هەڵبژاردو خێرا جانتاکەی داناو غاری دایەوە هەمان لاو کەپێشتر لێی دابوو، سرک و تیژ خۆی تێکردو توند ملی گرت، وەلێ دووەکەی دی خێرا پێی گەیشتن و دەستیان بەلێدانی مەولەوی کرد. هەرچەندی بەهێزەوە لەمەولەویان دەدا بنەقاقای ئەو گەنجەی بەرنەدەدا و دەیهەویست گەر بشی دۆڕێنێ ئەمەیان چاک تەمێ بکا.

---

١٨٨- سووڕەتی کەهف، ئایەتی ٥٠.



لەکۆتاییدا یەکێ لەوان دارێکی ستووری خێواندە سەری و گێژی کردو بەرچاوی لێڵ و تاریک بوو و لەهێزی خست، ئینجا بەهەرسێکیان دەستیان کرد بەلێدانی.

ئەو دەمانەی خوێن لەسەریەوە تنۆک تنۆک دەستەکانیان سوور دەکرد، ڕێک ئەو ساتەی بەخەیاڵدا هاتەوە کەسەناریا لەگەڵ باوکیدا بەسواری ئەسپە ڕەش دەڕۆیشتن و ئەویش وەدوایان کەوتبوو. ناوە ناوە بەردەبوویەوە و دەستە بچووکەکانی سوور ببوون لەخوێندا.

لەم کاتەدا ئاوی چاوانی قەراریان نەگرت و غلۆر بوونەوە، خوێن و خۆڵ و ئەسرین دووبارە تێکەڵ بوونەوە. بەدەنگێکی لەرزۆکی کەم دەرهاتوو ئەم شیعرەی نالی دەگوت:

حەنایی کردووە پەنجەی بەخوێناوی دڵی زارم
ئەمە ڕەنگە شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دڵدارم

ئیدی کەزانیان مەولەوی توانای نەماو لەپەل و پۆ کەوت، خێرا دەرچوون و بۆی هەڵاتن.

مەولەوی یەشتا لەهۆش نەچووبوو، وەلێ هەستی بەئازارو سەرسووڕانێکی بێ وێنە دەکرد.

هەرچەندە ئەمە بۆ ئەو چشتێکی وانەبوو سەبارەت بەو ئازارەی کەسەناریا لەمنداڵیدا تەنهای کرد.

ئیدی تەواو هێزی لێ بڕا، بەچەشنێ کەنەیدەتوانی دیمەنەکانی بەردەمی ببینێ، کاس بوو بوو، وەلێ یەشتا هەستی بەدەنگی چۆلەکە و کوکوختیەکان دەکرد لەسەر لقەکاندا، کە دەتگوت هەموویان بۆ ئەو دەگرین و جریوە جریوەکانیان ئاسمانی تەنیوەتەوە، ئەمەش تاڕادەیەک ورە و هێزی دەهێنایەوە بەر. هەستی دەکرد یەکێ لەکۆترە سپیەکان بە گمە گمێکی غەمبارانەوە باسی سەناریای بۆ دەکا و دەیهەوێ بیسەلمێنێ کە سەناریا سەر بەچینی ئەوانە و لەجەستە سپی و لەچکە سپیەکەیدا دەتوانی ئەوە بەدی بکەی.

ئاخر کاکی کۆتر چۆن داوایەکی وا بێ بەڵگە دەکەی، دەتەوێ سەناریامان لێ ببەیت و لەگەڵ خۆتدا بەرزی کەیتەوە بۆ سەر لقە بەرزەکان، یان دەتەوێ بۆ نێو ئاسمانی شین بیبەی و بۆ تا هەتا نەتوانین دەستمان پێی بگاتەوە. نا نا ئەو هەرگیز لەئێوە نییە.

دوای ئـەوەی مەولـەوی لەگـەڵ کۆترەکـە نەگەیشـتە ئەنجـام، کۆتـر هەڵفـڕی و مەولەویـش سـەرەنجام بـێ توانـا کـەوت و ئاگاهـی دونیـای نەمـا.

لەنـاکاو دیـەی هەڵێنـا و هەسـتی کـرد لەماڵێکدایـە، پیاوێکـی گەنـج کەلـەوە دەچـوو دکتـۆر بـێ مژووڵـی[189] چارەکردنیەتـی و سەریشـی پێچـراوە.

لەبـەر ئێشـەکەی هێـزی ئـەوەی نەبـوو کـە بێـژێ تـۆ کێـی و مـن لەکوێـم، بۆیـە بەبـێ دەنگـی چاوەکانـی لێـک نـاوە و لەبـەر هیلاکـی خـەوی پـێ کەوتـەوە.

دووبـارە سـەناریای دی، ئەمجارەیـان بەعەزیەیەکـی سـووری درێـژ لەنێـو کۆمەڵـێ گوڵـی سـپیدا ڕێـی دەکـرد و جلەکانـی لـەدوای دەخشـان. بەچەشـنێ خەرامـان[190] بـوو کەنـازو مەکـری لـێ دەبـاری، سـووری عەزیەکـە و سـپیایی گوڵـەکان لەگـەڵ سـپی و سـووری ڕوخسـاریدا عەجیـب ڕێـک بـوون و دیمەنێکـی یەکجـار دانسـقەیان ئافراندبـوو. لەچـاوی سـەوزی و ئاسـمانی شـینیش هـەر مەپرسـە.

چەنـدی نزیـک دەبوویـەوە پـەڕە گوڵـی کوڵمانـی سـوورتر و سـوورتر دەبـوون. مەولەوی لەنێویـدا جۆگەلـە خوێنـی هەمـوو ئـەو عاشـقانەی بـەدی دەکـرد کـە بەنیگایەکـی ئـەو کاس بـوو بـوون. هـەر دەتگـوت نیگارێکـە و خوداوەنـد بەتایبـەت کێشـاویەتی.

مەولـەوی بەتـەواوی لێـی نزیـک بوویـەوە، بانگـی لـێ کـرد: سـەناریا، ئـەوە منـم سـیڕاجم، نامناسـیەوە؟ ئێسـتا هەمـوو قوڕئانـم خەتـم کـردووە، تەنانـەت قوتابیشـم هـەن، سـەرەڕای ئـەوەش ڕۆژانـە وانـەی بیـرو بـاوەڕ دەخوێنـم، بەڕاسـتی زۆر بیـرم دەکـردی سـەناریا زۆر.

قسـەکانی تـەواو نەکـرد مامۆسـتا عەبدولڕەحـمان دیارکـەوت و بانگـی لـێ کـرد. مەولـەوی کەوتـە دڕدۆنگیەکـی[191] سـەیر، ئاخـۆ لای سـەناریا بمێنمـەوە و مامۆسـتا پشـت گـوێ بخـەم!

ئاخر دەترسم بڕۆمە لای مامۆستا سەناریاش بڕوا، چۆن ئەم دەرفەتە لەدەست خۆم بدەم!. لەلایەکی دیش چۆن دەکرێ گوتەی مامۆستا پشت گوێ بخەم کەبانگم دەکا.

---

١٨٩- مژووڵ: سەرقاڵ.

١٩٠- خەرامان: ئافرەتی شەنگ و شۆخ.

١٩١- دڕدۆنگ: دوودڵ.

دووبـاره مامۆسـتا بانگـی کـردەوە و گوتـی: گـەر نەیـەی بـۆلای ئێمـە ناچـار دەبـی تامـاوی بەنەزانـی بـژی، مـن زانسـتم کـوڕم.

مەولـەوی پـتر دڕدۆنـگ بـوو، پێیەکـی لای سـەناریاو دانەکـەی تـری لای مامۆسـتابوو. لەپڕێکـدا مرۆیەکـی قـژ ئاڵـۆزی چـاو دەرپۆقیـوی ناشـیرین لـەدواوە گوتـی: سـەناریا وەرە لای ئێمـەو واز لـەو گەنجـە بێنـە، ڕێـگای ئـەو لەگـەڵ هـی ئێمـە جیـان.

سـەناریا بـێ دوو دڵـی ڕووی لەمەولـەوی وەرگێـڕاو بـەرەو بابـای نەنـاسراو چـوو، هەرچەنـدە مەولـەوی چەنـد جارێـک لـەدواوە بانگـی کـرد، بـێ سـوود بـوو. دواتـر مەولـەوی سـەیرێکی مامۆسـتای کـردو بەگریانـەوە بـەرەو لای هەڵهـات و لـەو کاتـەدا لەخـەو ڕاپـەڕی.

هەمـوو گیانـی دەلـەرزی و ڕەنگـی پـەڕی بـوو، خێـرا گەنجێـک بادیـەک[١٩٢] ئـاوی پێـداو سـەری خسـتەوە سـەر سـەرینەکە.

گەنجەکـە کەزانـی خەبـەری بوویـەوە لێـی نزیـک بـۆوەو پێـی گـوت: بەخێربێـی بـۆ ماڵەکـەم مەولـەوی، چەنـد ڕۆژێکـە چاوەنـووڕی بینینـت بـووم. گوتیـان لەسـەر کارێکـی خێـر وات لێهاتـووە، مـرۆی وەک تـۆم خۆشـدەوێ، بـەردەوام بـە لەسـەر یارمەتـی ئەوانـی دی هەرچەنـدە زیانیشـی بـۆ خـۆت هەبـێ.

مەولـەوی کـە ڕاهاتبـوو بـەم جـۆرە قسـانە گوتـی: دووبـارە شـێخێکی دی؟ باشـە ئێـوە کێـن و چـۆن مـن دەناسـن؟

- شـێخ نیـم بـرا، وەکـو تـۆ فێرخوازێکـم، تەنـێ فەرمانـم پـێ کـراوە کەلـەم چەنـد ڕۆژە لەنزیـک باغـە گەورەکـە گەنجێـک پێویسـتی بەیارمەتـی تۆیـە و منیـش ئەمـەم بەجـێ گەیانـد، جانتاکەشـتم هێنایـەوە خەمـی کتێبەکانـت نەبـێ.

+ باشە کێیە ئەوەی فرمانی پێ کردی؟

- یەکێکە لەپیاوانی خودا.

سـیڕاجی مەولـەوی کەخەریـک بـوو هـزری ئاڵـۆز دەبـوو، توانـای پرسـیارکردنی نەدەمـا، گوتـی: دەمـەوێ ئـەو کەسـە بناسـم، تکایـە یارمەتیـم دە.

---

١٩٢- بادی: جامی ئاو خواردنەوە.



- ئەو گوتی کەپێت بێژم پەلەی نەبێ لەناسینی ئێمە، یەشتا ماویەتی، سەلامیشی هەبوو بۆت.

+ تۆ چی ئەوی؟

- تەنێ قوتابییەک.

+ پێویستە بەڕێگایەک ماڵەوەمان ئاگادار بکرێنەوە، چون گەر درەنگ بڕۆمەوە نارەحەت دەبن.

- با کەمێک بێیەوە سەرخۆ، دواتر بەکەسێک دەڵێم بتگەیەنێتەوە ماڵێ.

نزیک نوێژی عەسر پیاوێکی کەڵەگەت هات و لەگەڵ گەنجەکە مەولەویان خستە نێو عەرەبانەیەک کە لەبارکێشێکی[193] زەرد خسترابوو. وەڕێ کەوتن تاکو گەیشتنە بەردەم دەرگای ماڵی مام سلێمان، بەبێ ئەوەی نەکابرا نقەیەک بکا نە مەولەوی.

لەو کاتەدا تەنیا ڕەحمە خاتوون لەماڵ بوو، کەچاوی بەکوڕەکەی کەوت دەستی کردە لەخۆدان و گریان، بەچەشنێ خەریک بوو لەهۆش خۆی بچێ، تاوەکو مەولەویان بردە ژوورو لەسەر جێگاکەی درێژیان کرد. پیاوەکە خێرا خۆی پێچایەوە و ڕۆشت.

مەولەوی لەگەڵ گریانی دایکی هێندەی دی هەستی بەنارەحەتی و سەرئێشە دەکرد و گوتی: دایکە گیان، ئەمە گریانی بۆ چییە؟ چەند چوختیەک[194] بوون ڕێیان پێ گرتم و بڕایەوە ئیدی، ئەوەتا دەمبینی زیندووم شوکر بۆ خوا.

خاتوو ڕەحمە بەچاوی ئاڵۆزو فرمێسکاوی دایکانەوە هاتە گۆ: چۆن گریانی ناوێ کوڕم، سەیری خۆت کردووە چییان پێ کردووی، پێویستە ئەمانە شکاتیان لێ بکرێ، تاکو تەمێ ببن. کەباوکیشت هاتەوە پێی دەڵێم پایسکیلەکەت بۆ چاک بکاتەوە، بۆ ئەوەی ناچار نەبی ئیدی بەپێ بڕۆی. خوا بیان کوژێ کەچۆن وا ئازاری کوڕەکەی منیان داوە.

سیڕاجی مەولەوی نزیکەی دوو هەفتە نەیتوانی بچێتە قوتابخانەو مام سلێمان مۆڵەتی ئەو ماوەیەی بۆ وەرگرتبوو تاکو پشوویەکی باش بداو برینەکانی تەواو ساڕێژ ببن.

---

١٩٣- بارکێش: وڵاخ.

١٩٤- چوختی: چەقاوەسوو.

لـەم ماوەیـەدا پۆلـێ لەقوتابیانـی هاوڕێـی کەزانیبوویـان تەندروسـتی بـاش نییـە هاتنـە سـەردانی بەیـاوەری مامۆسـتای کیمیا، کەئەمـەش زۆر جێگای دڵخۆشـی مەولەوی بوو.

جگـە لەمـەش هاوڕێیانـی لادێـی زوو زوو بەسـەریان دەکـردەوەو نەیـان دەهێشـت بەتەنیـا غەمباربـێ.

دوای تێپەڕینـی دە ڕۆژ جەسـتەی مەولـەوی تـەواو بـەرەو چـاک بوونـەوە دەچـوو، ئـەو ڕۆژە ئەمیـر بەتەنیـا هاتـە سـەردانی، هـەر زوو دوای چـاک و چۆنـی ڕایگەیانـد کەهەواڵـی خۆشـی لایـە.

+ یا ئەڵا ئەمیر چی بووە؟

- بەهـەردوو چـاوی خـۆم سـەناریام بینـی سـیڕاج، وای خوایـە ئەمـە چ جوانیـەک بـوو! لـەو بڕوایـەدا نەبـووم کـە هێنـدە جـوان بووبـێ!

لەگـەڵ ئـەم هەواڵـە مەولـەوی تووشـی کۆکەیەکـی تونـد بـوو، کەخەریـک بـوو پـرزەی بووەسـتێ، ئەمیـر خێـرا هەنـدێ ئـاوی بـۆ هێنـاو دوای خواردنـەوەی تۆزێکیشـی بەسـەرو چاویـدا پژانـد.

- چـی بـوو مەولـەوی بـرام؟ گـەر زانیبـام وات لێـدێ پێـم نەدەگوتـی، بـاش نەبـوو خاتـوو ڕەحمـە چۆتـە دەرێ، وای بینیبـای دونیـای کاول دەکـرد بەسـەرمان.

مەولـەوی تـۆزێ بەناڕەحەتیـەوە هاتـەوە گـۆ: بێـژە بـرا بێـژە، ئێسـتا ئاسـاییم، چۆنـت دی و لەکوێـت دی؟

- لەگـەڵ باوکـم لەماڵـی زریـان بوویـن لەدێـی چنـار، لـەوێ بینیـم، ماڵیـان زۆر ئاسـانە بـرا، هـەر بەرامبـەر حـەوزی ماسـیەکە خانووێکـی تـازەو فراوانـە، لەبـەر دەرگاکەیـان دار تووێکـی گـەورە بـەدی دەکـەی. تـۆ ئەوجـارە بەهەڵـە ڕێگاکـەت گرتبـوو بۆیـە وات لێهـات، گـەر پێـت خۆشـبێ ئـەم سـەفەرەیان بەیەکـەوە دەچیـن.

+ زۆرچاکە بەیانی دەچین.

- وەلێ تۆ هێشتا نەخۆشی!

+ خۆشەویسـتی نەخۆشـی و چشـت نازانـێ ئەمیـر، ئـەو کەسـە نەخۆشـە کەعاشـق نییە، خۆزگـە هەمـوو جەسـتەم چەنـد ئەوەنـدە بەئـازار دەبـوو بۆ تـاوێ سـەناریا لـەلام دەبوو.

بەیانی دووشەممەیە و تۆ بەیانیەکەی دەچیتە قوتابخانە، بەر لەنوێژی عەسر وەڕێ دەکەوین.

- باشە بەڵام بەچی بڕۆین، ئەوێ تۆزێ دوورە؟

+ باوکم پایسکیلەکەمی چاک کردۆتەوە، تۆش پایسکیلێ لەیەکێ لەهاوڕێیان وەرگرە بەخواستن، دوو قۆڵی بۆی دەردەچین.

- تەواو تێگەیشتم برا، ئەمجارەیان منت لەگەڵە من، دڵنیابە نایەڵم ڕێت لێ هەڵەبێ و تووشی چورتم[195] ببی.

هەر لەگەڵ ڕۆشتنی ئەمیر، مەولەوی ئەو نامەیەی دەرهێنایەوە کەکاتی خۆی بۆ سەناریای نووسی بوو. دووبارە خستیەوە سەر چەند لاپەڕەیەکی نوێ و بەڕێنووسێکی خۆش نووسیەوە، وەلێ زۆر دەسکاری نەکرد تاکو مۆرکی منالی پێوە بمێنێ، چون هەمیشە نامەیەک کە لەمناڵێکەوە نووسرابێ پتر پاکی و بێتاوانی نومایان دەکا.

بۆ بەیانی بەر لەنوێژی عەسر ئەمیرو مەولەوی بەرەو دێی چنار وەڕێ کەوتن، وەلێ ڕۆیشتنێ کەترپە ترپێکی خێرای خستبوویە دڵی مەولەویەوە. ئاخر دوای ئەم هەموو ساڵە تێپەڕین بەشەقام و کوچەو لادێی یاردا هەستێکی وای هەیە کە لەگوتن نایە.

لەکۆتاییدا گەیشتنە لادێکە، بەهارێکی ڕەنگین بوو، سەوزایی و گوڵە ڕەنگ ڕەنگ و چارانچەقیلەکان[196] و چینەی[197] چێژیلە[198] و شنەبای بەهار هەستێکی تەواو عاشقانەتریان بەمەولەوی بەخشی بوو.

هەر لەگەڵ گەیشتنیان بانگی عەسری فەرموو، مەولەوی ئاماژەی بەرەو مزگەوتێ کرد کەنزیک بوو لەماڵی سەناریاوە. دوای ئەوەی نوێژەکەیان لەوێ ئەنجامدا ئەمیر مەولەوی بردە لای زریانی هاوڕێیان کەلە قۆناغی سەرەتاییدا هاودەمیان بوو.

---

١٩٥- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

١٩٦- چارانچەقیلە: گوڵاڵە سوورە.

١٩٧- چینە: ملۆ مووشی باڵندە لەزەویدا.

١٩٨- چێژیلە: چۆلەکە.

دوای بەیەک شادبوونەوەو لەیەک پرسین و گێڕانەوەی هەندێ سەربوردەی منداڵیان، زریان یاوەری هەردووکیانی کرد بەرەو بەردەم ماڵی سەناریاو ماڵەکەی بەمەولەوی نیشان دا. هەروەکو ئەمیر باسی کردبوو خانووێکی فراوانی تازەبوو کەدار توویەک لەبەردەم ماڵیان بەدی دەکراو لەبەرامبەریان حەوزێکی گەورەی ماسی بوونی هەبوو.

مەولەوی هەرکە ماڵی دولبەرەکەی بینی تنۆک تنۆک ئەسرین ماڵئاوایی لەگلێنەی چاوی دەکردو لەبەر خۆیەوە هۆنراوەیەکی قەیسی عامیری ناسراو بەمەجنونی دەگوتەوە:

دام بەلای خاک و دیارو شارێ لەیلای وا تیا
تاکو ماچی کەم دیوارو دارو بەردی دەست بەجێ

وانەبێ من خۆشەویستی دارو دیوارم هەبێ
بەڵکە عیشقم بۆ ئەوەی هەس وا لەوێدا نیشتەجێ

مەولەوی لەحاڵەتێکی ئێجگار سەیر دابوو، نەیدەزانی چی بکاو چۆن ئەو هەستە دەربڕێ کەئێستا لەبەردەم ماڵی سەنارییە. لەلایێ ئەسرینەکان نەدەوەستان و لەلایەکی دی خەندەی تەڕو تازە دەهاتنە سەر ڕوخساری.

دەم نا دەمێ دەستی بۆ نامەکەی باخەڵی دەبردو خۆزگەی دەخواست ڕێگایەک هەبێ بیگەیەنێتە دەستی دولبەر. لەپڕێکدا دەرگای ماڵی سەناریا واڵا کراو دڵی مەولەوی هێندەی تر داخورپا و خەریک بوو تووشی پچڕانی پرزەی ببێ.

ڕوانی وا منداڵێکی جوانکیلە لەدەرگا هاتە دەرێ، تەمەنی لەدەوری چوار ساڵان دەبوو، وەلێ خاوەنی جوانیەکی بێ وێنەبوو. قژێکی زەردی ئاڵتوونی و ڕەنگێکی سپی و سوور، کەلەوانە دەچوو بەکەمی خۆر لێیداون. چۆن جوان نییە ! بێگومان جوانە، ئەو برای سەنارییە.

مەولەوی خێرا سەرنجی خستە سەر چاوەکانی، وەلێ هی ئەویان سەوز نەبوو، بەڵکو قاوەییەکی چروسکە[199] بەخش بوو. ئەو دەمەی ویستی زیاتر نزیک بێتەوە لێی منداڵەکە چوویەوە ژوور و دەرگاکەی گاڵەدا[200].

---

١٩٩- چروسکە: شەوق.

٢٠٠- گاڵەدان: داخستنی دەرگا.

زریـان دەسـتێکی لەسـەر شـانی مەولـەوی دانـاو گوتـی: بابڕۆیـن بـرا، زیـاد لەپێویسـت لێـرە بـوون ڕەنگـە جـوان نەبـێ بـۆ ئێمـە، گـەر پێـت خۆشـبوو بیسـت خولەکـی تـر دووبـارە پێیـدا دێینـەوە.

ئـەم مناڵـە بـرای بچووکـی بـوو، نـاوی (سـەمەر) ە، پێـم وابـێ زۆر بـەو دەچـێ بۆیـە وا هۆشـی نەهێشـتی.

مەولـەوی کەتـۆزێ هۆشـی هاتـەوە گوتـی: ڕاسـت دەکـەی، ببـوورە بـرا گیـان، نەدەبـوو هێنـدە بوەسـتین، وەلـێ زەینـم بـەلای خۆمـدا نەمابـوو.

ئیـدی تـا درەنگانـی ئێـوارە مەولـەوی و ئەمیـر لای زریـان مانـەوە، یـەک دووجـاری تریـش بـۆ سـوکنایی دڵ بەوێـدا ڕابـوردن، ئەمـا هیـچ ئەسـەرێک لەسـەناریاوە بوونـی نەبـوو، تەنـێ ئەوەنـدە بـوو بەدیتنـەوەی مەنزڵەکـە دڵـی تـۆزێ ئۆخژنـی[٢٠١] گرتبـوو.

دوای عەسرێکـی درەنـگ هەردوو ماڵئاواییان لەزریان کـردو وەڕێ کەوتنەوە بەرەو ماڵێ.

بـەدەم ڕۆیشـتنەوە تـاو ناتـاوێ مەولـەوی دەنگـی بەرزدەکـردەوە بەهۆنراوەکانـی و هەنـدێ جاریـش لەگـەڵ ئەمیـر دەدوان.

+ دەزانـی ئەمیـر هاتـن گەلـێ خـۆش و پـڕ چێـژ بـوو، پایسکیلەکەشـم تیژڕەوتـر دەڕۆیی، وەلـێ ئێسـتا هەسـت دەکـەم زۆر قـوڕس بووە.

- هیچ نییە برا، لای من هەریەکە، تۆ خەیاڵی دولبەرت تۆزێ قوڕسی کردووی لەگەڕانەوە.

+نـەک هـەر قـوڕس، ئەگـەر شـەرم نەبوایـە وازم لـێ بـوو تاکۆتایـی ژیانـم هـەر لـەوێ بـووام، هیـچ نەبوایـە جـار جـارێ ئـەوم دەدیت.

- قسـەی سـەیر دەکـەی هـا، جـا بۆچـی کوخـێ بۆخـۆت چـێ ناکـەی لەبەرامبەریـان هـەروەک ئـەوەی مامەپیـرە. وەلـێ دەترسـم تـۆش جـن و چشـتت لـێ کـۆ ببنـەوەو کـەس نەوێـرێ سـەرێکت لێبـدا ئـەوکات.

سـیڕاج بـەدەم پێکەنینـەوە: بۆچـی نا، خەڵـک شـێتی دونیابوون بائێمە شـێتی عیشـق بین، هیـچ نەبێ شـێتیەکەی ئێمـە چاترە لەهـی ئەوان، بەڵکـو هەر بەراوردیـش ناکرێن.

ئەمیـرو مەولـەوی بـەدەم ئاخاوتنـەوە گەیشـتنەوە لادێ و ماڵئاواییـان لەیـەک کـردو هەریەکـە بـەرەو ماڵـی خـۆی تێـی خزانـد.

---

٢٠١- ئۆخژن: ئارام.

ئـەو شـەوە مەولـەوی دووبـارە چـۆوە بـۆ مزگـەوت بـۆلای فێرخوازەکانـی کەمـوودیّ بـوو مـام ئیسـماعیل قوتابیەکانـی ئەویشـی لەخـۆی گرتبـوو. بەتایبەتـی زۆر بیـری ئەحمـەدی دەکـردو نەیدەتوانـی لـەوە پـتر نەیبینـێ، ئاخـر لـەدوای لەدەسـت دانـی سـەناریا ئەحمـەد تاکـە سـێبووری بـوو بـۆی.

لەگـەڵ ئەوەشـدا بڕیـاری دابـوو بەیانـی سێشـەممە بڕواتـەوە قوتابخانـە و چیـتر نـە وانەکانـی فێرگـە و نەبیروباوەڕەکـەی لەکیـس نەچـن.

ئـەو شـەوە تابەیانـی چـاوی وێـک نەکەوتنـەوە لەبـەردەم سـتێرەکاندا، بیـری لای بـەردەرگای ماڵـی سـەناریاو ئـەو نامەیـە بـوو کەمـوودیّ بـوو لەنێـو کتێبـەکان و گیرفانیـدا دەیشـاردەوە و خـەوی بـەو ڕۆژەوە دەبینـی کـە پەیامەکـەی گەیشـتووە.

بەیانـی بـەر لەنیـوەڕۆ وەکـو هەمـوو جـاریّ خـۆی کۆکـردەوە و خێـرا نانـی خـواردو وەڕیّ کەوتـەوە بـۆ قوتابخانـە. هەرچەنـدە خاتـوو ڕەحمـە داوای کـرد کەنـەڕوا تاکـو دوو هەفتەکـە کۆتـا دێـن و جـاریّ تـەواو چـاک نەبۆتـەوە، وەلـێ مەولـەوی پێداگربـوو لەچوونـەوە و یەکـەم کاری لـە دەرگادانـی ماڵـی مامۆسـتابوو.

- کێیە؟

+ هیچ مامۆستایێ هەیە قوتابیەکەی خۆی نەناسێ؟

- ئـەم قوتابیـە گـەر بـەردەوام ئامادەبێ دەیناسـێ، وەلێ گـەر جارجـار ون بـوو مومکینە نەیناسێتەوە.

مامۆسـتا خێـرا هـات و دەرگاکـەی لـێ کـردەوە و بەخێـری هێنا، هـەر لەدوای ڕوونیشـتن پرسـیاری دیارنەبوونـی ئـەم هەفتەیـەی لێکـرد، لـێ مەولـەوی لـە هۆکارەکـەی نـەدواو هـەر هێنـدەی گـوت کـە ئـەم موددەیـە تـۆزیّ نەسـاغ بـووە. ئـەو نەیدەویسـت مامۆسـتا بـەم ڕووداوە دڵگـران بـکا، مامۆسـتاش نەیدەویسـت مەولـەوی بـە هەواڵـی دەنگۆکـە و نەخـۆش کەوتنـی ئیلهـام بزانـێ، بۆیـە هـەر زوو دەسـتیان بـە خوێندنـی وانەکـە کـرد.

## باوەڕ بەکتێبە ئاسمانیەکان

+

| | |
|---|---|
| سێیەمین ئـەسـڵی ئـەرکـانی ئیمـان | بـاوەڕ بـە هەمـوو کتێبی ئاسمـان |
| لـە لایـەن خـوادا بـۆ پێغەمبـەران | بەواستەی جبریل گشت نازڵ کـران |
| قەدیمن وەک زات، بێ عەیب و نوقسان | عەدەد سەدو چوار، کەلامی خـودان |

+ بفەرموو قوربان گیان.

- سیـڕاج گیـان، سێیەمین ئـەرکان لەئیمانـدا ئەوەیـە کەبـاوەڕ بکـەی بەهەمـوو کتێبـە ئاسمانیەکان، کـەوا خـودا هەموویانـی بەجوبڕائیلـدا نـاردووە بـۆ پەیامبەرانـی خـۆی و گشـتیان گفتوگـۆی خـودان.

ئـەم گفتوگۆیانـە وەکـو خـودی خـوا قەدیمـن و نەبوونیـان لـێ پێـش نەکەوتـووە، واتـا هـەر هەبـوون، چـون مـادام سـەلماندمان کـە خـودا هـەر هەبـووە دەبـێ گفتوگۆکانیشـی هـەر هەبـوو بـن.

هەروەهـا ئـەم گفتوگۆیانـە لەبابەتـی پیـت و دەنـگ نییـن، کەپێشـتریش لێـی دوایـن، وەلـێ خوێندنـەوەی ئێمـە بـۆ ئـەم گفتوگۆیانـە بەپیـت و دەنگـە.

ئینجـا کوڕەکـەم هیـچ نەنگـی و ناتەواویـەک لـەم گفتوگۆیانـە نادۆزرێتـەوە، هـەروەک خـوای گـەورە لەبـارەی قوڕئـان دەفەرمـوێ: ئـەم قوڕئانـە هیـچ گومانێکـی تێـدا نییـە، کـەوا مایـەی ڕێنموونیـە بـۆ خواناسـان و پارێـزکاران[٢٠٢].

هەروەهـا زانایـان دەفەرمـوون ئـەم گفتوگۆیانـە ژمارەیـان (١٠٤) کتێبـە، لـەم سـەدو چـوارە، (١٠) دانـە هاتـووە بـۆ پەیامبـەر ئـادەم و (٥٠) بـۆ پەیامبـەر شـیس و (١٠) بـۆ پەیامبـەر ئیبڕاهیـم و هـەروا (٣٠) دانـە بـۆ پەیامبـەر ئیدریـس. ئـەم سـەد کتێبـە پێیـان دەگوتـرێ (سـوحوف).چوارەکەی تریـش ناوەکانیـان زۆر بـەر بـڵاوە، (زەبـور) بـۆ پەیامبـەر داود، (تـەوڕات) بـۆ پەیامبـەر موسـا، (ئینجیـل) بـۆ پەیامبـەر عیسـا، هەروەها بـۆ پەیامبـەری خۆشەویسـتمان (قوڕئـان) نێـردراوە، کـەوا بڕیـاری کتێبەکانـی تـری پێـش خـۆی نەهێشـتووە و ئـەوان ئێسـتا کاریـان پـێ ناکـرێ جگـە لەقوڕئـان، چونکـە ئەوانـی تـر بـۆ کات و سـەردەمێکی دیـاری کـراو بـوون، وەلـێ قوڕئـان کۆتـا کتێبـی ئاسـمانیە و تاکۆتایـی ژیـان کاری پـێ دەکـرێ.

---

٢٠٢- سووڕەتی بەقەڕە ، ئایەتی ٢.

- بڕۆ سەر بابەتی دواتر.

+ **باسی قورئانی پیرۆز**

قــورئـانــی پیرۆز کــەلامی خــوایە بۆ نەبی ئەحمـــەد، ڕەوان کـرایە

لـەوەوە فێربوون هــاوەڵانی گــشــت تاوەکو ئەمڕۆ هاتوە پشت بە پشت

هەروەک خۆیەتی و ناکرێ دەسکاری چــون دەیپارێزێ ئەو زاتی بــاری

+ بفەرموو مامۆستا.

- کــوڕی خــۆم قورئانــی پیــرۆز گفتوگــۆی خــودای گەورەیــە و بــۆ پەیامبــەری خۆشەویستــمان نێــردراوە، کتێبەکانــی تــر وەکــو زەبــورو ئینجیــل و تــەوڕات لەپــاش نەمانــی پەیامبــەرەکان وەکــو خۆیــان نەماونەتــەوە و چەنــد کەســانێک بەهــەواو هەوەســی خۆیــان دەســتکاریان کــردن و گۆڕیانــن. گــەر بیــان خوێنیتــەوە بەئاشــکرا هەست دەکـەی کەزۆرێـک لەدێـڕەکان گوتـەی خـودا نییـن و مـرۆڤ نووسـیونی. وەلێ دەربـارەی قورئانـی پیـرۆز خـودا فەرموویەتـی ئێمـە قورئانمـان ناردۆتـە خـوارەوەو هـەر ئێمــەش دەیپارێزیــن[٢٠٣].

ئینجـا بزانـە کـوڕم، قورئانـی پیـرۆز لـە (لەوحـی مەحفـوز) نووسراوەتـەوە، کەدواتـر باسـی ئـەو لەوحـە دەکەیـن. پاشـان بـەدوو قۆنـاغ بـۆ خۆشەویسـتمان دابەزیـوە، قۆناغی یەکـەم: لەشـەوی قـەدر بـوو، کـەوا لـە لەوحـی مەحفـوز هێـنرا بـۆ ئاسـمانی دونیـا، هــەروەک خــودا دەفەرمــوێ: ئێمــە قورئانمــان ناردۆتــە خــوار لەشــەوی قــەدر[٢٠٤].

قۆناغـی دووەم: لەئاسـمانی دونیـا لـەڕۆژی دووشـەممەی (١٧)ی مانگـی ڕەمـەزان، کـە پەیامبــەر چــل ســاڵ بــوو جوبرائیــل بەفەرمانــی خــودا بــۆی هێنــا خــوارەوە، هــەروەک خــودا فەرموویەتــی: مانگــی ڕەمــەزان مانگێکــە کەقورئانــی تێــدا دابەزیــوە[٢٠٥].

جـا ئایـەت ئایـەت بەگوێـرەی ڕووداوەکان جوبرائیـل دایدەبەزانـد تاوەکـو بە(٢٣)سـاڵ هەمــووی تــەواو بــوو.

+ باشە قوربان بۆچی هەمووی بەیەکەوە دانەبەزی، بەڵکو هەرجارەی چەند ئایەتێ دەهات؟

---

٢٠٣- سوورەتی حیجر ، ئایەتی ٩.

٢٠٤- سوورەتی قەدر ، ئایەتی ١.

٢٠٥- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ١٨٥.

- ئەمە چەند حیکمەتێکی لەپشتە، خودای گەورە خۆی وەڵام دەداتەوە کە دەفەرمویێ: کافرەکان گوتیان بۆچی قورئان هەمووی بەجارێ نەهێنرایە خوارێ، ئێمەش دەڵێین بۆیە بەش بەش ناردمان تاوەکو دڵی تۆی پێ بەهێزبکەین بۆ ئەوەی لەماناکەی تێبگەی [٢٠٦].

بیرکەرەوە کوڕم، گەر ئەم هەموو ئایەت و بڕیارە بەجارێ هاتبا چۆن حاڵیان تێک دەچوو نەیان دەزانی کامیان بەجێ بێنن. وەلێ گەر بەش بەشبێ هەر جارەو دەتوانی ئایەتەکە جێبەجێ بکەیت و بەباشی لەبەری کەی و لێی حاڵی بی. دواتر ئایەتەکان بەگوێرەی ڕووداوەکان دادەبەزین، بۆیە خودای پەروەردگار بەش بەش دەینارده سەر دڵ و دەروونی پەیامبەرەکەی.

مامۆستا لێرە خەندەیەکی هاتێ و گوتی: تۆش پرسیاری کافران دووبارە دەکەیتەوە سیڕاج.

سیڕاج بەپێکەنینەوە: ئاخر قوربان ئاگادار نەبووم کافر وایان گوتووە دەنا نەمدەپرسی.

- باشە کوڕم بابێینەوە سەر باس، یەکەم ئایەت کەهاتە خوار باسی خوێندن و زانست بوو کە خودا فەرمووی: بخوێنە بەناوی ئەو خودایەی دروستی کردووی[٢٠٧]. وە کۆتا ئایەت کەدابەزی بریتی بوو لە: بترسن لەڕۆژێک کەتێیدا دەگەڕێنرێنەوە لای خوا [٢٠٨].

وە ژمارەی سوورەتەکانی قورئان (١١٤) سوورەتە، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٦٦١٦) ئایەتە.

+ باشە قوربان ببوورە، بادووبارە پرسیارێکی کافرانە بکەم، ئێمە چۆن بزانین ئەم قورئانە گفتوگۆی خودایە و وەکو کتێبەکانی تر دەسکاری مرۆڤی تیا نییە؟

- کوڕی خۆم وەڵامێکی کورت و پوختت دەدەمەوە، خودا خۆی فەرموویەتی: گەر ئەم قورئانە فەرموودەی کەسێکی تربا جگە لە خوا، جیاوازی و گۆڕانی زۆریان تێدا بەدی دەکرد [٢٠٩].

چونکە جگە لەخودا کەس شتی پەنهان نازانێ، بەم بۆنەوە لەهەواڵەکانیدا درۆ پەیدا دەبوو. وەبازێ لەگوتەکانی ناڕەوان و دوور لە ڕەوانبێژی دەبوون، چون

---

٢٠٦- سوورەتی فورقان ، ئایەتی ٣٢.

٢٠٧- سوورەتی عەلەق ، ئایەتی ١.

٢٠٨- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ٢٨١.

٢٠٩- سوورەتی نیسائ ، ئایەتی ٨٢.

عەرەبەکانی قورەیش لەشیعرو ڕەوانبێژیدا زۆر زۆر شارەزا بوون، ئەگەر ئەم قورئانە گوتەی مرۆڤێک با بێگومان زۆرترین ڕەخنەیان لە وشەو ڕستەکانی دەگرت و دەیان کردە مایەی گاڵتەجاری. وەلێ چونکە لەلایەن خوداوە بوو نەک هەر نەیانتوانی ڕەخنەی لێ بگرن، بەڵکو بەهەموویان دەستەوسان بوون کەتەنیا ئایەتێک لەوێنەی قورئان بێنن. وەکو خودا دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەو قورئانەی کەبۆ سەر بەندەی خۆمان دامان بەزاندووە، ئەوا ئێوەش سوورەتێکی وەک ئەو بێنن، هاوکارەکانیشتان بانگ بکەن جگە لەخودا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن [٢١٠].

ئەمە تەحەددایەکە تاکو ئەمڕۆش هەرکەسێ گومانی هەیە با چشتێکی ئاوامان بۆ بێنێ کە بەملیۆنان شوێنکەوتەی هەبێ لەهەموو وڵاتانی جیهان .

ئینجا هەر لەسەردەمی پەیامبەرەوە دەیان کەس قورئانی پیرۆزیان لەبەر کردووە و پارێزەری بوون. لەدوای ئەوانەوە شوێنکەوتە و شوێنکەوتەی ئەوانیش، بەدەیان لەبەر کەری قورئانی تیا بووە، کە بوار بۆ هیچ کەسێ نەبووە تەنانەت یەک پیتیش لەقورئان بگۆڕێ، وەک چۆن هاوەڵان لەپەیامبەرەوە فێری بوون تاوەکو ئەمڕۆ ئەم قورئانە پشت بەپشت هاتووە هەتا گەیشتۆتە ئێمە.

ئینجا کوڕی خۆم هەندێ ئایەت هەن پێیان دەگوترێ (دامەزراو و جێگیر)، چون واتایان ئاشکرایەو بۆ حەڵاڵ و حەرام و کاروباری ژیان هاتوون. وەلێ هەندێ ئایەت پێیان دەڵێن (وێکچوو) چون مانای جۆراوجۆر هەڵدەگرن، پێشتر لێی دواین و پێویست ناکا بیڵێینەوە.

ئینجا هەرکەسێ بێت و بەدڵی خۆی ئایەتەکانی خودا لەو مانا ئاشکرایەی هەیانە لابدا ئەوا بەڕاستی کارێکی خراپی کردووە و پەنا بەخوا لەم کارە. هەروەها ئەو کەسەش لەهەموو ئایەتەکاندا هەر مانای ئاشکرا وەرگرێ ئەگەرچی دژی ئایەتە دامەزراوەکان و عەقڵی عاقڵان بێ ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە نوقمی نێو فیتنە دەبێ و جیسم و لاشە بۆ خوای گەورە بڕیار دەدا. جا هەر ئایەتێ مانا ئاشکراکەی لەگەڵ ئایەتە دامەزراوەکان ڕێک نەدەکەوت ئەوا پێویستە ببرێتەوە سەر مانای ئایەتە دامەزراوەکان و بەشێوازێک مانا بکرێتەوە کە لەگەڵ خودا بگونجێ،

---

٢١٠- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ٢٣.

وەکو پێشتریش باسی ئەو ئایەتانەمان کرد کەمانا ئاشکراکەی جیسم و لاشەیان دەگەیاند بۆ خوا، گوتمان یان دەڵێین هەر خودا مانای تەواوی دەزانێ، یاخود بەمانایەک لێکی دەدەینەوە لەگەڵ گەورەیی خودا بگونجێ، هەروەکو زانایان لەم دوو ڕێگایە دەرنەچوون.

خودای گەورە بەخۆشەویستەکەی فەرمووە: بڵێ ئەگەر ئادەمیزادو جن کۆببنەوە لەسەر ئەوەی وێنەی ئەو قورئانە بێنن، ئەوا ناتوانن هەرچەندە هەندێکیان یارمەتی هەندێکیان بدەن [٢١١].

ئینجا کوڕی خۆم، خۆشەویستمان لەشوێنێکدا فەرموویەتی کە ئاسەواری ئیسلام نامێنێ وەکو چۆن ڕەنگی جل و بەرگ نامێنێ. هەتاکو وای لێدێ نازاندرێ ڕۆژوو چییە، نوێژ چییە، حەج چییە، زەکات چییە. شەوێک بەسەر قورئان دەڕوا کەوا یەک ئایەتیش لەسەر زەوی نامێنێ. کۆمەڵە خەڵکێ لەپیرەمێردو پیرەژن دەمێنن و دەڵێن گەیشتینە باب و باپیرانمان دەیان گوت هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەڵڵا و ئێمەش دەیڵێین.

کەوابوو ڕۆژێک دێ کەوا قورئان بۆلای خودا دەگەڕێتەوە و باوەڕیش وردە وردە لەدڵی مرۆڤەکان کز دەبێ. بۆیە هەمیشە ئێمە دەڵێین هەر قورئان بەرنامەی ژیانە و یاسای دەسکردی مرۆڤ کەلەبری قورئان بەکاربێ کردارێکی زۆر قێزەون و ناشیرینە، چون خودا دەفەرموێ هەرکەسێ داوەری نەکات بەو بڕیارەی خودا ناردوویەتیە خوارەوە ئەوا بەڕاستی لە بێ باوەڕانە [٢١٢]. ئەمەش لەبەر ئەوەی بەیاسای خودا ڕازی نییە.

ئینجا سیراج گیان، دەبێ موسڵمان دووربێ لەهەموو ڕێگایەکی نەشیاو و ناڕێک و دەست بگرێ بەقورئان و فەرموودەکانی خۆشەویست، وەکو فەرموویەتی لەدوای خۆم دوو چشتتان بۆ جێدێڵم، دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن، ئەوانیش قورئان و فەرموودەکانن.

- گەر پرسیارت نییە بڕۆ سەر بابەتێکی تر.

---

٢١١- سوورەتی ئیسرا ، ئایەتی ٨٨.

٢١٢- سوورەتی مائیدە ، ئایەتی ٤٤.

+ **باوەڕ بە پەیامبەران** +

ئەسڵی چوارەمین، تۆ هەتبێ باوەڕ   سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەر

لەچینی نێردا، مەعسووم لە تاوان   لەلایەن خـــــودا، کـراون ڕەوان

+ بفەرمووە قوربان گیان.

- سیراج گیان چوارەمین ئەرکانی ئیمان باوەڕکردنە بە پەیامبەرانی خوا، کەوا ژمارەیان لەفەرمووودەدا بە (١٢٤٠٠٠) هاتووە. جا ئەو پەیامبەرانە ئادەمیزادن و لەچینی نێرن، هەروا پارێزراون لەگوناهـ کردن و هیچ گوناهێکیان لێ ڕوونادا، لەلایەن خودا هەڵبژێردراون و ڕەوان کراون بۆسەر مرۆڤایەتی.

جا ناوی (٣٠) کەسیان لەقورئان و فەرمووودە زانراوە، (ئادەم، شیس، ئیدریس، نوح، هود، ساڵح، ئیبراهیم، لوت، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، ئەیوب، شوعەیب، موسا، هارون، یوشەع، ئیلیاس، ئەلیەسەع، زولکیفل، شەمعون، ئیشمویل، یونس، داود، سولەیمان، زەکەریا، یەحیا، عوزەیر، عیسا، موحەممەد )، سەلامی خودایان لەسەر.

ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ بۆ هەمـوو گەلێک پەیامبەرێکمان ناردووە تاوەکو پێیان بڵێن خوا بپەرستن و خۆتان بپارێزن لەپەرستراوی تر [٢١٣].

پاشان هەر پەیامبەرێ بەرنامەی لابێ و فەرمانی ڕاگەیاندنی پێ کرابێ بۆ گەلەکەی ئەوا پێی دەڵێن (ڕەسول)، هەروا (نەبی)شی بۆ بەکاردێ. وەلێ ئەگەر فەرمانی ڕاگەیاندنی پێ نەکرابێ ئەوا تەنها پێی دەوترێ (نەبی).

جا ڕەسولەکان ژمارەیان (٣١٣) پەیامبەرە، لەفەرموودەیەکدا بە(١١٥)ش هاتوون، خودای مەزن دەفەرمووێ: ئەم پەیامبەرانە ڕیزی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریان، واتا هەندێکیان پلەیان بەرزترە لەهەندێک [٢١٤].

لەو پەیامبەرانە پێنجیان زۆر گەورەنەو پێیان دەڵێن (ئولولعەزم )، هەروەک خودا بەخۆشەویستەکەی فەرمووە: باسی ئەو کاتە بکە کە بەڵێنمان لەهەموو پەیامبەران وەرگرت ئاینی خوا ڕابگەیەنن، وەبەڵێنیشمان لەتۆ وەرگرت، لە نوح و ئیبراهیم و

---

٢١٣- سوورەتی نەحل ، ئایەتی ٣٦.

٢١٤- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ٢٥٣.

عیسا و موساشمان وەرگرت [٢١٥].

ئینجا کوڕی خۆم ئەوەش بزانە کە پەیامبەر(موحەممەد) سەلامی خوای لەسەر، کۆتایی هەموو پەیامبەرانە و لەهەموو مرۆڤ و جن و فریشتەیەک بەڕێزترو گەورەترە.

سیراج گیان، پەیامبەران خاوەنی گەلێ پەرجۆن،[٢١٦]کەبریتیە لەکارێکی لەعادەت بەدەر، خودای گەورە لەسەر دەستی پەیامبەران دەیهێنێتە جێ تاوەکو بڕوایان پێ بکرێ کەداوای پەیامبەری دەکەن. وەکو نەسووتانی پەیامبەر ئیبراهیم لەئاگردا ئەو کاتەی پاشا زاڵمەکە خستیە ناوی، هەروا مردوو زیندووکردنەوەی پەیامبەر عیسا و لەتکردنی مانگ بەئاماژەی پەیامبەری ئێمە سەلامی خوایان لەسەر، وهتد..... کەهێندە زۆرن لەژمارە نایەن. خۆت دەتوانی لەقورئان و فەرموودەکاندا بگەڕێیەوە سەریان و پێویست نییە لێرە سەراپای بێژین.

ئەوەش بزانە کە پەیامبەران زیندوون و لەنێو گۆڕەکانیان نوێژ دەکەن، هەروەکو خۆشەویستمان فەرموویەتی، وەلێ هەر خوا دەزانێ ئەم زیندوو بوون و نوێژکردنە چۆنەو ئەمە کارێکی پەنهانە لەئێمە. هەروەها خودای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی کەوا جەستەی پیرۆزی پەیامبەران بڕزێنێ (سەلامی خودایان لەسەر).

- بەس بێ یان زیاتر بخوێنین؟

+ ئەو بابەتەش با بخوێنین، تا کات ماوە قوربان.

- باشە دەست پێ بکە.

+ **باسی کۆتا پەیامبەر**

| | |
|---|---|
| لەپاش حەزرەتی عیساوە دیسان | فریشتەی وەحی هاتەوە مەیدان |
| لەبۆ(موحەممەد)، (ئەحمەد) لەئاسمان | نەبی و ڕەسوولی ئاخیری زەمان |
| باوکی عەبدوڵڵا و دایکی ئامینە | لەهۆزی قورەیش، هات ئەم ئەمینە |
| پێنج سەدو حەفتاو یەک بوو ئەم ساڵە | دەرکەوت لەمەککە ئەو جوان جەماڵە |

+ جا بفەرموو مامۆستا گیان.

٢١٥- سوورەتی ئەحزاب ، ئایەتی ٧.

٢١٦- پەرجۆ: موعجیزە.

- لەپاش نەمانی پەیامبەر عیسا سەلامی خودای لێبێ جارێکی تر فریشتەی سروش هاتەوە مەیدان و پەڕەی کتێبێکی تری هەڵگێڕایەوە کەقورئانی پیرۆزە بۆ پەیامبەر (موحەممەد) لەسەر زەمین و (ئەحمەد) کەهەر ناوی ئەوە لەئاسماندا کەوا پەیامبەرو نێردراوی کۆتایی زەمانەو لەدوای ئەو پەیامبەری تر نایێ، سەلامی خودای لێبێ. وەکو خودا فەرموویەتی کە ئەو پەیامبەری خوایەو کۆتایی و تەواوکەری پەیامبەرانە[217].

باوکی ناوی (عەبدوڵا)ی کوڕی (عەبدولموتەلیب)ە، و دایکی ناوی (ئامینە)ی کچی (وەهەب)ە، لەهۆزی قورەیش ئەم پەیامبەرە ئەمینە پەیدابووە.

ڕۆژی دووشەممەی (١٢)ی مانگی (ڕەبیعول ئەوەل) لەساڵی فیل کەساڵی (٥٧١) ی زایینی بوو لەشاری مەککە ئەو ڕابەرە لەدایک بوو. لەتەمەنی (٤٠) ساڵیدا لەڕۆژی دووشەممەی (١٧)ی مانگی ڕەمەزان کرایە پەیامبەرو جوبرائیلی فریشتە چەند ئایەتێکی قورئانی بۆ هێنا خوارێ.

(١٣) ساڵ لەشاری مەککە پەیامبەرایەتی کرد، پاشان بۆ شاری مەدینە کۆچی کردو لەوێش (١٠) ساڵ مایەوەو دواتر لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا، لەڕۆژی دووشەممەی (١٢)ی (ڕەبیعول ئەوەل) لەهەمان ئەو مانگ و ڕۆژەی کەتێیدا لەدایک بوو، کۆچی دوایی کردو ئەم ئاینە جوانەی بەتەواوی و کامڵی جێهێشت.

دواتر هەر لەنێوماڵەکەی خۆیدا لەژووری خاتوو عائیشەی خێزانی لەشاری مەدینەی پیرۆز ئەم نوورو سەروەرە نێژرا.

+ باشە قوربان گەورەترین پەرجۆی ئەم خۆشەویستەمان چی بوو؟

- پەرجۆکانی لەژمارە نایەن و گەلێ زۆرن، وەکو لەتکردنی مانگ بەئاماژەی دەستی، هەروەها قورئانی پیرۆز کە گەورەترین پەرجۆیە بۆ ئەو، چون پەرجۆیەکی بەردەوامەو تا کۆتایی دونیا دەمێنێ و تەحەددای مرۆڤایەتی دەکا کەناتوانن چشتێکی لەم چەشنە پڕ ڕەوانبێژیە بنووسن.

بیرکەرەوە کوڕم، هەموو دەزانن خۆشەویستمان کەسێکی نەخوێندەوار بوو، نە دەیزانی چشتێک بخوێنێتەوە نە بشنووسێ. لەم دەشت و سارای عەرەبستانە لەدایک بووەو هەموو قورەیشیەکان دەیان ناسی کەڕۆژێ لەڕۆژان تەنیا دێڕە شیعرێکیشی نەگوتووە و نەنووسیوە.

٢١٧- سوورەتی ئەحزاب ، ئایەتی ٤٠.



کەسێکی یەتیمی بێ باوک و دایک، کەهەموو کەسە نزیکەکانی لەدەست داوە و مامێکی پیری هەیە بەناوی (ئەبوتالیب) دەیگرێتە خۆی و بەخێوی دەکا، کەگەورەش دەبێ ڕۆژێ لەڕۆژان کەسێ کارێکی خراپی لێ نابینێ، کەس درۆیەکی لێ بەدی ناکا، بە ڕاستگۆی دەستپاک ناسراوە.

تخوا چشتێکی لۆژیکیە تۆ بڵێی کە خۆی ئەم قوڕئانەی داناوە و ڕێکی خستووەو درۆ دەکا! پەنا بەخوا، باشە کەسێک کەخوێندەواری نەبوو چۆن چشتێکی وای دانا کە هەموو قورەیشی سەرسام کرد لە بەلاغەت و ڕەوانبێژیەکەی. بەڵکو تەحەددای گشت مرۆڤایەتی کرد؟ کەسێک کە تا چل ساڵی درۆیەکی لێ نەبیسترابێ، ئێستا لەم تەمەنەدا چ ناچاریەک وادەکا بێ و چشتێکی وا ڕێک بێخێ؟ خۆ ئەگەر بۆ دەست کەوتنی دونیای بووایە ئەوا قورەیش ئامادەبوون بیکەنە گەورەی خۆیان و کام کچەش بەدڵیەتی بیدەنێ تەنیا واز لەم کارە بێنێ. وەلێ ئەو پەیامبەری خوایەو پەیامێکی وای پێیە کەتا ڕۆژی پەسڵان بەملیۆنان کەس شوێنکەوتەین.

ئینجا بزانە کوڕم، کاتێ پەیامبەر عیسا لەکۆتایی دونیادا دێتە خوارەوە لەسەر ڕێگاو بەرنامەی ئاینی ئیسلام ڕەفتار دەکا نەک بەرنامەیەکی تایبەت بەخۆی لابێ.

لەلایەک پەیامبەر بەدیمەن جەستە و ماددەیە و سیفەتی ماددەی هەیە وەکو خواردن و نوستن و ساغی و ناساغی و هتد..... ، لەلایەکی تر نوورو ڕووناکیە بۆ سەرتاپای خەڵک. وەکو خودا دەربارەی فەرموویەتی: بەڕاستی لەلایەن خواوە نوورێکی ئاشکراتان بۆ هاتووە هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی ڕوون کەرەوە کەقوڕئانی پیرۆزە[٢١٨].

بۆیە ئێمە ناتوانین ستایشی کەسێک بەتەواوی بکەین کەخودا بەم گەورەییەوە ستایشی کردبێ.

ئینجا ئەوەش بزانە کە باوک و باپیری پەیامبەری خۆشەویست، چ لەسەری دایکی و چ لەسەری باوکی تاکو دەچێتەوە سەر ئادەم و حەوا کەدایک و باوکی مرۆڤایەتین، لەهاوبەش بۆ خودا دانان و کافری پاک بوونە. وە ئەگەر ڕەخنەگرێک بڵێ لەقوڕئاندا هاتووە کەئازەری باوکی پەیامبەر ئیبراهیم کافر بووە، ئەوا وەڵامی دەدەینەوە و دەڵێین کە ئازەر مامی پەیامبەر ئیبراهیم بووەو لەبەر ئەوەی لای مامی بووە بۆیە هەر بەباوک بانگی کردووە ، وەکو زانایان فەرموویانە.

---

٢١٨- سوورەتی مائیدە ، ئایەتی ١٥.

وە دایـک و باوکـی خۆشەویسـتمان لەسـەر ئاینـی پەیامبـەر ئیبراهیـم بوونـە و داواکاری ئیسـلامیان پـێ نەگەیشـتووە، چونکـە زوو کۆچـی دواییـان کـردووە. خـودای گـەورەش فەرموویەتـی کـە ئێمـە کـەس سـزا نادەیـن تاوەکـو پەیامبەریـان بـۆ نەنێریـن [٢١٩].

جا ئەمانـە پێیـان دەگوتـرێ کۆمەڵی(فیتـرە) کـەوا لەسـەردەمی نێـوان پەیامبەرەکاندانە، یـان لەسـەردەمی پەیامبەرێکـدان کەبـۆ ئـەوان نەنێـردراوە، خـودای گـەورە ئـەو جـۆرە کەسـانە سـزا نـادا وەکـو لەئایەتەکـەش دیـارە.

هەروەهـا خۆشەویسـتمان خـۆی فەرموویەتـی: لەکاتێـک خـوای گـەورە ویسـتی دروسـتم کا لەباشـترین دروسـتکراوی خـۆی دروسـتی کـردم، ئینجـا کەهۆزەکانـی دروسـت کـرد منـی لەباشـترین هـۆز دروسـت کـرد، وەکاتێـک گیانـی دروسـت کـرد گیانـی منـی کـردە باشـترین گیـان، ئینجـا کەبنەماڵـەی دروسـت کـرد منـی لەباشـترین بنەماڵـە دروسـت کـرد، کەوابـوو مـن لەلایەنـی بنەماڵـە و گیـان باشـترینم.

کەوایـە هەرگیـز دایـک و باوکـی پەیامبـەر بـت پەرسـت و هـاوەڵ بڕیـاردەر نەبـوون، وەکـو هەنـدێ کـەس دەیڵێـن.

جابزانــە خێزانەکانــی پەیامبــەری خۆشەویســت دایکــی باوەڕدارانــن، یەکەمیــن و گەورەتریـن خێزانـی خاتوو(خەدیجە)یـە (خـوا لێی ڕازی بـێ). هەروەها کە خۆشەویست کۆچـی دوایـی کـرد (٩) خێزانـی لـەدوا جێـما کەئەمانـەن (سـەودە، عائیشـە، حەفسـە، ئـوم حەبیبـە، ئـوم سـەلەمە، زەینـەب، جوەیریـە، سـەفیە، مەیمونـە ) (خـودا لێیـان ڕازی بـێ). هەروەهـا (٣) کـوڕی هەبـوو، (عەبـدوڵا، قاسـم، ئیبراهیـم)، کەهـەر سـێکیان بەمناڵـی کۆچـی دواییـان کـرد، وە (٤) کچـی هەبـوون( زەینـەب, ڕوقیـە, ئـوم کەلسـوم, فاتیمـە )، جـا فاتیمـە خێزانـی پێشـەوا (عەلـی) ە و دایکـی (حەسـەن و حوسـەین )ە خـوا لێیـان ڕازی بـێ. هـەروا (١٢)مامـی هەبـوو کـە تەنیـا دوویـان موسـڵمان بـوون، ئەوانیـش پێشـەوا(حەمزە) و پێشـەوا (عەبـاس) ن.

- پێم وابێ ئیتر ئەوەندە بەس بێ و تۆش کاتت نەماوە.

+ ڕاست دەکەی قوربان گەر مۆڵەتتان لەسەر بێ ئیدی دەبێ من بڕۆم.

- بفەرموو کوڕم، نزای بەخێرمان بۆ بکە.

---

٢١٩- سوورەتی ئیسرا ، ئایەتی ١٥.



مەولـەوی وەڕێ کـەوت بـۆ قوتابخانـە، وەلـێ لەڕێـگادا چـی بینـی! دووبـارە هەمـان گەنـج کەنزیکـەی دوو هەفتـە لەمەوبـەر گێچەڵـی پـێ کردبـوو، لەگـەڵ هاوڕێیەکـی بـەرەو ڕووی هاتـن و بەریـان لـە پایسـکلەکەی گـرت، وا دیـارە ئەمانـە لێـی بـوون بـە بنێشـت و وازی لـێ ناهێنـن. مەولـەوی لەشـوێنی خـۆی چەقـی و خێـرا بەدەنگێکـی بـەرز هەڵـی دایـێ:

+ دووبـارە تـۆی؟ هێـی بزانـە مـن هیـچ کێشـەیەکی تایبەتیـم لەگەڵتـا نییـە و ناتناسـم، هـەوڵ مـەدە لەمـە پـتر پـێ ڕاکێشـی.

گەنجەکـە ئـەو کاتـەی تـەواو نزیـک بوویـەوە وەدەنـگ هـات: بەڵـێ هەمانـە چـۆن نیهانـە، تـۆ واتکـرد ئیلهـام منـی خـۆش نـەوێ، لەپێـش ئـەو بەبۆکـز لێمـت دا، دواتـر لەگەڵـی دەرچـووی و هـەر خـوا دەزانـێ بـەرەو کـوێ ڕۆیشـتن، لەوەیـە هـەر لەبـەر تـۆش بـێ لەئێمـە نەڕوانـێ.

+ ئێـوەو سـەدەهای وەکـو ئێـوە کەنازانـن خۆشەویسـتی چییـە واتـان کـردووە خەڵـک ڕقـی لەنـاوی خۆشەویسـتی بێتـەوە و ڕێـک لەگـەڵ هێنانـی ئـەم نـاوە خەیاڵـی بـۆ پەیوەنـدی ناشایسـتە و حـەڕام و هەرزەکارانـە بـڕوا. بـڕۆن و ڕێـگای خۆتـان بگـرن، چـون مـن مرۆیـەک نییـم مەیلـم لەشـەڕ بـێ.

یەشـتا قسـەکانی تـەواو نەکردبـوو لاوەکـە پـڕی دایـە جانتاکـەی کـە لەنێـو سـندووقی پایسـکلەکەدا دابنابـوو، لەگـەڵ ڕفاندنـی جانتاکـەدا هـەردوو تێیـان تەقانـد و مەولـەوی دوایـان کـەوت. نزیکـەی دەقیقەیـەک لـە سـەروەدونانیان کتێبەکانیـان لەسـەر زەوی پـەرش و بـڵاو کـردو بـۆی دەرچـوون.

لـەو دەمـەی کـە مەولـەوی بەحەزینـی مژووڵـی کۆکردنـەوەی کتێبەکانـی بـوو لەسـەر خۆڵەکـە ، بیـری کەوتـەوە نامەکـەی لەنێـو جانتاکـە دانابـوو چـی لێهاتـووە؟ تـەواوی کتێبەکانـی کۆکردنـەوە وەلـێ نامەکـەی بەرچـاو نەکـەوت. تـۆزێ بـەرەو ئـەولا، تۆزێکـی تـر بـۆ ئەمـلا، تـۆ بڵێـی بـا دووری نەخسـتبێتەوە؟ نەخێـر بوونـی نەبـوو! تـەواو چوارچـاو بـوو بـوو[٢٢٠]. نزیکـەی دە دەقیقـە نەیدەتوانـی ئـەم شـوێنە جـێ بێڵـێ، چـون ئـەم نامەیـەی بـۆ سـەناریا نووسـیبوو، زۆری خۆشدەویسـت. سـەرەڕای ئـەوەش نەیدەویسـت کـەس تێـی بڕوانـێ و بیخوێنێتـەوە.

---

٢٢٠- چوارچاو بوون: سەرلێ شێوان.

سەرەنجام نەیدۆزیەوە و بەخەمباری بەرەو قوتابخانە چوو. تاکە چشت کە ئۆخژنی دەکردەوە نوسخەیەکی تری لەنامەکە لەماڵەوە هەبوو، وەلێ ئەو نوسخە نوێیەیان تۆزێ دەسکاری کردبوو، چاکی کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕۆژە چارەگێک لەوانەی یەکەم ڕابوردبوو کەگەیشت، وەلێ خەیاڵی نامەکە هەموو بیرەکانی دی پێ پاماڵ[221] کردبوو.

ئەو ڕۆژە خۆش تێنەپەڕی بۆ مەولەوی، هەر بەخەمباریش گەڕایەوە ماڵێ، چون نەیدەزانی ئەو نامەیە چی لێهاتووە و دەستی کێ کەوتووە.

ئەو شەوە بەسەختی توانی بخەوێ، بۆ بەیانی وەکو هەموو ڕۆژان خۆی ئامادە کردەوە بۆ قوتابخانە و سەرەتا بەرەو ماڵی مامۆستا وەڕێ کەوتەوە و لەدەرگای دا.

+ بیکەرەوە قوربان، قوتابیەکەی خۆتە.

- من قوتابی لەو شێوازەم ناوێ.

مەولەوی بەم گوتەیە کەوتە خەندە، چون جارجار مامۆستا شۆخی دەکرد لەگەڵی، بۆیە خێرا هاتەوە دەنگ: قوربان گەر زوو لێمی نەکەیتەوە درەنگ دەکەوم، خۆت دەزانی هێندە کاتمان لەبەردەست نییە.

ئەمجارەیان مامۆستا تۆزێ توند تر کەوتە گۆ: سیڕاج، من هەر بەڕاستمە کە قوتابی وەکو تۆم ناوێ، بۆیە خێرا ئێرە جێ بێڵە و ماندووم مەکە لەوە زیاتر.

ئەم گوتەیە وەکو تیرێکی سامناک لەدڵی مەولەویدا ڕۆچوو، چون ئەو شێوازە قسەکردنە هی شۆخی کردن نییە، بۆیە تۆزێ بێ دەنگ و سەراسیمە ما ! لەپڕدا بێدەنگیەکەی شکاند و هاتەوە دەنگ: هیچ چشتێ بووە قوربان؟ من نازانم چی ڕوویداوە؟ تکایە گەر چشتێ هەیە پێم بێژن؟

مامۆستا دەرگاکەی والاکرد، وەلێ تۆزێ سوور هەڵگەڕابوو، لەژیانیدا مامۆستای بەم چەشنە نەدی بوو. هەر زوو ترس جەستەی مەولەوی داگرت و زاری نەهاتەوە گۆ.

- ئەم نامەیە تۆ نووسیوتە؟

+ وەلێ قوربان..... ئەمە چۆن بەدەستی تۆ گەیشت !

- هیچ مەڵێ، تەنێ دڵنیام کەرەوە کەتۆ نووسیوتە یان نا؟ لەوەندە پتر مەیە گۆ.

---

٢٢١- پاماڵ: پێشێل.

+ بەڵێ من نووسیومە.

- کەوایە بڕۆ و چیتر دەرس ناخوێنین.

+ وەلێ قوربان ڕێگەم بدە تا ڕوون کردنەوەیەک بدەم لەم بارەیەوە.

- بڕۆ سیراج، خۆشم دەوێی و نامەوێ ڕقت لێ هەڵگرم، بۆیە خێرا لێرە بڕۆ.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا مامۆستا دەرگاکەی بەڕووی مەولەوی گاڵەدا[222] و ئەویش وەکو کەسێکی سامگرتوو لەپشتی دەرگاکە مایەوە و بەئەسپایی و بەنەرمی ئەسرینی چاوانی دادەبەزین.

مەولەوی لەو دەمەیدا نەیدەزانی کەبۆ لەدەست چوونی خوێندنەکەی دەگری یاخود لەبەر ئەوەی مامۆستا بەکارەکەی زانیوە و لێی تووڕە بووە. لێ هەستی کرد ئەم جارەیان هی لەدەست چوونی زانستە.

دوای مووددێ وەستان لەبەر دەرگا وای بەهزردا هات ئەگەر نەڕوا وانەی قوتابخانەکەیشی لەکیس دەچێ. بۆیە بەغەمباری و چاوی تەژی لەئەسرینەوە وەڕێ کەوت و لەبەر خۆیەوە دەدوا: ئای خودایە، تۆ بڵێی من چشتێکی زۆر هەڵەم کردبێ کەمامۆستام ئاوا تووڕە کرد. ئاخر من چ خەتایەکم هەیە لەخۆشویستنی سەناریادا، سوێند بەگەورەیی تۆ لەدەستی خۆمدا نییە، دیسان سوێند بەشکۆمەندی تۆ ئەم عیشقە کارێک نییە تێیدا سەرپشک بم. وا مامۆستاشم لەدەست چوو لەدوای لەدەست دانی سەناریا، ئاخر دەبێ خاوەنی چ هەڵەیەک بم کەئاوا بێ بەشم لەعیشق و لەزانستیش. سەد شوکر بۆتۆ خوایە، سەد شوکر، قاپیەکی دیکە شک نابەم لەقاپی بەزەیی تۆ پتر.

ئاخر ئەم نامەیە چۆن بەدەستی مامۆستا گەیشت، دڵنیام لەوێم جێ نەهێشتبوو، چون دەرم نەکردبوو لەجانتاکەدا. باشە تۆ بڵێی ئەو گەنجە نەیبردبێ و بەمامۆستای نیشان نەدابێ؟ ئاخر ئەو بۆچی کارێکی وادەکا، ئەگەر ئەو وای کردبێ گەردنی ئازاد ناکەم. وەلێ خۆ بڕیارم دابوو کە گەردنی هەموو کەس ئازاد بکەم، ئەی باشە دەبێ چی بکەم خوایە؟!

باشە دڵنیام لەو نامەیە چشتێکی وام نەنووسیوە کەمامۆستا هێندە پێی تووڕە بوو. دەبێ چشتێکی دی هەبێ و من نەیزانم، بەڵێ بێگومان دەبێ چشتێکی دی هەبێ.

---

٢٢٢- گاڵەدان: داخستنی دەرگا.

خۆ چەند ڕۆژێکە ئیلهامم لەوێدا نەدیوە، لەوەیە خەڵک توانجیان لێدابن و نارەحەتیان کردبن، یان لەوەیە ئەم کچە بەهۆی منەوە شتێکی لێ هاتبێ بۆیە مامۆستا هێندە تووڕە بوو، ئاخر ئەویش مرۆڤە و بەرگەی هەندێ شت ناگرێ.

ئەو ڕۆژە مەولەوی تەنێ جەستەکەی لەقوتابخانەدا وجوودی هەبوو، تووڕەبوونی مامۆستاو چۆنیەتی بەدەست گەیشتنی نامەکەی بەو تەواو کاسەی سەریان سیخناخ[٢٢٣] کردبوو.

ئارای جوانکیلە کاتێ گەیشتە ئەم شوێنە تێبینی کاغەزێکی بچووکی کرد کەلەنێو پەڕەکاندا دانرابوو. ئەو کاتەی بەرزی کردەوە ڕوانی لێی نووسراوە ( سڵاو ئارا گیان، ماندوو نەبی کوڕی شیرینم. دەزانم دەمێکە خەریکی خوێندنەوەی، زۆرت هێناوەو کەمی ماوە، وەلێ مەرج نییە هەمووی بەسەر یەکەوە بخوێنیتەوە، چاوانیشمان سپاردەی خودان و دەبێ زیاد لەپێویست ماندوویان نەکەین. دەمەوێ بڵێم بەم زووانە بەکوڕێک دەگەی بەناوی (ڕەنج)، ئەم ناوەت بیر نەچێتەوە، هاوڕێیەکی دڵسۆزبە بۆی، دڵخۆشم کەوەها هاوڕێیەک دەناسی ).

ئەم گوتەیە تەواو ئارای سەراسیمە کرد، دووبارە ڕەنج ! باشە ئەو ڕەنجە کێیە کەمن نایناسم ! چەند جارێک لەبەر خۆیەوە ناوی هێناو لەبەر خاتری گوتەکەی باوکی دوای تۆزێ خواردن و پشوویەکی کورت دەستی بەخوێندنەوە کردەوە:

سیڕاجی مەولەوی گەڕایەوە ماڵێ، وەلێ ئەو ڕۆژە هیچی بۆ نەخورا، ئەوەندەی خاتوو ڕەحمە بانگی کرد بۆ نان خواردنی ئێوارە لەشوێنی خۆی نەبزووت.

ئەو شەوە وەکو هەموو شەوان بەرەو مزگەوت چوو، ئەو دەمانەی لەنێو قوتابییەکانی وەڕێی دەکرد بەتایبەتی بینینی ئەحمەد ئارام کەرەوەیەکی باش بوو بۆی.

چاوانی بێ گوناهی ئەو منداڵە وەکو تەلیسمێ[٢٢٤] دڵی سیڕاجیان دەگرت و سەنارییایان دەخستەوە یادی. بەڵام ئەو شەوە دووبارە حەزینیەکی تاقەت پڕوکێنی لەچاوانی ئەحمەد بەدی کرد. دیاربوو ئەم منداڵە خراپ لاواز و ڕەنگ پەڕیو بووە.

+ دیسان چی بووە ئەحمەد گیان، بەپەشێوی دەتبینم؟

---

٢٢٣- سیخناخ: پڕبوونی شتێک لەشتێکی تر.

٢٢٤- تەلیسم: جادوو.

ئەحمەد خێرا چاوانی تەڕی بوون لەئەسرین، کەهێندەی دی دڵی سیڕاجیان دەرهێنا. ئاخر گوناهە ئەم چاوە پاک و بێ گوناهانە بزانن خەمباری چییە. بەدەنگێکی کزۆڵەوە گوتی: دیسان مامم هاتبوو لەگەڵ باوکم بووە شەڕیان، گەر دراوسێکان نەگەشتبان لەوانەبوو ئەنجامێکی خراپی هەبێ مامۆستا.

مەولەوی کە لەمزگەوت تۆزێ ئارامی دەست کەوتبوو بەم گوتەیەی ئەحمەد ئەوەشی لەدەستدا. هێندەی دی ناڕەحەتی سەر دڵی تەنی، پرزەیەکی دوورو درێژی هەڵمژی و هیچی تری نەگوت، لەکاتێکدا لەناوەوە خەریک بوو خۆی دەخواردەوە.

ئەو شەوە بۆ دەقەیەکیش خەو نەچوویە چاوانی، جاران گەر تەنێ خەمی سەناریا بوو ئێستا مامۆستاو ئەحمەدیش بارێکی دیکەن.

بۆ بەیانی وەڕێ کەوتەوە بۆ قوتابخانە، وەلێ ئەم جارەیان دڕدۆنگ[225] بوو لەچوونە لای مامۆستا. هەرچۆنێ بوو بڕیاری چوونی دا، بەڵکو سەرەنجامێکی باشی هەبێ، دووبارە لەدەرگای دایەوە و دەنگی مامۆستا لەپشتی دەرگاکەوە هات.

- کێیە؟

+ منم قوربان سیڕاج، ڕەنگە قوتابیەکی خراپ بووبم، وەلێ هەرگیز ناتوانم دەسبەرداری وانەکە بم، تکات لێ دەکەم لێم خۆشبە.

- سیڕاج نەمگوت مەیەرەوە، دیارە حەزت لێیە تووشی خەمباریم بکەی. گەر واز نەهێنی ناچارم دەکەی ڕێگای دیکە بگرم.

ئەم جارەیان سیڕاج خۆی نەگرت ولەهارژنی[226] گریانێی دا: ئاخر چیم کردووە قوربان، بۆچی بێ بەشم دەکەی لەزانستەکەت؟ سوێند بەیەکتای مەزن ئەم عیشقە دەستی منی تیا نییە. ئاخر لەخۆشویستنی کەسێکدا چ تاوانێ هەیە ئوستادەکەم؟ بەم وانەیە تۆزێ دڵخۆش بووم بۆچی لێم دەسەنی قوربان؟ ئاخر منێکی لاواز چۆن بەرگەی ئەو هەموو خەمە دەگرم؟

تۆ چەندین جار هۆنراوەکەی پێشەوا(بوسیری)ت خوێندۆتەوە کە لەیەکێک لەدێڕەکانی دەفەرموێ:

---

٢٢٥- دڕدۆنگ: دوودڵ.

٢٢٦- هارژن: هاوار.

ئەی ئەو کەسەی لۆمەم دەکەی
لەسەر عیشقێک...
کە هەروەکو هۆزەکەی عوزریە وایە
دادپەروەر بەو لۆمەم مەکە
دە پێم بڵێ کە کەی عیشق
لەژێر توانای مرۆڤ دایە.

لەگەڵ هەموو ئەو قسانەی مەولەویدا مامۆستا نقەیەکی نەکرد. وەلێ ئەویش لەودیوی دەرگاکە هەستی بەئازارێکی بێ وێنە دەکرد لەدڵ و دەرونیدا، چون سیڕاج تاکە فێرخوازی خۆشەویستی بوو.

لەپڕدا مەولەوی چاوی بە ئیسڕای کچی بچووکی مامۆستا کەوت لەبەر دەرگا، خێرا خۆی گەیاندێ و لێی پرسی: ئیسڕا گیان تخوا پێم بێژە باوکت بۆ وا لێم توورەیە، هیچی نەدرکاندوە لەماڵێ؟

- کاکە سیڕاج دوێنێ کوڕێک هاتە لای باوکم، هەموو خەتای ئەو بوو، من تەواوی قسەکانیانم ژنەوت.

+ دەی تخوا پێم بێژە چی گوت؟

- سەرەتا نامەیەکی لەباخەڵی دەرکردو نیشانی باوکمی دا، وە گوتی سیڕاجی فێرخوازت بەدوای کچانەوەیە، ئەگەریش بڕوا ناکەی ئەم نامەیە بخوێنەرەوە کەدەسنووسی خۆیەتی، لەگەڵ ئەوەش چەندین جار لەگەڵ ئیلهامی کچتدا بینیومن بەیەکەوە و بوونەتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵک. سەرەڕای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ کچەکەت هەیە نامە بۆ ئی دیکەش دەنووسێ و ئەوەش یەکێکە لەنموونەکان کەبۆ خوشکی منی نووسیوە. هەروەها گوتی گەر زوو لای خۆت دەری نەکەی لەوەیە بەخراپ لەتۆش بڕوانین و تووشی کێشە بی، ئیدی چووزانم هەر لەو قسانەی دەکردن.

باوکم لەو دەمەوە زۆر بێ تاقەتە، نانیش کەم دەخوا، نازانم سیڕاج کەتۆ بەڕاستی وایت یاخود نا؟ سەرم سوڕماوە !

سیڕاج بە ژنەوتنی ئەم گوتانە تەواو هێدمە بوو،[٢٢٧] دەتگوت خوێن لەسەرپاکی دەمارەکانی ڕەق بووە. چۆن مرۆی واش هەیە کەئەم هەموو درۆو بوختیانە بئافرێنێ؟ بەچاوی پڕ ئەسرینەوە هاتە گۆ: ئیسڕا ئەمە دوورە لەڕاستی دڵنیابە، تۆ چۆن بیردەکەیتەوە من وابم؟

- نازانم، من بەمرۆیەکی باشت لێ دەڕوانم، وەلێ گەر قسەکانی ئەم کوڕەت ژنەوتبا خۆشت لەخۆت بەگومان دەبووی دڵنیابە. ئیدی منیش ناحەقم نییە کەدڕدۆنگ بم لێت. واچاکە ئەمڕۆش بڕۆیت، هەفتەی دابێ کەهاتیەوە دڵنیابە ئەویش بیرت دەکاو وەرت دەگرێتەوە، چون زۆر بێ تاقەتە بۆت.

+ باشە وادەکەم، ئەمڕۆش دەڕۆم نەبادا بێزاری بکەم، وەلێ تا هەفتەیەکی تر خۆ ناگرم، ڕۆژی شەممە دێمەوە و هەموو چشتێکی بۆ ڕوون دەکەمەوە.

مەولەوی دووبارە وانەی بیروباوەڕەکەی لەکیس چوو، هەستی دەکرد ئەو دوو ڕۆژە تەواو بێ ئاگا بووە لەقوتابخانەش، تەنانەت نەیدەتوانی ئەوەندە بیر لەسەناریاش بکاتەوە سەری وەژان دەکەوت.

بەیانی ڕۆژی هەینی بڕیاریدا دووبارە ڕووەو ماڵی سەناریا هەنگاو هەڵگرێ. دەوروبەری کاژێر نۆی بەیانی بەسواری پایسکیلەکەی وەڕێ کەوتەوە بۆ دێی چنار. هیچ نەبێ دەیهەویست بەم پیاسەیە تۆزێ لەخەمەکانی هەڵماڵێ. ئەو دەمەی گەیشتە دێ سەرەتا بەرەو مزگەوتەکە چوو کە ئەمە پیشەی هەموو جاری بوو. دەست نوێژێکی شت و تۆزێ ڕوونیشت، دواتر دەستی دایە قوڕئانێک و خوێنایەوە تاهەستی کرد تەواو گیانی ئۆخژنی گرتووە و ماندوو بوونی نەماوە، ئینجا لەوێوە بەرەو مەنزڵگای دولبەر لێی خوڕی.

سەیر لەوەدابوو هەرکاتێ مەولەوی چووبایە ئەوێ سەناریا بۆ تاوێکیش سەری دەرنەدێنا. چەندین جار چاوی بەباوکی و براکەی دەکەوت، وەلێ ئەو وەکو خونچەیەکی سەردەرنەهاتوو یەشتا بای بەهار دەمی نەکردبوویەوە. هەر دەتگوت بەکاتی هاتنی سیڕاج ئاگادارە و بەئەنقەست خۆی لێ حەشار دەدا.

دوای چەند جارێ ڕابوردن بەبەردەم مەکانی لەیلدا بەناچاری و دڵی مەکسورەوە گەڕایەوە.

---

٢٢٧- هێدمە: تاسان ، شۆک.

دوای عەسرێکـی درەنـگ مەولـەوی بەحەزینـی ڕوونیشـتبوو. چاوەنـووڕی هاتنـی بەیانـی دەکرد تـا بابەتەکـە بـۆ مامۆسـتا ڕوون کاتـەوە، لـەدەرگا درا، لەپڕێکـدا خاتـوو ڕەحمـە هـاواری کـرد:

- سیڕاج کوڕم تۆیان گەرەکە .

ئەو دەمەی سیڕاج چوویە بەر دەرگا چاوی بە لاوێکی قۆزی نەناسراو کەوت، لەوە نەدەچوو خەڵکی ئەو دێیە بێ. دوای چاک و چۆنی لەگەڵیدا گوتی کە من نێردراوی مامۆستا عەبدولڕەحمانم و ناردوومی تا پێت بێژم بەیانی بچیتە سەردانی و کاری پێتە.

مەولـەوی بـە بیسـتنی ئـەم هەواڵـە بەشـێوازێک گەشـایەوەو هێـز کەوتـەوە جەسـتەی کەدەتگـوت ڕۆژێ لـەڕۆژان مانـدو و ژاکاو نەبـووە. لەخۆشـیاندا هـەردوو کوڵمـی گەنجەکـەی ڕامووسـی و زۆری فەرمـوو لێکـرد بـۆ میوانـی، وەلـێ ئـەو پەیامەکـەی گەیانـدو ڕۆشـت.

بەیانـی شـەممە کەدەبوایـە زوو بچێتـە قوتابخانـە زۆر زووتریـش لەکاتـی خـۆی وەئـاگا هـات و دوای نـان خـواردن و خـۆ کۆکردنـەوە وەڕێ کـەوت.

ئـەم جارەیـان مامۆسـتا ئـەوی داوا کردبـوو، وەلـێ نەیدەزانی بۆچـی لەڕێگادا سـەرپاکی جەسـتەی دەلـەرزێ. ئـەو دەمـەی گەیشـتە بـەر دەرگای ماڵـی مامۆسـتا چـی بینـی! ئـەم حەشـامەتە خەڵکـە بۆچـی لێـرە گردبوونەتـەوە، ئـەی ئـەم شـین و شـەپۆڕە چـی یـە خودایـە ! لەشـوێنی خۆیـدا ڕەق بـوو، نەیدەوێـرا لـە ئاپۆڕاکـە[٢٢٨] نزیـک کـەوێ. لـەدوورەوە ناڵینـی خاتـوو خەدیجـەی بیسـت کـە نـاوی ئیلهامـی دێنـا. ئـەو دەمـەی چاردارەکەیـان[٢٢٩] هێنـا دەرێ گریانـەکان پـتر بـوون. مەولـەوی لـە حەژمەتـان هـەردوو پەنجـەی دۆشـاو مـژەی خسـتە نێـو گوێچکەکانـی و نەیدەویسـت هیـچ بژنـەوێ. لەپـڕدا ئیسـڕای بچـووک بەهەنسـکە هەنسـک بـۆلای مەولـەوی هـات و گوتـی:

- کاکـە سـیڕاج، بۆچـی کـەس وەڵامـی مـن ناداتـەوە، ئـەوە ئیلهـام بـەرەو کـوێ دەبـەن؟ دایـە هـەر دەگـری و دەڵـێ نوسـتووە.

مەولـەوی بـە تاسـاویەوە کـە فرمێسـک لەسـەر کوڵمەکانـی وەسـتابوون بەبـێ ئـەوەی لـە ئیسـڕا بڕوانـێ لەبـەر خۆیـەوە گوتـی:

---

٢٢٨- ئاپۆڕا: قەرەباڵغی ، جەماوەر.

٢٢٩- چاردارە: تابووت.



+ ئەو دەڕواتە شوێنێکی زۆر خۆش کە ئێمە هەموو تامەزرۆی ئەو جێگایەین.

ئیسڕا بە گریانەوە: نەکا بڕواتە لای شازادە بەبێ من، دەی باشە بۆچی خەوتووە و هەڵناسێ؟!

+ نەک شازادە، بگرە ئەو دەڕوا بۆلای پاشایەکی زۆر گەورە کە هەموو شتێک لەلای ئەو دەست دەکەوێ و دەسەڵاتێکی تەواوی هەیە، وەلێ دەبێ ئەو کەسانەی کە دەڕۆن بۆ ئەم جێگایە بەرزە سەرەتا بە خەوتوویی بڕۆن، یاسایەکە ئاوایە.

- باشە گەر بۆ شوێنێکی وەها خۆش دەڕوا بۆچی من جێ دەهێڵێ ئەم بێوەفایە، خۆ قەراری ئێمە وەها نەبوو کاکە سیڕاج، پێشتر پێک هاتبووین کە بەبێ من نەچێتە هیچ جێگایێ. دەی ئەم خەڵکە بۆچی ئاوا دەگرین؟!

+ ئاخر پادشا تەنێ ئەوی داواکردبوو ئیسڕا گیان، ئەم خەڵکانەش کە دەگرین لەبەر ئەوەیە بیری دەکەن، چون ئەو سەفەرەکەی درێژە.

- باشە هەر ئەوانە نەبوون تا دوێنێ قسەی نەشیاویان لەسەر دەکرد، ئیمڕۆ بۆچی بیری دەکەن، من لەمە تێناگەم!

+ منیش تێناگەم ئیسڕا گیان، بەخوا منیش تێناگەم!

مەولەوی لەگەڵ خەڵکەکە وەڕێ کەوت بۆ گۆڕستان، لەدوورەوە دیقەتی مامۆستای دەدا کەچۆن بەدەستەکانی خۆی کچەی ژاکاوی دەنایە گۆڕەوە و فرمێسکی لەچاوان دەڕژا، لێ هەرگیز ناڵەیەکی لێ نەژنەوت. سەراسیمە بوو لە بوێری و خۆڕاگری ئەم پیاوە کە چۆن نقەیەک لەزاری نایەتە دەر ! ئەی ئافەرین پیاو لە خۆڕاگریت لەدەمێکی وەها پڕ ئێش دا.

دوای ئەوەی خەڵکەکە تەواو پەرتەیان کرد و تەنێ مامۆستا لەلای گۆڕی کچەکەی مایەوە، مەولەوی لەحاڵێکدا کە هەستی بەشەرمەزاری دەکرد بەئەسپایی لێی نزیک کەوتەوە و لەلای ڕوونیشت. مامۆستا کە مەولەوی بینی لەئامێزی گرت و تاوێ فرمێسکیان لەسەر شانی یەکدی هەڵڕشت، دواتر نێوچاوانی ماچ کرد و گوتی:

- هاتی سیڕاج گیان، بۆ ئەوە بانگم کردی کە داوای لێبوردنت لێ بکەم کوڕم، زۆر پەلەبووم لە بڕیاردان، لەڕاستیدا کارەکە گەلێ سەیر بوو، یەکەم جارە من

ئـاوا فیڵـم لـێ بکـرێ، ئـەو زۆر ئیبلیسـانە دەهاتـە گـۆ، تەنانـەت هەرکەسـێ لـەوێ بـا لەوەبـوو بـاوەڕی پـێ بێنـێ، لەوانەشـە جـادووی لـێ کردبـم، خۆشـم نازانـم چیـم بەسـەر هاتبـوو، بەڵـێ ڕێـک دەتگـوت جـادووم لێکـراوە سـیڕاج.

سـیڕاج بەگریانـەوە: ئەسـتەغفیرەڵا قوربـان گیـان، مـن لـەوە بچووکـترم جەنابتـان داوای لێبوردنـم لـێ بکـەن، تخـوا ئـەم گوتانـە مەبێـژە. ئـەوە منـم دەبـێ داوای لێبـوردن بکـەم، مـن بوومـە هـۆی نەگبەتـی بـۆ ئێـوە، ئاخـر هەمـوو خەتـای مـن بـوو کەئێـوە قسـەتان هاتەسـەر و ئیلهامیـش وا نەخـۆش کـەوت.

- نـا کـوڕی خـۆم، جارێکـی دی لـەم گوتانـە نەڵێـی، تـۆ تەنهـا پیاوەتـی و چاکـەت نوانـدوە، مەگـەر تـۆ بیروبـاوەڕ ناخوێنـی! ئـەی نازانـی کـە هەرچـی ڕوودەدا بەقـەزا و قـەدەری خودایـە و ئێمـەش بـەوە ڕازیـن و شـتێک ناڵێیـن کـە خـودا لەخـۆ بتۆرێنیـن.

مامۆسـتا بـەردەوام بـوو لەسـەر قسـەکانی و گوتـی: دوێنـێ شـەو جەنابـی شـێخ (موسـتەفا)م لەخـەودا بینـی، ویسـتم بچمـە خزمەتـی و دەسـتی ڕامووسـم وەلـێ ڕێگـری لـێ کـردم. هەرچەنـدی بـەرەو ڕووی دەڕۆیشـتم سـەیر لەوەدابـوو هـەر لەشـوێنی خـۆم بـووم. گوتـم قوربـان ئەمـە چ حاڵێکـە ، گوتـی ئەمـە حاڵی کەسـێکە کـە داوای زانسـتی لـێ بکـرێ و نەیبەخشـێ.

منیـش گوتـم ئاخـر ئـەو دەمانـەی تـۆ ئـەوت نـاردە لام مرۆیەکـی تـر بـوو، ئێسـتەکانێ تـەواو گـۆڕاوە. گوتـی نـا، بەڵکو ئێسـتا گەلـێ چاتـرە لەجـاران، کاری ئێمـە ڕزگارکردنی خەڵکـە نـەک پامـاڵ[٢٣٠] کردنیـان. ئـەو گوتانـەی لـەو گەنجـەت ژنـەوت هیچـی ڕووی لەڕاسـتی نییـە، شـایەدی ئـەو قسەیەشـم ئەوەیـە کەبەیانـی ئـەو گەنجـە دەسـگیر دەکـرێ لەسـەر دزیـەک کـە کردوویەتـی. وە گوتیشـی کـە سـپاردەیەکت لەلایـە و کاتـی دانـەوەی هاتـووە و غەمبـار مەبـە بـۆی، چـون ئـەو دەچێتـە شـوێنێکی وەهـا کـە پیـاوە بـەرزەکان بـە ئاواتیـەوەن.

ئیـدی لەپـڕدا وەئـاگا هاتـم، نەمتوانـی چاوەنووڕبـم تـا سێشـەممە دێیـەوە، ئـەو گەنجـەم نـاردە دوات کەیەکـێ بـوو لەقوتابیانـم.

مەولـەوی لەگـەڵ ئـەو خـەوەدا دەسـتی بەگریانێکـی قـووڵ کـرد. وای دەزانـی مامەپیـرە ئـەوی لەیـاد چۆتـەوە، لـێ دووبـارە وەفریـای کـەوت، لـەو بـاوەڕەدا نەبـوو کەلەسـەر

٢٣٠- پاماڵ: پێشێل.

ئـەو گازانـدە لەمامۆسـتا بکـرێ.

مامۆسـتا ڕووی لەگـۆڕی کچەکـەی کـردو دەسـتی بـە قسـان کـردەوە: تـۆش بمبـوورە کچـی خۆشەویسـتم کـە وەکو مـرۆڤ و باوکێـک خەتەرەیەک لـە دڵـی دام بەرامبەرتان، خـۆ مـن دەمزانـی کەئێـوە چەنـدە پاکـن، لـێ شـەیتان بـەردەوام لـە وەسوەسـە دایـە بـۆ مـرۆڤ و وازی لـێ ناهێنـێ. دووبـارە ڕووی لـە سـیڕاج کـردەوە و هاتـەوە گـۆ:

- ئـای سـیڕاج، مـرۆڤ چـۆن ئەگـەر بەپەلـە بڕیـار بـدا دەکەوێتـە داوی شـەیتانەوە. خـۆ گـەر دەرم کردبـای لەکاتێـکدا بـێ تاوانـی بەهـۆی ئـەو بڕیـارە پەلـەو ناڕاسـتەم لەکۆمەڵـەی خراپـان دەبـووم، هەرگیـز مـرۆڤ بـۆی نییـە کەسـی بەرامبـەر تاوانبـارکا تاوەکـو بەچاوانـی خـۆی تاوانەکـە دەبینـێ و دڵنیـا دەبـێ لێـی. ئـەو دەمـەی دڵنیـاش بـۆوە لازمـە پەردەپۆشـی بـکاو لـەلای خەڵـک ئابـڕوی براکـەی نەبـا، بەڵکـو بەشـێوازێکی حەکیمانـە تێـی گەیەنـێ کەئەمـەی دەیکـەی کارێکـی بـاش نییـە و لەتـۆ ناوەشـێ. گـەر خەڵکانێکـت بینـی لەبـەر دەرکـی تیاتـرۆ خانـەکان[231] هاتووچۆیـان بـوو بـۆت نییـە بـە مرۆیەکـی خراپـی بزانـی، چـون تـۆ نازانـی بۆچـی چۆتـە ئـەوێ، لەوەیـە نیەتـی ڕێنموونـی کردنیـان بـێ، ئێمـە ناتوانیـن دڵـی کـەس شـەق بکەیـن.

دەزانـی گـەر ئـەو کاتـە مـن ئـەو ئایەتـەم بیربـا هەرگیـز تووشـی ئـەو هەڵەیـە نەدەبووم، کەخـودا دەفەرمـوێ: ئـەی ئەوانـەی بـاوەڕدارن، گـەر کەسـێکی متمانـە پێنەکـراو هەواڵێکـی بـۆ هێنـان خێـرا بـڕوای پـێ مەکـەن و لێـی بکۆڵنـەوە، نەبـادا ئـازارو گرفـت بـۆ خەڵکـی دروسـت کـەن بەنەزانـی و دواتریـش پەشـیمان ببنـەوە [232].

لێرەدا مامۆستا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و دوای تۆزێ بێدەنگی هاتەوە گۆ:

- سـیڕاج گیـان، ئیلهـام سـپاردەیەک بـوو کـە خـودا لـەلای دانابـووم و ئیمـڕۆ بردیـەوە، هەرچەنـدە سـپاردە هـەر دەبـێ ڕۆژێـک بدرێتەوە، وەلـێ مرۆڤیـش مەخلووقێکـی لاوازە و نارەحـەت دەبـێ ئیـدی.

ئـەو کچـەی مـن هەر دەتگـوت خەڵکی ئـەم جیهانە نییـە، ئاخر لەسـەرەتادا ئـەو دەمانەی لەشـار دەژیایـن ئـەو لەنێو ناز و بەهەشـتێکی بێ وێنـە دابوو، هەرچی بەخشـش و کەیف سـازیە بـۆی فەراهـەم کرابـوو، چەشـنی شـازادەیەک ژینـی دەگوزەرانـد، لێ ئـەو ڕۆژەی

---

231- تیاترۆخانە: جێگای خراپ و بەدڕەوشتی.

232- سوورەتی حوجوڕات ، ئایەتی ٦.

براکـەم مرۆیەکـی بەهەڵـە لەدەسـت کـوژرا هەرچـی هەمـان بوو بـۆ بـۆ پێکهاتن بەخشـیمان، سـەرەڕای ئـەوەش یەشـتا ئـەوان هەڕەشـەیان لـێ دەکردیـن و بەهەمـوو چەشـنێ نارەحەت دەکرایـن. بـۆ پاراسـتنی خێـزان و منداڵەکانـم ڕووم لـەم شـوێنە کـرد و ژیانـی هەژاریـم هەڵبـژارد، لـێ ڕۆژێـک لـەڕۆژان نەمبیسـت ئیلهـام بڵێ برسـیمە، نەمبیسـت گازاندەیەک بـکا، نەمبیسـت داوای جلێکـی نـوێ بـکا لەکاتێـکدا جلەکانـی پینـەی لێدرابـوون. نەک هـەر جـل ئـەو داوای هیچی نەکـرد سـیراج هیچ.

چەشـنی فریشـتەیەک هەمیشـە لـە سـوژدە و پەرسـتش دابـوو، هـەردەم دوعـای بـۆ ئێمـە دەکـرد و زۆر نارەحـەت دەبـوو ئـەو دەمـەی خوشـکەکەی برسـی بووایـە.

سوپاسـی خـودا دەکـەم کـە ئـەو گەیشـتە جێـگای خـۆی، ئـەو جێگایـەی هەمیشـە هەوڵـی بـۆ دەدا. دەمـەوێ ئەوەشـت پـێ بێـژم کـە لەدڵـی خۆمـدا ئـەوم بـۆ تـۆ دانابـوو سـیراج، وەلـێ کـێ سـەری لەقـەدەری خـودا دەردەچـێ. هـەر بەڕاسـت ئـەم سـەناریایە کێیـە کـوڕم کـە ئـەو نامـە دڵداریـەت بـۆی نووسـیوە؟

مەولەوی کە لەبەر گریان بەئاستەم قسەی بۆ دەکرا گوتی:

+ قوربـان بەمناڵـی لەقوتابخانـە بەیەکـەوە بوویـن، هـەر ئـەم عیشـقەش منـی هێنـا خزمـەت جەنابتـان. بمبـوورە کەتـا ئێسـتا ئـەم باسـەم بـۆت نەوروژانـدووە، دڵنیابـە کەشـەرم ڕێگـەی نـەداوم.

- هەمـوو جـارێ بەڕەحمـەت بـێ جەنابـی شـێخ دەیگـوت (ئـەوەی عیشـقی مەجـازی نەچەشـتبێ بەتـەواوی لەعیشـقی حەقیقی نـاگا[٢٣٣]) لـەو بڕوایـەدام تـۆش تامـی ئـەو حەقیقەتـە بکـەی کـوڕم.

ئەمـەش نامەکـەت بیگـرە، دڵـم نەهـات هیچـی لـێ بکـەم، وەلـێ هەڵـی گـرەو جـارێ کاتـی ئـەم بابەتانـە نییـە. گـەر هێنـدە لەدڵتایـە خۆگربـە تـا ئـەو دەمـەی بـۆت دەگونجێ بچیـە داوای، نەبـادا بـەم هۆیـەوە تووشـی کارێکـی نـاڕەوا بـی.

+ دڵنیابـە قوربـان دوای ئـەوەی بـەم ڕێبـازە قەشـەنگە شـادبووم کارێـک ناکـەم ڕوو زەردی قاپـی خودابـم.

---

٢٣٣- عیشـقی ئیلاهـی پێـی دەگوتـرێ عیشـقی حەقیقـی ، عیشـقەکانی دیکـە بێجگـە لەعیشـقی خـودا مەجـازن و حەقیقـی نیین.

- دەفتەری بیروباوەڕەکەت لایە؟

+ بەڵێ قوربان لەناو جانتاکەمە.

- دەی دەری بێنە با وانەیەک بخوێنین، تازە هەر قوتابخانەکەت لەکیس چووە، با بێ خوێندن نەگەڕێیتەوە.

+ وەلێ قوربان ئیمڕۆ شەممەیە، جگە لەوەش تۆ حاڵت باش نیە و پێویستە پشوو بدەی.

- دەری بێنە سیراج گیان، من ئەو دەمە بێ حاڵم کە وانە نەڵێمەوە. ڕۆینی وانەیەک زیانی پترە لە ڕۆینی مناڵێک، وەلێ خەڵکی درکی پێ ناکەن. دەی با ئیلهامیش گوێگرمان بێ ئیمڕۆ، دڵنیام ئەویش زۆری پێ خۆشە.

مەولەوی بەناچاری دەفتەرەکەی دەرێنا و لەسەر گۆڕی ئیلهام دەستی بەخوێندنەوەی کرد.

+ **ئیسڕاو میعڕاج، پەرجۆیەکی بێ وێنە**

| | |
|---|---|
| لەبیست و حەوتی ڕەجەبدا حەزرەت | ساڵێک و دوو مانگ لەپێشی هیجرەت |
| هەر لە مەککەدا بە سواری بوڕاق | لەگەڵ جوبرائیل، ئەو ڕەسوولی تاق |
| چوون لەبۆ ئەقسای شاری فەڵەستین | بوو بە ئیمامی ڕەسوولانی دین |
| ئینجا لەوێدا بە ڕۆح و لاشەی | بەرز بوو حەزرەت بەفەرمانی حەی |

+ بفەرموو قوربان تەواو.

مامۆستا بەدەنگێکی کزەوە دەستی پێکرد:

- سیراج گیان، لە (٢٧)ی مانگی ڕەجەب، ساڵێک و دوو مانگ بەر لەوەی خۆشەویستمان کۆچ بکا بۆ مەدینە ئەم ڕووداوە گرنگ و پەرجۆ[٢٣٤] بەرزە ڕوویدا. جوبرائیل هات بۆلای پەیامبەرو بەسواری ئاژەڵێکی جوان کەناوی (بوڕاق) بوو شەوڕەوی پێ کردو لەشاری مەککەی پیرۆزەوە لەگەڵ خۆیا بردی بۆ مزگەوتی ئەقسا لە فەڵەستین. هەروەک خودا خۆی فەرموویەتی: پاک و بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد لەبەشێکی شەوێ لەمزگەوتی حەڕامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا [٢٣٥].

---

٢٣٤- پەرجۆ: موعجیزە.

٢٣٥- سوورەتی ئیسڕا ، ئایەتی ١.

جا لەوێدا پێش نوێژی بۆ پەیامبەران کرد (سەلامی خودایان لەسەر). پاشان هەر لەوێوە خۆشەویستمان بەفەرمانی پەروەردگار بەرۆح و لاشەی بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان.

لەئاسمانی حەوتەم چاوی بە (بەیتول مەعمور) کەوت کە شوێنێکە وەکو کەعبەی دونیا وایە و فریشتەکان بەدەوریدا دەسوورێن. ئینجا لەشوێنێکدا کەپێی دەوترێ (سیدرەتول مونتەها) جوبرائیل بەجێ ماو فەرمووی ئێرە سنووری منەو چیتر ناتوانم سەرکەوم، لەوێوە خۆشەویستمان بەتەنیایی بەرزبوویەوە.

پەیامبەری نازدار لەوێدا چاوی بەگەلێ شوێن کەوت، دواتر بەهەردوو چاوانی خودای مەزنی بینی کەلەباسی بینینی خودا لێی دواین گەر لەیادت بێ.

+ لەیادمە قوربان وەلێ کەسانێ هەن بڕوا بەم ڕووداوە ناهێنن بەبیانووی ئەوەی لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێ؟

- دەی پەرجۆ هەر ئەوەیە کەلەگەڵ عەقڵدا نەگونجێ، گەر گونجا کەواتە پەرجۆ نییە کوڕم. کەسێ بڕوای بەخودا هەبێ بڕوا بەوەش دێنێ چون ئەمە لەقوڕئاندا تۆمارە.

جا لەوێ خوای پەروەردگار سێ خەڵاتی پێ بەخشی. یەکەم: پێنج نوێژی لەسەر خۆی و گەلەکەی واجب کرد لەهەموو شەوو ڕۆژێکدا، دووەم: دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرەی خەڵات کرد، سێیەم: خودا بڕیاری دا جگە لەکافربوون لەهەموو گوناهی ئوممەتەکەی خۆش ببێ.

دەڵێن ئەوەی لەو شەوە پەیامبەر بە سرووش وەری گرتووە سێ جۆرە، یەکەم: هەموو کەسێ تێی گەیشتووە، وەکو پێنج نوێژەکان، دووم: خۆشەویست و زانایان تێی گەیشتوون نەک هەرەمەی خەڵک، سێیەم: هەر خۆشەویست توانای تێگەیشتنی هەبووە، وەکو ئەو شاراوانەی بۆ بڵاوکردنەوە ناشێن.

پاشان خۆشەویستمان گەڕاوە بۆ شاری مەککە هێشتا ئەڵقەی زنجیری دەرگایماڵی (ئوم هانیئ)ی پووری دەلەریەوە کە لەوێوە ڕۆیشتبوو، واتا لەو ماوە کەمە ئەو هەموو چشتە زۆرە ڕووی دابوو. ئەمەش بۆ دەسەڵاتی خودا زۆر ئاسانە کەنێردراوەکەی خۆی داوەت بکاو پاشان بیگەڕێنێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ لەکات ڕاببورێ.

- بابەتی دواتر بخوێنەرەوە کوڕم.

سەحابە بەو کەس دەڵێن بزانە    بە ڕەسوول بگا کە موسوڵمانە
گشتیان لەلامان مەحبووب و ڕەوان    گوتەیەک ناڵێین کە دژبێ بەوان
جا بۆت بژمێرم گشت جێنشینەکان    بووبەکر و عومەر، عوسمان بن عەفان
هەروەها عەلی کە چوارەمیانە    کوڕە مامەکەی فەخری جیهانە

+ بفەرموو قوربان گیان.

- بزانە کوڕی ئازیزم وەکو پێشتریش باسمان کردووە، سەحابە بەو کەسە دەڵێن کەبە زیندوویی گەیشتۆتە پەیامبەر لەکاتی پەیامبەریدا و باوەڕی پێ هێناوە و هەر بە موسڵمانیش کۆچی دوایی کردووە.

جا ئەو سەحابانە هەموویان لەلامان خۆشەویستن و هەرگیز دژایەتیان ناکەین وەکو شیعە کە گروپێکن دژایەتی هەندێکیان دەکەن و لەجێنشینیدا تەنیا دان بەپێشەوا عەلی دێنن.

خۆشەویستمان فەرموویەتی جنێو بەهیچ کام لەسەحابەی من مەدەن چونکە هەر یەکەتان گەر بەقەد کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێ هێشتا ناگاتە خێری مستێکی ئەوان و نیو مستیش.

کاتێ کەوا خۆشەویستمان دونیای جێهێشت پێشەوا (ئەبوبەکر) هەڵبژێردرا بەجێنشینی ئەو و پێشەوای موسڵمانان، کەناوی تەواوی (عەبدوڵا)یە و ناوبانگی (ئەبوبەکر) ە ونازناوی (سدیق)ە و ناوی باوکی (عوسمان)ە و دایکی ناوی (سەلما)یە.

ماوەی دووساڵ و سێ مانگ و بیست ڕۆژ فەرمانڕەوایی کردو لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردو لەتەنیشت خۆشەویستمان نێژراوە.

فەرمانڕەوای دووەم کە بەفرمانی پێشەوا ئەبوبەکر بوو بەجێنشین، ناوی (عومەر)ە و ناوبانگی (ئەبو حەفس) ەو نازناوی (فاڕوق)ە و باوکی ناوی (خەتاب)ە و دایکی ناوی (حەنتەمە)یە.

دەساڵ و شەش مانگ و چوار ڕۆژ فەرمانڕەوا بوو. لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا بەدەستی (ئەبو لوئلوئە)ی ئاگر پەرست شەهید کراو لەتەنیشت خۆشەویستمان و پێشەوا ئەبوبەکر نێژرا.

جێنشـینی سـێیەم کەلـەدوای پێشـەوا عومـەر هەڵبژێـردرا نـاوی (عوسـمان)ە و باوکـی نـاوی (عەفـان)ە و دایکـی نـاوی (ئەڕوا)یـە. دوانـزە سـاڵ دوانـزە ڕۆژی کـەم فەرمانڕەوابـوو، لەتەمەنـی (٨٢) سـاڵی شـەهید کـرا بەدەسـتی چەند کەسێکی ئاژاوەچی و لەگۆڕسـتانی (بەقیـع) نێـژرا.

جێنشـینی چـوارەم نـاوی پێشـەوا (عەلی)یـە و ناوبانگی(ئەبولحەسـەن) و (ئەبـو تـوراب)ە. باوکـی نـاوی (ئەبوتالیـب)ە و دایکـی نـاوی (فاتیمە)یـە، کەدەکاتـە کـوڕی مامـی خۆشەویسـتمان، وەهاوسـەری (فاتیمـە)ی کچـی پەیامبـەرە و باوکی(حەسـەن) و (حوسەین)ــە خـوا لێیـان ڕازی بـێ.

لـەدوای شـەهیدکردنی پێشـەوا عوسـمان هەڵیـان بـژارد و پەیمانیـان پێـداو بـوو بـە جێنشـینی چـوارەم. چـوار سـاڵ و دەمانـگ فەرمانـڕەوا بـوو، لەتەمەنـی (٦٣) سـاڵی شـەهیدکرا بەدەسـتی (عەبدولڕەحمانـی کـوڕی مولجـەم) ی خەواریـج، وە لەشـاری نەجـەف نێـژراوە.

جـا بزانـە کـوڕم ئـەم چـوارە پێیـان دەوتـرێ (خولەفـای ڕاشـیدین) واتـا هـەر چـوار جێنشـینەکەی لەسـەر ڕێـی ڕاسـتن، چـون خۆشەویسـتمان دەربارەیـان فەرموویەتـی ئێـوە ڕێبـازی مـن و چـوار جێنشـینەکانی دوای مـن بگـرن، ئـەوان شـارەزای ڕێبـازی منـن و لەسـەر ڕێـی ڕاسـتن، ڕێبـازی ئەوانـە بـەددان بگـرن و بـەری مـەدەن.

جـا گەورەیـی ئـەو چـوارە یـەک لـەدوای یەکـە وەکـو ڕیـزی جێنشـینیەکە، واتـا سـەرەتا پێشـەوا ئەبوبەکـر لەهەموویـان گەورەتـرە پاشـان یەک لـەدوای یـەک ئەوانی تـر بەڕیز.

ئینجـا ئـەوەش بزانـە سـیڕاج گیـان کە واجبـە لەسـەر موسـڵمانان لەهەمـوو سـەردەمێکدا پێشـەوایەک بۆخۆیـان هەڵبژێـرن. مەرجـی ئـەو پێشـەوایە ئەوەیـە دەبـێ پیاوێکـی ئازاو موسـڵمان و عاقـڵ و زانابـێ، وە زۆر بەتوانـاو ڕەشـید بـێ و بتوانـێ کاروباری موسـڵمانان ببـا بەڕێـوە. هـەروا زانایـان فەرموویانـە دەبـێ ئـەم پێشـەوایە نـەژادی قوڕەیشـی بـێ، وە ئەگـەر ئـەو کەسـە نەبـوو وەکـو ئێسـتا ئـەوا پێویسـتە پیاوێکـی دیکـە هەڵبژێـردرێ، چـون هەبوونـی پێشـەوا کارێکـی زۆر پێویسـت و گرنگـە.

هـەروا ئـەو دە هاوەڵـەی کـە خۆشەویسـتمان هـەر لەدونیـادا مـوژدەی چوونـە بەهەشـتی پێـدان، ئـەم چـوار جێنشـینەی باسـمان کـردن لەگـەڵ (تەڵحـە)و (زوبەیـر)و (سـەعد) و (سـەعید) و (عەبدولڕەحمانـی کـوڕی عـەوف) و (ئەبوعوبەیـدەی کـوڕی جـەڕاح)،

هەروەکو خۆشەویستان ناوی هێناون.

جا بزانە لەپاش چوار جێنشینەکە ئەو شەشانە لەهەموو کەس گەورەترن. ئینجا لەدوای ئەوان جەنگاوەرانی (بەدر)، ئینجا جەنگاوەرانی (ئوحود)، ئینجا ئەو کۆمەڵەی لەژێر درەختەکە پەیمانیان دا بەخۆشەویستمان، ئینجا هاوەڵەکانی تر، پاشان (تابیعین): واتا ئەو کەسانەی چاویان بەهاوەڵەکانی خۆشەویست کەوتووە و شوێنکەوتەیان بوون.

- چۆنە ئەو ماوەیە پرسیار ناکەی کوڕم؟

+ بابەتەکان زۆر ڕوونن، خۆشم چشتم دەربارەیان خوێندۆتەوە و لەزۆریان ئاگادارم، گەر لەشوێنێکیش ناڕوونیەک پەیدابوو پێتی دەڵێم قوربان.

- دەی زۆر چاکە بڕۆ سەر بابەتی دواتر.

+ مامۆستا گیان ئەگەر بێ تاقەتی کێشە نیە ئیمڕۆ بەس بێ، بەخوا ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە.

- نا کوڕم بیخوێنەرەوە، با کچەکەشم گوێگری بێ.

+ **باسی پیاوچاکان**

وەلی دۆستێکە لە دۆستانی خوا    پیاوبێ یا ئافرەت، گەلێ بە تەقوا

زانایە بەزات، هەم سیفەتی ڕەب    بۆ کاری خراپ ناپشکوێنێ لەب

+ تەواو بفەرموو قوربان.

- ئازیزەکەم سیڕاج، بەکەسێک دەگوترێ وەلی کەوا دۆستی خودابێ جا پیاو بێ یاخود ئافرەت، کەسێکی گەلێ خۆپارێز ولەخواترس بێ و زۆربەی کاتەکانی لەبەندایەتی خودادا بەسەر ببا.

هەروەها بەئەندازەیەکی عادەتی پێویستە ئەو کەسە زاناو ئاگادار بێ لەزات و سیفاتی خوای گەورە، وە بەزۆری یادی خودای لەسەر دەم بێ و بۆکاری خراپ هەرگیز دەم نەکاتەوە، چون خودای گەورە فەرموویەتی دۆستانی خوا تەنیا لەخواترسەکانن [٢٣٦].

---

٢٣٦- سوورەتی ئەنفال ، ئایەتی ٣٤.

هەروەها فەرموویەتی هەرکەس دژایەتی دۆستێکم بکا ئەوا خۆم جەنگی لەگەڵ دەکەم.

ئینجـا پلـەی وەلـی هەرگیـز ناگاتـە پلـەی پەیامبـەران و سـەحابەکان بـەڵام ئـەوان دۆسـتی خـودان و گەلـێ ڕێـزدارن لەلایـەن خـوای گـەورە.

جـا گەلـێ کەڕامـات ڕوودەدا لەدۆسـتانی خـوا، کـەوا کارێکـی لەعـادەت بـەدەرە و خـوای گـەورە لەسـەر دەسـتی دۆسـتانی خـۆی دەیهێنێتـە جـێ. وەلـێ ئـەوان هەرگیـز داوای پەیامبەرایەتـی ناکـەن.

+ واتـا پەرجـۆ و کەڕامـات هەردووکیـان کارێکـی لەعـادەت بـەدەرن، وەلـێ جیاوازیەکەیـان ئەوەیـە کـە پەرجـۆ لەسـەر دەسـتی پەیامبـەران ڕوودەدا ، وەلـێ کەڕامـات لەسـەر دەسـتی پیاوچـاکان.

- بەڵـێ بێگومـان کـوڕم، ئینجـا کەڕاماتـی وەلیـەکان هێنـدە زۆرن لەژمـارە نایـەن، وەکـو خاتـوو مەریەمـی دایکـی پەیامبـەر عیسـا، ئـەم ئافرەتـە پەیامبـەر نەبـوو، وەلـێ دۆسـتێکی خوابـوو کـە هەمـوو جـار ڕۆزی جۆراوجـۆری بـۆ دەهـات لەلایـەن خـوای گـەورە. هەروەهـا بەسـەرهاتی یارانـی ئەشـکەوت کە سێسـەد سـاڵ لەنێو ئەشـکەوتەکە نوسـتن، یاخـود ئاسـەفی کـوڕی بەرخیـا کەتەختـی بەلقیسـی بـۆ پەیامبـەر سـولەیمان هێنـا لەچـاو تروکانێکـدا و چەندانـی تـر کـە لەقوڕئـان و فەرمـوودەکان تۆمـارن.

+ قوربـان ئـەی شـێخ (موسـتەفا)ی خۆمـان، ئەویـش دەبـێ وەلـی خـوا بووبـێ ئەگەرنـا چـۆن زانـی مـن لـەدوای مەرگـی دێمـە ماڵەکـەی و ناویشـم سـیڕاجە، ئـەی وانییـە؟

- بێگومـان کـوڕم، ئەوانـە چـون هێنـدە بەندایەتـی خودایـان کـردووە، خـوداش لەکۆمەڵێ چشـت ئاگاداریـان دەکاتـەوە و کۆمەکیان دەکا.

بابەتێکی تریش بخوێنەرەوە ئینجا کۆتایی پێ دێنین.

+ بەسەرچاو مامۆستا.

## باسی پێشینە باشەکان و موجتەهیدەکان

سـەلەف پێشینەن، سێ سەدەی یەکـەم    شایەدی بۆ دان ڕەسوولی ئەکـرەم
هـەروا پێشـەوا موجتـەهیدەکـان    ڕۆن بکەم لەبۆت بە پوخت و ئاسان
ئـەبو حـەنیفـە و ئیمـامی مـالیک    شـافیعی و ئەحمەد، ئەوانن سالیک
لە عەقیدەشـدا دوو کـەس مەشهوورن    ئـەبولحەسـەن و ئـەبو مەنسووڕن

+ بفەرموو مامۆستای ئازیزم.

ئینجـا کەباسـی پیاوچـاکان هاتـە پێشـەوە واباشـە باسـێکی سـەلەفی سـاڵحیش بکەیـن، بەمانـای پێشـینە باشـەکان، کەبریتیـن لەزانایانـی ئـەو سێسـەد ساڵەی خۆشەویستمان شـایەدی بـۆ داون، وەکـو فەرموویەتـی کـە چاکترینـی ئوممـەت ئـەم سـەدەیەی خۆمـە، پاشـان سـەدەی دوای ئـەوان، پاشـان سـەدەی دوای ئـەوان.

واتـا پەیامبـەری خۆشەویسـت شـایەدی بـۆ ئـەم سـێ سـەدەیە داوە کەباشـترینی ئوممەتـن، سـەدەی خـۆی و دوو سـەدە دواتـر، کەمەبەسـت چینـی سـەحابە و تابیعیـن و تابیعـی تابیعینـن[٢٣٧].

+ باشـە قوربـان ئـەوە زانیـمان کـە سـەلەف بەزانایانـی پێشـووتر دەگوتـرێ کەلـەم سـێ سـەدەیەی سـەرەتا ژیـاون، ئـەی خەلـەف چییـەو بەکـێ دەگوتـرێ؟

- سـیڕاج گیـان، خەلـەف واتـا پاشـینە، بـەم زانایانـە دەگوتـرێ کەلەپـاش ئـەم سـێ سـەدەیە هاتـوون و زانسـتیان لەزانایانـی سـەلەف وەرگرتـووە و بەئێمەیـان ڕاگەیانـدووە چیـن بەچیـن.

جـا پێشـەوا موجتەهیـدو تێکۆشـەرەکان لەبـواری شـەریعەت زۆرن، وەلـێ چواریـان مەزهـەب و بیروبۆچوونەکانیـان نووسراوەتـەوەو شـوێنکەوتنیان دروسـتە. پێشـتریش ئەوەمـان ڕوون کـردەوە کەمـرۆڤ پێویسـتە لەبابەتـە ئاینیـەکان شـوێن فەتـوای زانـاکان بکـەوێ نـەوەک بەبیـرو بۆچـوون و هـەواو هەوەسـی خـۆی تووشـی حـەڕام و سـەرلێ شـێوان ببـێ. جـا ئـەم پێشـەوایانە:

یەکـەم: پێشـەوا (ئەبوحەنیفە)یـە کەناوی تـەواوی (نوعـمان)ی کوڕی (سـابت)ی کوفیە. لەسـاڵی (٨٠)ی کۆچـی لەکوفـە لەدایـک بـووەو لـە (١٥٠)ی کۆچـی لەبەغـدا کۆچـی

٢٣٧- تابیعین ئەوانەن کە سەحابەکانیان بینیوە ، وەلێ تابیعی تابیعین ئەوانەن کە تابیعینیان بینیوە.

دوایـی کـردووە و بەزانایەکـی سـەلەف دادەنرێ چونکە لەسـەدەی یەکـەم و دووەم ژیاوە.

دووەم: پێشـەوا (مالیـک)ی کوڕی (ئەنەس)ی کوڕی (مالیک)ی کـوڕی ( ئەبی عامیری ئەسبەحی)یە (خـوای لێ ڕازی بێ). ئـەو ئەبو عامیرە هاوەڵێکی خۆشەویستمان بووە.

پێشـەوا مالیـک لەسـاڵی (٩٣)ی کۆچـی لەمەدینـە لەدایـک بـووەو لـە (١٧٩)ی کۆچـی هـەر لەمەدینـە کۆچـی دوایـی کـردووە، کەوابـوو ئەویـش هـەر لەسـەلەف دەژمێـردرێ.

سـێیەم: پێشـەوا (شـافیعی) کەنـاوی (موحەممـەد)ی کـوڕی (ئیدریـس)ی کـوڕی (عەبـاس)ی کـوڕی (عوسـمان)ی کـوڕی (شـافیع)ی کـوڕی (سـائیب)ی کـوڕی (عوبەیـد)ی کـوڕی (عەبدویەزیـد)ی کـوڕی (هاشـم)ی کـوڕی (موتەلیـب)ی کـوڕی (عەبدولمەنـاف)ی قورەیشـیە، واتـا لەهۆزەکـەی خۆشەویسـتمانە. لەباپیـرەی سـێیەمی پەیامبـەر کـە عەبدولمەنافـە نـەژادی دەگاتـەوە پەیامبـەری خۆشەویسـت.

لەسـاڵی (١٥٠)ی کۆچـی لەشـاری (غـەزە) لەفەڵەسـتین لەدایـک بـووەو لـە (٢٠٤)ی کۆچـی لە(میسـڕ)کۆچی دوایـی کـردووە، کەواتـە ئەویـش زانایەکـی سـەلەفە و بـەر شـایەدیەکەی خۆشەویسـتمان دەکـەوێ، وە گەلـی کـوردی خۆشـمان لەسـەر مەزهـەب و فەتواکانـی ئـەم زانـا بەڕێـزەن.

چـوارەم: پێشــەوا (ئەحمــەد)ی کــوڕی (حەنبــەل)ی (شــەیبانی)یە، لەســاڵی (١٦٤)ی کۆچـی لە(بەغـدا )لەدایـک بـووەو لـە (٢٤١)ی کۆچـی هـەر لـەوێ کۆچـی دوایـی کـردووە، کەوابـوو ئەویـش یەکێکـە لەسـەلەفی سـاڵح.

هەروەهـا لەبـواری عەقیـدە و بیروباوەڕیشـدا دوو پێشـەوا زۆر گـەورەو نـاودارن کەلەیەکـەم وانـەدا لێیـان دوایـن گـەر بیـرت مابـێ.

+ بەڵـێ قوربـان بیرمـن، یەکەمیـان پێشـەوا (ئەشـعەری)بوو کەنـاوی تـەواوی خـۆی (عەلی)یـەو پێـی دەڵێـن (ئەبولحەسـەن)، لەنێـو خەڵکیـدا بەئەشـعەری بەناوبانگـە چونکـە نـەوەی سـەحابەی بەڕێـز (ئەبـو موسـای ئەشـعەری)یە (خـوای لـێ ڕازی بـێ )، وە ئێمـەی کـورد لەسـەر عەقیـدەی ئـەو زانـا بەڕێزەیـن.

وە دووەمیـان پێشـەوا (ماتوریدی)یەو نـاوی (موحەممـەد)ەو پێی دەڵێن (ئەبومەنسـوڕ)، لەنێـو خەڵکیـدا بـە ماتوریـدی بەناوبانگـە چونکـە لـە ماتوریـد لەدایـک بـووە لـە سـەمەرقەند.

- زۆرچاکـە باشـت بیرمـاوە کـوڕم، ئینجـا ئـەو شـەش پێشـەوایەی باسـمان کـردن لەسـەر حەقـن و مەزهەبیـان تـەواو ڕێکـە لەگـەڵ قورئـان و فەرموودەکانـدا. هەرکەسـێ شـوێنی یەکـێ لـەم چـوارە بکـەوێ لەلقەکانـی ئایـنداو شـوێنی یەکـێ لـەم دووانـەش بکـەوێ لەبـواری عەقیـدە ئـەوا لەسـەر ڕێـگای ڕاسـتەو دوورە لەڕێـی چـەوت و لار.

کەواتـە کـوڕی ئازیـزم ئـەوان سـەلەفی سـاڵحن و شـوێنیان بکـەوەو دووربـە لـە لقـە ڕێیەکانـی تـر.

ڕێچکـەی پێشـەوا ئەشـعەری ڕێچکەیەکـی ناوەنـد و پتـەوە، وەک چـۆن گرنگـی بەدەققـەکان داوە گرنگـی بەعەقڵیـش داوە. وەکـو موعتەزیلـەکان عەقڵـی زاڵ نەکـردووە بەسـەر دەقـدا، وەکـو خەواریجیـش عەقڵـی وەلا نەنـاوە. وە ڕێچکـەی پێشـەوا ماتوریدیـش هەمـان ڕێچکەیـە وجیاوازیەکـی وەهـا نییـە لەنێوانیانـدا.

ئـەوەش بزانـە کەلـەدوای قورئـان و فەرمـوودەکان واجبـە کۆدەنگـی زانایـان ڕەفتـاری پـێ بکـرێ ، چونکـە بەڵگـەی سـێیەمی شـەریعەتی ئیسـلامە. کۆدەنگـی زانایـان بریتیە لـەوەی کەزانایـان و موجتەهیدانـی دینـی ئیسـلام یەکدەنـگ بـن لەسـەر بڕیارێکـی شـەرعی و فەتـوای لەسـەر بـدەن. وە پێویسـتە ئێمـەش شـوێنیان بکەوین چونکـە ناکرێ ئـەم هەمـوو زانایـە بەهەڵـەدا چووبـن لـەم بڕیـارەدا.

خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی ئێـوە لەگـەڵ کۆمەڵدابـن و پەرتـەوازە و تاکـڕەوی مەکەن، چونکـە شـەیتان لەگـەڵ یـەک کەسـە و لـە دوو کەسـان دوورتـرە، هەرکـەس ناوەنـدی بەهەشـتی دەوێ باهـەر لەگـەڵ کۆمـەڵ بـێ.

- ئیـدی پێـم وابـێ بـەس بـێ سـیڕاج گیـان، وابزانـم دەفتەرەکەیشـت شـڕ کـردووە و بـەدوو سـێ وانـەی دی تـەواو دەبـی.

+ ئینشـاڵڵا قوربـان، لەکاتێکـی چاکـدا تـەواو دەبـم، والەکۆتایـی سـاڵ نزیـک دەبینـەوە و قـەرارە لـەم چەنـد ڕۆژە مۆڵەتمـان بـدەن بـۆ خوێنـدن و ئیـدی ناتوانـم بێمـەوە لات.

- لەبـەر چاومـە کـەدەڕۆی چەنـدە بیـرت دەکـەم، وەلـێ ئیـدی ناچاریـەو دەبـێ پێـی قایـل بیـن، ئێسـتا بـا بەیەکـەوە بگەڕێینـەوە، دڵنیـام ڕۆحـی ئیلهامیـش ئاسـوودەیە.

مەولـەوی ئـەو ڕۆژە بەغەمبـاری گەڕایـەوە و چـی وای بـۆ نەخـورا، شەوەکەیشـی چاردارەکـەی ئیلهـام وەکـو مۆتەکـە یەخـەی گرتبـوو، ئینجـا یەکـە یەکـە گوتەکانـی مامۆسـتا و ئیسـڕای دەهاتنـەوە یـاد و خەویـان لـێ دەزڕانـد.

بۆ بەیانی زوو هەڵسا و وەڕێ کەوتەوە بۆ قوتابخانە، لەڕێگادا بیری لەوە دەکردەوە ئەمساڵیش وا تەواو دەبێ و ئەگەر چارەیەک بۆ بابەتی سەناریا نەدۆزێتەوە و نەتوانێ عیشقەکەی دڵی پێ ڕاگەیەنێ ساڵی دواتر دەبێتە پۆلی شەشی ئامادەیی و ئیدی ئەو کاتەی ئێستای نابێ و کارەکەی لێ گوپچڕ[٢٣٨] دەبێ. هەر بەو خەیاڵەوە خۆی کرد بەقوتابخانەدا، لەنێوەندی دەرگاکە چاوی بەئەمیر کەوت، هەر هێندەی زانی خێرا دەستی گرت و بەرەو قوژبنێک کێشی کرد.

+ ها ئەمیر بۆچی وا ڕام دەکێشی، خەریک بوو باسکم دەربێنی؟

- دوێنێ دیار نەبووی سیراج؟ پێم بێژە هێشتا سەناریات لەخەیاڵە ها، تخوا هێشتا لەخەیاڵتە؟

+ ئەمە چ قسەیەکە لەم کاتەدا، چۆن لەخەیاڵم نییە ئەمیر، ئەو بووەتە پاژێک[٢٣٩] لەمن.

- دوێنێ شەو بیرم لەتۆ دەکردەوە، واخەریکە دەبینە پۆلی شەش و ئەم هەموو ساڵە تۆ یەشتا بەخەیاڵی کچێک دەژی. بۆچی دەستی لێ هەڵناگری، ئایا کاتی ئەوە نییە ژینێکی لێوانلێو لەکامەرانی بۆخۆت دەستەبەر بکەی برا؟ دونیا پڕیەتی لەکچ، کورە دڵنیابە زۆر لەو جوانترو شلک[٢٤٠] و شۆختر دەدۆزیتەوە. تۆ چۆن بەخەیاڵی کەسێک دەژی کەبە منالی بینیوتە ها سیراج؟ بەخوا من خەمی تۆمە برا بەخوا.

+ ئەم قسە بێجایانە چییە دەیکەی ئەمیر؟ تابەیانی لۆمەم بکەی من لەئاست لۆمەکانت لەکەڕی دام.

- دەی کەوایە دەتوانی تاچەند ئارام بگری و هەروا بمێنیتەوە؟

سیراج بەتۆزێ تووڕەییەوە: ئەمیر نەلۆمەم بکەو نەداوای ئارام گرتنیشم لێ بکە، خۆت دەزانی کە قەرارم نەماوە و حاڵم زۆر پەرێشانە، نەتبیستووە کە نالی دەفەرموێ:

قوربان مەحاڵە پێکەوە بن سەبرو ئیشتیاق
خاریج لەنەسی ئایەیە تەکلیفی لا یەتاق

---

٢٣٨- گوپچڕ: دژوار.

٢٣٩- پاژ: بەش ، جوزئێک.

٢٤٠- شلک: نازک ، گەنج.

مەحاڵە عیشقی یار لەدڵتابێ و بتوانی ئۆخژن بی، چون ئەمە لەتوانای مرۆڤدا نییەو خوداش تەکلیفێکی نەکردووە بەدەر لەتوانای ئێمە.

- باشە گەر ناوی ئەو قوتابخانەیەت بدەمێ کەئەو کچەی لێیە دەتوانی بڕۆیتە بەردەمی و ئەو نامەیەی بگەیەنیتە دەستی؟

+ ئەمیر تخوا پێم بێژە، ئایا لەگەڵ من گونجاوە چوونە بەردەم قوتابخانەیەکی کچان؟ شەرمەزاری قاپی خوا دەبم، ئەی خەڵکی چۆنم لێ دەدوێن گەر کاری وا بکەم؟

- ئێ کورە وەڵا لەژیانم چشتی وەک تۆم نەدیوە نا، خۆشم دەوێ و ناشتوانم پێی بێژم، شەرمەزاری قاپی خوا دەبم، کورە تۆ بۆ وا هەژاری، خەمی تۆمە خەمی تۆ، سوێند بەخوا وا بڕوا خۆت دەکوژی، چاوت لێیە چەند لاواز بووی.

+ تۆئاڕاستەی ڕێگایەکم بکە لەگەڵ شەرعدا یەکانگیر بێ، چوونە بەردەم قوتابخانە بەمن ناکرێ.

- باشە هەواڵێکی زۆر خۆشم لایە بۆت، بەس باجاری بڕۆینە ژووری لەکاتی پشوودا بۆتی باس دەکەم.

مەولەوی هێندە خەمی ئەو بابەتەی بوو، لەکاتی کۆتا هاتنی وانەی یەکەم خێرا خۆی گەیاندە ئەمیرو دەربارەی هەواڵەکە پرسیاری لێ کردەوە.

- ئەها مەولەوی برام، ئەم جارەیان هەواڵەکە هەر زۆر خۆشەو کارەکەش بۆ تۆ ساناترە.

+ ئێ دە بێژە خەریکە دڵم دەتەقێ.

- سەناریا لەهەمان ئەو قوتابخانەیە کە خوشکمی لێیە سیڕاج، ئەمساڵ خوشکم چۆتە ئەوێ. من چەند جارێک باسی سەناریام بۆ ئەو کردبوو، نازانم چۆنی ناسی بوویەوە، دوێنێ هاتەوەماڵێ و لێی دوا.

+ بۆچی خوشکت لەکوێیە؟

- ئەو لە (شادی)یە، ئەها قوتابخانەیەکی نوێیە لەشارۆچکەی شیلێ، لەم چەند ساڵەدا بنیات نراوە، یەکێکە لەقوتابخانە نایابەکان، لەوێ چاوی پێ کەوتووە.

مەولەوی کە لەخۆشیاندا لێوانی بەیەکدی نەدەکەوتنەوە هاتە گۆ: ئەمە مایەی دڵخۆشیە ئەمیر، تۆ بڵێی خوشکت نەتوانێ چشتێکمان بۆ بکا، پێم بێژە؟

- مەولـەوی گیـان، خوشـکی مـن خوشـکی تۆشـە، وەلـێ مەرجە ئـەو ڕازی بـێ کارێکی وا بـکا. دڵنیابـە قسـەی لەگـەڵ دەکـەم و زۆری لەگـەڵ دەڵێـم، ئـەو تـۆ زۆر چـاک دەناسـێ و چەندیـن جـار هاتوویتـە ماڵـمان و چێشـتی دەسـتی دایکمـت خـواردووە.

+ گـەر کارێکـی وابکـەی کـە ئـەم نامەیـە بـگا، ئەمیـر تەنیـا ئـەو نامەیـە بـگا، خـۆ گـەر ڕازیـش نەبـێ دڵ و دەروونـم دادەمرکـێ و لـەو حاڵـەی ئێسـتام باشـتر دەبـم.

- وەلـێ ئاگاداربـە، خراپتریـن کار ئەوەیـە لەئێسـتادا پێـی بێـژی. واخەریکـە لەکۆتایـی سـاڵ نزیـک دەبینـەوە و لـەم چەنـد ڕۆژە مۆڵـەت دەدرێیـن بـۆ خوێنـدن. دڵنیابـە گـەر لەئێسـتادا ڕاییگەیەنـی وەڵامێکـی بـاش وەرناگـری، بۆیـە گـەر بەگوێـم دەکـەی ئـەم هاوینـەش خـۆت کـڕ بکـەو لەسـەرەتای وەرزی خوێنـدن کارەکـە ئەنجـام دەدەیـن.

+ وەلێ تا ئەوکات چۆن بەرگە دەگرم؟

- دەگـری دەگـری مەولـەوی، تـۆ تەنـێ بەهێزبـە، ئـەم هەمـوو سـاڵە چاوەنـووڕ بوویتـە دەی بـا ئـەم مـاوە کەمەشـی لەگـەڵ بـێ. وەلـێ لـەم مـاوەدا زۆر خەیاڵـی مەکـە بـا شـوێنەوار لەسـەر خوێندنەکـەت دانەنـێ.

مەولـەوی هـەر کـە گەڕایـەوە دووبـارە نامەکـەی دەرکـرد، کەلەنێـو جانتاکەیـدا حەشـاری دابـوو. بیـری لـەوە دەکـردەوە دەبـێ چ حاڵێکـی هەبـێ ئـەو دەمـەی کـە نامەکـەی دەگا بەسـەناریا. باشـە گـەر سـەناریا بـۆ مـن نەبـوو چیـم لـێ دێ؟ تـۆ بڵێـی شـێت نەبـم؟ نـا نـا بابیـر لـەم بابەتـە نەکەمـەوە لەئێسـتادا، واچاکـە نامەکـە تـەواو ڕێـک بخـەم، چـون ئـەم جارەیـان هـەر بەڕاسـتی لەوەیـە بەدەسـتی بـگا. باشـە دەچمـە بانەکـەو تـۆزێ بەدەنـگ دەیخوێنمـەوە نەبـادا هەڵەیەکـم کردبـێ و هەسـتی پـێ نەکـەم.

**بەناوی خودای بەخشندە**

ڕووناکیت باش... دەمهەوێ سەرەتا بم ناسی، ناوم (سیڕاج)ە، لە ئاو و هەوای دڵگیری شاخان چاوم هەڵهێناوە. هەر لەقوتابخانەی ئەو دێیە جوانکیلەش خوێندوومە. یەکێ بووم لەو قوتابیە زیرەکانەی کە لەپۆلەکەماندا هاووێنەم نەبوو، تاکو ڕۆژێکیان لە پێنجی سەرەتاییدا دوو قوتابی نوێ هاتن بۆ پۆلەکەمان، پێم وابێ کەدەزانی ئەم دووانە کێ بوون.

ناویان (سەناریا) و (شەیما) بوو، بەڕاستی ئەوان زیرەک و چالاک بوون، بەتایبەتی چاو سەوزەکەیان. هەر لەو دەمەی چاوانم کەوتنە سەری درکم بەگۆڕانکاریەکی نوێ کرد لەژینمدا.

سەرەتا ویستم کێبەڕکێی لەگەڵ بکەم و لێی ببەمەوە لەزیرەکیدا، وەلێ تۆ بڵێی بتوانم ئەم کارە بکەم؟ لەبری ئەم کێبەڕکێیە تووشی چشتێکی تر بووم کە پێی دەڵێن (خۆشەویستی). سەرەتا ئەم وشەیە هێندە لام نامۆبوو بەباسکردنی قاقا دەیگرتم، وەلێ بەچیدا بزانم کەڕۆژێ دێ دەکەومە داویەوە؟

بەڵێ خۆشەویستی سەناریا بەچەشنێ دەمارەکانی دڵمی تەنیەوە کە ئێستاشی لەگەڵدابێ هیچ چشتێ هێزی دەرکردنی ئەم عیشقەی نییە. ئیدی ڕۆژ بەڕۆژ ئەم عیشقە لەتەشەنە دابوو، تەنانەت نەمدەتوانی سەیری ڕوخساری بکەم خێرا هەردوو کوڵم و نێوچاوانم سوور هەڵدەگەڕان.

گەلێ هەوڵمدا ئەم عیشقە نەشارمەوە و هەموو چشتێ بدرکێنم، وەلێ نەمتوانی. ڕەنگە پرسیار بکەی کە بۆ نەیتوانی؟ دەزانی سەناریا وشەیەک هەیە بەناوی (ترس) وا لەمرۆڤەکان دەکا کە نەتوانن ڕازی نێو دڵیان بێننە سەر زار، ئاخر من تەنێ منداڵێک بووم، کەشەرم بێبەشی کردبووم لەسەیری چاوانیشت، چ جای ئەوەی پێت بێژم کە خۆشم دەوێی.

سەناریا.. بیرتە ئەو ڕۆژانەی کەبەیەکەوە چاودێری پۆل بووین، ئای خودایە، بەڕاستی ڕۆژانێکی خۆش بوون، هەمیشە دەگریم بۆ ئەو ساتانە و دەڵێم کاشکی[٢٤١] ئەو ڕۆژانە دەگەڕانەوە.

---

٢٤١- کاشکی: خۆزگە.



ئـەی بیرتـە ئـەو ڕۆژەی کەقوتابییـان هاروهاجیـان دەکـرد، منیـش ناویانـم نەدەنووسـی، تـۆش بـەم هەمـوو جوانـی و ناسـکیەتەوە دەنگـت بەسـەرمدا بەرزکـردەوە و گوتـت گـەر تـۆ ناویـان نانووسـی ئـەوا مـن دەینووسـم.

بەڕاستی تووڕەییشـت هـەر لـێ جـوان بـوو، وەلـێ کاتـێ پێدەکەنـی دەتگـوت مانگـی ئاسـمان سـەری لەزەمیـن داوە و نـوورو ڕووناکـی بەسـەر کـون و کەلەبـەرە تاریکەکاندا پەخـش دەکاتەوە.

ئەمشـەو مـن و پێنووسـەکەم هەردووکـمان دەگریـن، مـن بەئەسریـن و ئەویـش بـە وشـەکانی. ئێسـتا نیـوەی شـەو لایـداوە کەئـەم نامەیـەت بـۆ دەنووسـم، بەتەنیـاو چـاوی تـەڕەوە لـە کونجێکـی ژوورەکـەدا خەریکـی نووسـینم. بەڕاسـتی (سـەناریا) تـۆ دینداریـە جوانەکـەت، ئاکارەبەرزەکـەت، تـەواو سـەرنجی منیـان بـرد. هەرچەنـدە ئـەم شـێوە قەشـەنگە خـودا پێداوەشـت هـۆکارێ بـوو بـۆ کێـش کردنـم، وەلـێ هەرگیـز ئـەم خەیاڵـە نەکـەی کـە تەنـێ لەبـەر جوانـی عاشـقت بووبـم، چـون ئێمـە شـتی باڵاتـر لەجوانیـمان هـەس کەدیـن و ئـاکارە.

ئـەم عیشـقەم هـەر لەدڵمـدا هێشـتەوە تاوەکـو پۆلـی شەشـمان بەکۆتـا گەیانـد، وەلـێ ژینـی چەپگـەرد[٢٤٢] نایەڵـێ هەرگیـز مـرۆی عاشـق چێـژ لەنزیکـی مەعشـوقەکەی ببـا، بۆیـە کاتـی ڕۆشـتنە، ڕۆشـتنێکی بـێ ماڵئاوایـی. ئـەوکات مـن لەتـۆ دابـڕام، چوومـە قوتابخانەیەکـی تـر، وەلـێ کەهاتمـە پـۆل زۆر جیـاواز بـوو، چـون تـۆی لـێ نەبـوو، تـۆی لـێ نەبـوو سـەناریا. ئاخـر مـن ڕانەهاتبـووم بـێ تـۆ بژیـم، بۆیـە هـەر ئـەو دەمـە چورتمـەکان[٢٤٣] گەلەکۆمەکیـان لـێ کـردم.

هەرچۆنـێ بـوو ماڵەکەتانـم دۆزیـەوەو گەلـێ جـار بەلایـدا ڕادەبـوردم و دڵـم ئۆقـرەی دەگـرت، هەتـا ڕۆژێ ژنەوتـم کەماڵـی ئێـوە لـەم جێگایـە نەمـاوە، بۆیـە هێنـدەی دی ئێـش و ئـازاری عیشـق بـەرەو بـێ ئۆقرەیـی و دارمـان هەنـگاوی پـێ هەڵگرتـم.

ئـەو دەمانـە گەلـێ گریـام و دڵـم تەنـگ بـوو سـەناریا، بۆیـە گەلـێ جـار بـەلای قوتابخانـەو ماڵـە کۆنەکەتانـدا ڕادەبـوردم، وەلـێ نـە قوتابخانـە و نـە خانووەکـە تـۆی لـێ نەبـوو. هەمـوو ڕۆژێ ئەسرینـم وەکـو تـاوی بـاران دەڕژاو خەمـەکان پـەردەی

---

٢٤٢- چەپگەرد: ڕۆژگاری ناهەموار.

٢٤٣- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

دڵمیـان کـون کـون دەکـرد، سـەرەنجام بەچەشـنێ لاوازو بێ هێـز کەوتم کەئێسـقانەکانی جەسـتەمت بەڕوونـی دەبینـی.

بەهەرحـاڵ ئـەم چەنـد ساڵەشـم بەشـیوەن و وێـڵ بـوون بەدواتـا تێپەڕانـد، وەلـێ هەرگیـز نەمتوانـی بتدۆزمەوە.

ئیمشەو دڵم پڕە لەخەم، خۆم و پێنووسەکەم دەگرین، وەلێ کەسێ نییە ژیرمان کاتەوە.

گـەر لەبـەر خەڵکانـی چـوار دەورم نەبـێ ئیمشـەو پـڕ بـەدڵ هـاوار دەکـەم (سـەناریا!!!!!!!!!!!!!!). وەلـێ چـی بکـەم لـەم سـەردەمەدا ئەسرینـەکان دەبـێ بەبـێ دەنگـی بێنـە خـوار، نەبـادا کەسـانی دیکـە گوێبیسـتی نرکـەو ناڵەمـان بـن.

شـەو بـەرەو کۆتایـی دەڕواو لەوانەیـە ئیمشـەو نـە مـن نـە پێنووسـەکەم ژیـر نەبینـەوە، وا خەریکـە وەنـەوز[٢٤٤] دەمباتـەوە.

دەزانـی هەمـوو جـارێ دەڵێـم کاشـکی دەبووینـەوە بەمناڵەکـەی جـاران و بەیەکـەوە لەیـەک پۆلـدا بووایـن. هەمـوو جـارێ دەڵێـم کاشـکی دەهاتیـەوە، جـا ئەوجـا بـا هـەزار جـار هـاوارت بەسـەردا کردبـام و بڕسـتت لـێ بڕییـام دەنگـم نەدەکـرد، وەلـێ ئـاخ بـۆ ئـەم ڕۆژانـە کـە ناگەڕێنـەوە.

بیرتـە ئـەو دەمەی کـە هۆنراوەیەکـی (ئەخۆل)م بـۆت خوێنـدەوە و تـۆش داوای ماناکەت لـێ کـردم، منیـش گوتـم ماناکـەی نازانـم وەلـێ هۆنراوەیەکـی خۆشـە. لەڕاسـتیدا سـەناریا ئـەم هۆنراوەیـەم ئـەو ڕۆژە لەسـەر جوانیەکـەی تـۆ گـوت، ئەمـا شـەرمم کـرد ماناکەیـت بـۆ بێـژم، چـی بکـەم... لێـرە نییـت تـا دەیـان هۆنـراوەت بەسـەردا بخوێنمـەوە.

ئـەی ئـەو ڕۆژەی داوام لـێ کـردی کەبێـم لای دایکـت قوڕئـان بخوێنـم، تـۆش بـەو دەنگـە مناڵیـە ناسـکەتەوە گوتـت شـەرمە بـۆ تـۆ دەبـێ کـوڕان لای پیـاوان بخوێنـن.

ئێسـتا هەمـوو قوڕئانـم خوێنـدووەو کۆمەڵـێ قوتابیشـم هـەن، وەلـێ تـۆ لێـرە نـی سـەناریا، تـۆ لێـرە نـی، تـا دەیـان ئایەتـت بـۆ بخوێنمـەوە.

ئـەدی ئـەو ڕۆژەت بیـرە کـە لەوانـەی بیـرکاری یەکـێ لـە ئەرکەکانـم نەنووسـیبۆوە، من و چەنـد قوتابیەکـی تریـش بوویـن، مامۆسـتای بیـرکاری گوتـی (سـەناریا) بیانبـە بۆلای مامۆسـتا فەرهـاد تـا تەمێیـان بـکا، ئینجـا تـۆش ئێمـەت بـردو لـەوێ لێدانمـان خـوارد.

---

٢٤٤- وەنەوز: خەوە نووچکە.

هەموو جارێ دەڵێم کاشکی دەهاتیەوە ئەوجا با هەموو ڕۆژێ لەگەڵ تۆ چووبامە لای تاک تاکی مامۆستاکان و لێدانم خواردبا.

ئیمشەو کەسێ شک نابەم ژێرم کاتەوە و ئەسرینەکانم بسڕێ، چەندە خۆشدەبوو بۆساتێ تۆ هاتبای و لەو گریانەت خستبام، بەس بۆ ساتێ و پتر نا، هیوام وایە ئەو ڕۆژە بێ سەناریا، هیوام وایە.

سەناریا... من گەلێکم خۆشدەوێی، تۆ ڕازی بی یاخود نا ئەم خۆشەویستیە بۆ تاوێ یەخەم بەرنادا. وەگەر تۆ کەسێکی دینداری ئەوا منیش کەسێکی شوێنکەوتەی ئەم ئاینەم.

هیوام وایە منت بیرمابێ و بەخراپی لەناردنی ئەم نامەیەم نەڕوانی، دڵنیابە جگە لەوەی کەدەمەوێ بزانی ئاستی خۆشەویستیم چەندە بۆت هیچ مەبەستی دیکەی دەپشت دا نییە.

گەلێ جار هەوڵم داوە لەیادت کەم، وەلێ گەر کەسێ خانەو لانەی لەنێو دڵ جێگیر کرد، دەرکردنی کردارێکی ئەستەمە. لەوە ناچێ شەو هیچی وای تیا مابێ و خەریکە وەنەوز ڕامدێخێ، لەوەش ناچێ نووسینی من کۆتایی بێ گەر دەستی لێ هەڵنەگرم، بۆیە با ئەوەندە بەس بێ.

لەکۆتاییدا دەڵێم زۆر زۆرم خۆشدەوێی، هیوام وەهایە ڕۆژێ بێت و بەویساڵت بگەم، وە هیوام وایە لەخوێندن و ژیانتدا سەرکەوتووبی و ببی بەو کەسەی خۆت دەتەوێ.

- سیڕاجی مەولەوی – ١٩٨٦ م، شاخان. (چاوەنووڕم ).

دوای ئەوەی مەولەوی تەواوی نامەکەی بەدەنگ خوێناوە هەستی کرد خەریکە ئەسرینەکانی دادەبەزن و پەناگەی چاوانی جێ دێڵن. لەبەر خۆیەوە دەیگوت دڵنیام سەناریا ئەمە ببینێ زۆر کاریگەری لەسەری دەبێ، خۆ ئەویش مرۆڤەو دڵی هەیە، بەڵێ بەڵێ دڵنیام ئەنجامەکەی باش دەبێ.

ئەو شەوە هەر مژووڵی بیرکردنەوە لەم بابەتە بوو کەتا هەڵهاتنی کاروانکوژە[٢٤٥] خەو نەچوویە چاوانی. هەستی بە چاوئێشە و بێهێزیەکی تاقەت پڕوکێن دەکرد، چون ئەوە دوو شەو بوو خەو لەتێری میوانی نەبوو بوو.

---

٢٤٥- کاروانکوژە: ئەستێرەی بەری بەیان.



تا ڕۆژی سێشـەممە نەچوویەوە لای مامۆستا. ئەو دەمانەی لەقوتابخانە دەهاتەوە دابەشی کردبـوو بەسـەر دەورکردنـەوەی وانـەکان و کتێـب خوێندنـەوەو چوونـە لای هاوڕێیانـی.

ڕۆژی سێشـەممە بـە دڕدۆنگیـەوە بـەرەو لای ماڵـی مامۆسـتا وەڕێ کەوتەوە، چـون تازە پرسـەی ئیلهـام کۆتایـی هاتبـوو. هەسـتی دەکـرد عەقیدەکـە زۆری نەمـاوە و دەتوانـێ لـەدوای ئـەوە چشـتی دیکـەش بخوێنـێ، ئـەو دەمـەی گەیشـت خێـرا لـەدەرگای دا.

- شێوازی لەدەرگا دانەکەت هێندە ئاشنایی لەلام هەیە چیدی نایهەوێ بڵێم کێیە.

+ بــەردەم ماڵەکەتــان قوربــان هێنــدە لام ئاشــنا بــووە، لەوەیــە دوای تــەواو کردنــی قوتابخانــەش هــەر جــارەی پێکانــم ڕێ بگــرن بــەرەو ئێــرەم بێنــن.

مامۆسـتا خێـرا دەرگاکـەی کـردەوە و بەخێـری هێنـا. ماڵەکـە لـەدوای ئیلهـام تـەواو سـاردو سڕ ببـوو، هەسـتت دەکـرد دەمێکـە ئـەم لانەیـە جێهێڵـراوە و مـرۆی تێـدا نـاژی.

دوای تـۆزێ قسـە و بـاس و پرسـینی حـاڵ مامۆسـتا ئامـاژەی کـرد کـە سـیڕاج دەسـت بەخوێندنـەوە بـکا.

+ **باسی گروپەکان**

| | |
|---|---|
| هاتوونە چەندین گرووپ و دەستە | هـەر لەدوای نەبی هەتاکو ئێستـــــە |
| یەکـێ لـــەوانە جەهمیەن، دەڵێن | خوا لەگشت شوێنە و سیفەی بۆ مەڵێن |
| گوناهی گەورەش لای موعتەزیلە | کــەوتۆتــە نێوان هـــەردوو مەنزیلــە |
| لــلای مورجیئەش نــابێ زیـــانی | گــوناهـ، گـەر کـەسێ هەبێ ئیمـــانی |
| خــواریجیش هــەر چینێکی تــرە | دەڵـێــن بە گـــوناهـ مـــرۆڤ کـــافرە |

+ تەواو بوو قوربان، بفەرموو.

- سـیڕاج گیـان، لـەدوای پەیامبـەری ئازیزمانـەوە هـەر لەسـەردەمی هاوەڵـە بەڕێزەکانـدا تاوەکـو ئێسـتا بگـرە، چەندیـن گـروپ و فکـرەی جـودا جـودا بەنـاوی دینـەوە سـەریان هەڵـداوە، کەبیـروڕای تایبـەت بەخۆیـان هەبـووە و لەسـەر ڕێچکـەی ئەهلـی سـوننە لایانـداوە.

جـا باسـی هەنـدێ لـەو گروپانـەو بیروڕایـان زۆر بەکورتـی دەکەیـن تاوەکـو بیـان ناسـی. گـەر گەرەکتـە بچیتـە بنج و بناوانیـان دەتوانـی چشـتیان لەسـەر بخوێنیتـەوە و

پتر لێیان حاڵی بی.

(جەهمیە) یان (جەبریە): کۆمەڵێکن سەر بە (جەهم)ی کوڕی (سەفوانن)، کەپیاوێکە زانایان بەباشە لێی نەدواون، لەساڵی (١٢٨)ی کۆچی کوژراوە.

ئەمانە بیروڕایان وایە کەخودا هیچ سیفەتێکی نییە، هەروا دەڵێن قورئان گفتوگۆی خوا نییەو خوداش لەهەموو شوێنێکە، وە مرۆڤ هیچ دەسەڵاتی نییە لەکردەوەکانی و سەرپشک نییە لەکردن و نەکردنی بەڵکو ناچارەو خودا زۆری لێ دەکا، پەنا بەخوا لەم بیرو باوەڕە.

(موعتەزیلە)ش کەچینێکی ترن سەر بەپیاوێکن بەناوی (واسڵ)ی کوڕی (عەتا). دەڵێن ڕۆژێک ئەو واسڵە لەکۆڕێکی پێشەوا حەسەنی بەسڕی ڕوونیشتبوو، لەو کاتەدا کابرایەک هاتە ژوورو بەحەسەنی بەسڕی گوت کە کۆمەڵێک پەیدابوون هەرکەسێ گوناهی گەورە بکا بەکافری دادەنێن، وە هەندێکیش دەڵێن گوناهی گەورە هیچ زیانێکی نییە. لەو کاتەدا پێشەوا حەسەنی بەسڕی بیری لەبابەتەکە دەکردەوە، یەکسەر واسڵ گوتی من ناڵێم خاوەنی گوناهی گەورە کافرەو ناشڵێم موسڵمانە بەڵکو پایەیەکی هەیە لەنێوان موسڵمان و کافر دایە. ئەمەی وت و هەڵسا چوو پاڵی دا بەئەستوندەگەی[٢٤٦] مزگەوتەوە. حەسەنی بەسڕی فەرمووی واسڵ لێمان جیابۆوە و کەناری گرت. ئیدی لەو ڕۆژەوە پێیان دەڵێن موعتەزیلە، واتا کەنارگرتوو.

ئەم واسڵە لەساڵی (١٣١)ی کۆچی مردووە، جا ئەم کۆمەڵەیە دان نانێن بەسیفەتەکانی خودا، بەڵکو دەڵێن خودا خۆی زانایە بەبێ هەبوونی سیفەتێک بەناوی زانست، وە خۆی توانایە بەبێ هەبوونی سیفەتێک بەناوی توانین، ئیدی ئەوانی تریش بەم شێوازە. هەروەها وەکو گوتمان دەڵێن گوناهباری گەورە نە کافرەو نە موسڵمان، وە دەڵێن قورئان ئەزەلی نییە بەڵکو دروستکراوە، دەشڵێن مرۆڤ بۆخۆی کردارەکانی خۆی دروست دەکا، لەباسی قەزاو قەدەر ئەم بابەتە پتر ڕوون دەکەینەوە ئینشاڵڵا.

ئینجا (موڕجیئە)ش چینێکی ترن بیروڕایەکی سەیریان هەیە کەدەڵێن گەر مرۆڤ باوەڕی هەبێ کردنی هیچ گوناهێ زیانی نییە بۆی، واتا خوا سزای نادا، هەروەکو کردەوەی چاکیش لەگەڵ کوفردا سوودی نییە.

---

٢٤٦- ئەستوندەگ: کۆڵەگە.



پاشـان لەهەمـوویـان خراپـتر (خەواریـج) ن، کـە کۆمەڵێکن لەسـەردەمی پێشـەوا (عەلی) پەیدابـوون. بنچینەیـان دەگەڕێتـەوە بـۆ پیاوێـک پێـی دەگوتـرا (زول خوەیسـیرە)، کـە خۆشەویسـتمان لەجەنگـی (حونەیـن) چشـتێکی بـەش دەکـرد، ئـەو پیـاوەش زۆر بەبـێ ئەدەبـی پێـی وت لەخـوا بترسـەو دادپەروەرانـە بەشـی بکە، جا خۆشەویسـت فەرمووی قـوڕت بەسـەر گـەر مـن لەخـوا نەترسـم و دادپـەروەر نەبـم کـێ دادپـەروەرە. لـەو کاتـەدا پێشـەوا عومـەرو هاوەڵێکـی تـر گوتیـان ئـەی پەیامبـەری خـوا مۆڵەتمـان بـدە بیکوژیـن، ئەویـش فەرمـووی وازی لـێ بێنـن چونکـە لەبنچینـەی ڕێچکـەی ئـەودا کۆمەڵێـک دەردەچـن کەقوڕئـان دەخوێنـن و لەگەردەنیـان تـێ ناپـەڕێ، موسـڵمانان دەکـوژن و واز لەکافـران دێنـن، گـەر مـن بمێنـم وەکـو گەلـی عـاد لەناویـان دەبـەم.

+ باشـە قوربـان گـەر خۆشەویسـتمان دەیزانـی ئـەو پیـاوە وایـە بۆچـی ئـەوکات فەرمانی بەکوشـتنی نەکـرد، پاشـان مەبەسـتی چییـە کەقوڕئـان لەگەردەنیـان تـێ ناپەڕێ؟

- سـیڕاج گیـان، خۆشەویسـتمان لەخـۆوە ناجوڵێتـەوە بـێ فەرمانـی خـودا. ئـەو پیـاوە بـێ ئەدەبـی کـرد بەرامبـەر پەیامبـەر و ئـەو بەرماڵـەی سەرشـانی بەتونـدی ڕاکێشـا کـە ملـی ڕووشـاند، وەلـێ ئـەو فەرموویـە هاوەڵەکانـی وازی لـێ بێنـن. دیـارە ویسـتی خـودا لەسـەر ئـەوە بـووە کەئـەو پیـاوە بمێنـێ و جـارێ نەمـرێ. پاشـان مەبەسـتی ئـەو فەرموودەیـە ئەوەیـە کـە ئەوانـە قوڕئـان دەخوێنـن وەلـێ ڕەفتارەکانیـان پێچەوانەیـە و قوڕئانیـش لـەدژی ئەوانـە.

جـا بزانە کوڕم، بەڕاسـتی خەواریج لەهەموو سـەردەمێکدا بوونیان هەیـەو گەلێ زناک[247] هـەن بـۆ ناسـینەوەیان. زۆربەیـان کەسـانی تـازە لاو و هەڵخەڵەتـاون، کـە شـارەزاییەکی ئەوتۆیـان نییـە لەدینـدا و لایـان وایـە کەتەنهـا ئـەوان بەقوڕئـان و فەرمـوودە کاردەکـەن و کەسـانی تـر گومـڕاو سـەرلێ شـێواون. وەلـێ لەڕاسـتیدا درۆ دەکـەن، وەک چـۆن ئەو دەمـەی دەیـان گوتـە پێشـەوا عەلـی دادڕەوی تەنهـا مافـی خوایـە، پێشـەواش فەرمـووی ئـەوە قسـەیەکی ڕاسـتە، وەلێ مەبەسـتتان بـەم قسـەیە ناڕەواییە.

هەروەهـا ئـەوان هێنـدە بایـەخ بەنوێـژو قوڕئـان دەدەن کەخەڵـک سـەری سـوڕدەمێنێ، هـەروەک خۆشەویسـتمان دەربارەیـان فەرموویەتـی کـە کۆمەڵـێ لەئوممەتـی مـن پەیـدا دەبـن قوڕئـان دەخوێنـن، قوڕئـان خوێندنـی ئێـوە لەچـاو هـی وان هیـچ نییـە، نوێـژو ڕۆژووتـان بەرامبـەر هـی وان هیـچ نییـە، قوڕئـان دەخوێنـن وا دەزانـن لەسـوودی وانـە،

٢٤٧- زناک: نیشانە.

وەلـێ لەڕاسـتیدا لـە دژیانـە.

هەروەهـا زۆر بـێ ڕێـزن بەرامبـەر زانایـان و فەرموودەکانیـان وەرناگـرن و دەڵێـن (ئـەوان پیـاون و ئێمـەش پیاویـن)، وە هەمـوو کات ململانـێ لەگـەڵ موسـڵمانان دەکـەن و پەرتـەوازە دەخەنـە نێویـان، وەلـێ بەرامبـەر کافـران وانییـن و گشـت کات گفتوگـۆ لـە وێکچووەکانـی قورئـان دەکـەن، وەکـو پێشـتر باسـی وێکچووەکانمـان کـرد.

هەروەهـا زۆر بەئاسـانی خەڵکـی بەکافـرو هاوەڵگـەر ناودەبـەن لەسـەر گوناهێکـی بچـووک، هـەر بۆیـە خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی خەواریـج لەهەمـوو مـرۆڤ و ئاژەڵێـک خراپـترن.

ئینجـا سـیراج گیـان، دوو چینـی تریـش هـەن کـە (موجەسـیمە)و (موشـەبیهە)یان نـاوە، دەڵێـن خـوای گـەورە لاشـەو ئەندامـی هەیـە، وەکـو دەسـت و قـاچ و چـاو و هتـد...، هـەروا دەڵێـن خـودا دادەبـەزێ و سـەردەکەوێ و لەسـەر عـەرش دانیشـتووە و جێگیـرە، واتـا بەکورتـی جەسـتەو لاشـە بۆخـودا بڕیـار دەدەن بۆیـە ئـەم ناوەشیان لـێ نـراوە.

ئـەم بیروبـاوەڕەش لـە جـوەکان وەرگیـراوە، چونکـە ئـەوان پێیـان وایـە خـودا لاشـەیە، هەروەکـو پێشـەوا (ئیـبن حەجـەری عەسـقەلانی) وای فەرمـووە.

جـا چەندیـن گرۆهـی تـر کەتاوەکـو ئەمـڕۆ سـەریان هەڵـداوەو خۆیـان بەنـاوی ئەهلـی سـوننە ناسـاندووە، پێویسـتە تـۆ بیان ناسـی تاوەکـو لەبیـروڕا هەڵەکانیـان دوورکەویەوە و لەڕێـگا ڕاستەکە لانـەدەی.

+ باشـە قوربـان، ئـەی گـەر کەسـانێ پەیـدا بـبن بڵێـن ئێمـە تەنیـا بەقورئـان ڕەفتـار دەکەیـن و فەرموودەکانـی پەیامبـەری خۆشەویسـت وەلا بنێـن و بەڕاسـتی نەزانـن؟

- ئەمـە لای زۆرێـک لەزانایـان هـەر بەکوفـر هەژمـار دەکرێ کـوڕم. مەگەر نەتبیسـتووە کـە خـودا فەرموویەتـی ئـەوەی پەیامبـەر پێـی دان وەری بگـرن، وە لەهـەر کارێـک قەدەغـەی کـردن مەیکـەن[248]. وە دەفەرمـوێ قورئانمـان بۆتـۆ دابەزانـدووە تاوەکـو بـۆ خەڵکـی ڕوونـی کەیتـەوە[249].

کەوابـوو بەهەمـوو شـێوازێک ئێمـە پێویسـتمان بەفەرموودەکانـی خۆشەویسـت هەیـە بـۆ ڕوون کردنـەوەی قورئـان. خـۆ گـەر فەرموودەکانـی ئـەو نەبـان نەمـان دەزانـی

٢٤٨- سووڕەتی حەشر ، ئایەتی ٧.

٢٤٩- سووڕەتی نەحل ، ئایەتی ٤٤.

کەچۆن نوێـژ بکەیـن و زەکات بدەیـن و حـەج بکەیـن، چونکـە ئـەو بابەتانـە بەکورتـی لەقورئانـدا باسـکراون و خۆشەویسـت ڕوونـی کردوونەتـەوە.

واچاکـە لێـرەدا ئاماژەیـەک بـۆ (بیدعـە) بکەیـن، چـون زۆر کـەس هـەن بەهەڵـە لـەم دەسـتەواژەیە حاڵـی بـوون و خەڵکیشـی پـێ سـەرگەردان دەکـەن.

سـیراج گیـان، بیدعـە واتـا چشـتێکی تـازە پەیداکـراو کەپێشـتر نەبووبـێ، ئەمـەش دەربـارەی ئاینـە نـەک چشـتی دیکـە، چـون گـەر کەسـێک لەبوارێکـدا داهێنانێـک بـکا ئـەوە بەچشـتێکی چـاک ئەژمـار دەکـرێ. لەشـوێنێکدا خۆشەویسـت فەرموویەتـی گشـت داهێنراوێـک گومڕاییـە.

جـا بـۆ ڕوون کردنـەوەی ئـەم فەرموودەیـە پێشـەوا نـەواوی دەفەرمـوێ: مەبەسـتی زۆربـەی داهێنراوەکانـە. وەخـودای گـەورەش لەچەندیـن شـوێندا ووشـەی (گشـت) ی بەواتـای زۆربـەی بەکارهێنـاوە، وەکـو لەشـوێنێکی قورئانـدا دەربـارەی ئەو ڕەشـەبایەی ناردیـە سـەر هـۆزی عـاد دەفەرمـوێ ڕەشـەباکە هەمـوو چشـتی لەناوبـرد [٢٥٠]. دەی خـۆ ناتوانیـن بڵێیـن هەرچـی چشـتە لەنـاوی بـردووە.

جـا پێشـەوا (شـافیعی) لـەم بابەتـەدا فەرموودەیەکـی جوانـی هەیـە کەدەفەرمـوێ: هەرچشـتێ پەیـدا بکـرێ پێچەوانـەی قورئـان و فەرمـوودەی پەیامبـەرو کۆدەنگـی زانایـان و ئاسـەواری پێشـینان بـێ، ئـەوە داهێنراوێکـی گومڕاییـە. وەهـەر چشـتێ پەیـدا بکـرێ پێچەوانـەی ئـەو چـوارە نەبـێ ئـەوا داهێنراوێکـی باشـە. کەوابـوو لـەوە حاڵـی بوویـن کـەوەک چـۆن داهێـنراوی خـراپ هەیـە داهێـنراوی چاکیـش هەیـە.

- دەی بابەتێکی دیکە بخوێنەرەوە.

---

٢٥٠- سوورەتی ئەحقاف ، ئایەتی ٢٥.

## + باوەڕ بەڕۆژی پەسڵان، ڕۆژی یەکلاکەرەوە

ئـەسڵی پێنجەمین ڕۆژی دوایيـــە     چـەندین نیشـانەی لەخـۆ گرتیـە
کاتێ کـە مردین نەمـاین لەنێو ژیـن     بــەرەو ژیـانی بەرزەخـی دەچین
دواتر هەمووەمان گیـانمـان دێتــەوە     بێ ئەوەی هیچمان لێ کەم بێتەوە
ئینجا دەبردرێین گشتمان بۆ مەحشەر     کــە سپی پـاتە و لەم زەویە بەدەر
هەر کە دادەنرێ تـەرازوو مـیــزان     کــردەوەکانمان دەهێننە کـێشــان
چـاکە گــرانتر لە بەهەشتـــایـــە     بە پێچـــەوانـــە دۆزەخ مـاوایـە

+ بفەرموو قوربان.

- سـیراج گیـان، پێنجەمیـن ئەرکانـی ئیمان باوەڕکردنـە بـەڕۆژی دوایـی، کـەوا هاتنـی ئـەو ڕۆژە چەندیـن نیشـانەی گـەورە و بچووکـی هەیـە. لەنیشـانە گـەورەکان پەیدابوونـی دووکەڵێکـە کـە چـل ڕۆژ دەمێنێتـەوەو کافـران هەناسـەیان پێـی تەنـگ دەبـێ و بـاوەڕداران بەهۆیـەوە تووشـی پەسـیو دەبـن. هەروەهـا دەرکەوتنـی (دەجـال) کەپیاوێکـی کافـرەو خەڵکـی گومـڕا دەکات، چـاوی ڕاسـتی کوێـرەو لەنێوچاوانـی نـووسراوە (کافـر). ئەویـش چـل ڕۆژ دەمێنێتـەوە، ڕۆژی یەکەمـی وەکـو سـاڵێک وایـە، دووەمـی بەقـەد مانگێکـە، سـێیەمی بەقـەد هەفتەیەکـە، ئەوانـی تریـش وەکـو ڕۆژی ئاسـایین. پاشـان پەیامبـەر عیسـا (سـەلامی خـوای لێبـێ) دەیکـوژێ. هەروەهـا دەرکەوتنـی (دابـە)، کەئاژەڵێکـە کافـرو موسـڵمان لەیـەک جیادەکاتـەوە و ئەموسـتیلەی پەیامبـەر سـولەیمانی لایـەو نێوچاوانـی کافـری پـێ نیشـان دەکاو دار عەسـاکەی پەیامبـەر موسـای لایـەو نێوچاوانـی بـاوەڕداران پـێ نیشـان دەکا.

هەروەهـا (یەئجـوج و مەئجـوج) کـەوا خەڵکانێکـن دونیـا داگیـر دەکـەن و برسـیەتی بـڵاو دەکەنـەوە، دواتـر بەنـزای پەیامبـەر عیسـا خـوای گـەورە لەناویـان دەبـا.

نیشـانەیەکی تـری هاتنـی قیامـەت بریتیـە لـە سـێ جـار ڕۆچوونـی زەوی لـەلای ڕۆژهـەڵات و لای ڕۆژئـاواو لەجەزیـرەی عـەرەب. هەروەهـا دەرکەوتنـی خـۆر لـەلای خۆرنشـین بەپێچەوانـەی ئێسـتا ئەویـش نیشـانەیەکی تـرە. یەکێکـی تـر دەرکەوتنـی ئاگرێکـە لەیەمەنـەوە کـە خەڵکـی بـەرەو شـام ڕادەکـەن لەترسـی ئـەو ئاگـرە. هەروەهـا هاتنـە خـوارەوەی پەیامبـەر عیسـا (سـەلامی خـوای لەسـەر) لەئاسـمان، کـەوا دەجـال

دەکـوژێ و چـل سـاڵ دەمێنێتـەوە و بەئاینـی ئیسـلام ڕەفتـار دەکا.

نیشـانەی بچووکیـش هـەر گەلـێ زۆرن، وەکـو دەرکەوتنـی (موحەممـەدی مەهـدی) کـە کەسـێکی سـەیدەو نـەوەی پێشـەوا حەسـەنی کـوڕی پێشـەوا عەلیـە. ئـەم بەڕێـزە پەیمانـی پـێ دەدرێ و دەبێتـە پێشـەوای موسـڵمانان. هەروەهـا کوشـتاری زۆرو کـەم بوونـی پیـاو و نەزانیـن و زۆربوونـی ئاشـوب و فەسـادو نەمانـی شـەرم و....هتـد، هەمـووی نیشـانەن لەسـەر نزیـک بوونـی ئـەم ڕۆژە.

کوڕەکەم سیراج، ئەو دەمەی کەوا مرۆڤ مرد، ئەوا پێ دەنێتە نێو ژیانێکی تر بەناوی (بەرزەخ): واتا پەردەی نێوان دونیاو زیندوو بوونەوەی قیامەت، هەروەک خودا فەرموویەتی کە لەبەردەم مردووان پەردە هەیە تاکو ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە [٢٥١].

خۆشەویسـتمان دەفەرمـوێ کەمـردوو خرایـە نـاو خـاک ئـەوا دوو فریشـتەی ڕەش و شـین دێنـەلای یەکێکیـان نـاوی (مونکـەر)و ئـەوەی تریـش (نەکیـر)ە.

جـا ئـەو فریشـتانە لێـت دەپرسـن کـەوا خـودات کێیـە؟ وە ئاینـت چییـە؟ هەروەهـا پەیامبـەرت کێیـە؟ ئەگـەر وەڵامـت دایـەوە بەباشـی ئـەوا گۆڕەکـەت دەبێتـە باخێکـی بەهەشـت. وەلـێ گـەر نەتزانـی ئـەوا دەبێتـە چاڵێکـی دۆزەخ و شـایەنی سـزاو ئـازار دەبـی، هەروەکـو خۆشەویسـت فەرموویەتـی گـۆڕ یـان باخێکـە لەباخەکانـی بەهەشـت، یاخـود چاڵێکـە لەچاڵـی ئاگـر.

ئەم سزایەش بۆ گیان و لاشەی مردووەکەیە.

ئەمـەش بزانـە کـوڕم، کـەوا مـردوو ئـاگادارە بەمرۆڤـەکان و پێویسـتە کاتـێ سـەردانیان دەکـەی سـەلامیان لـێ بکـەی، هەروەهـا خێرکـردن و قوڕئـان خوێنـدن و نـزای زینـدووان سـوود دەگەیەنێتـە مردووەکـە، هەروەکـو پیاوێـک هاتـە لای خۆشەویسـت و گوتـی دایکـم کتووپـڕ مـردوو وەسـیەتی نەکـرد، گومانـم وایـە گـەر فریاکەوتبایـە خێـری دەکـرد، ئایـا گـەر خێـری بـۆ بکـەم پێـی دەگا؟ ئەویـش فەرمـووی بەلـێ.

+ ئـەی قوربـان خۆشەویسـت لەشـوێنێک فەرموویەتـی (ئـەو دەمـەی ئادەمیـزاد مـرد پاداشـتی کـردەوەی خـۆی دەبڕێتـەوە تەنهـا سـێ کـردەوە نەبـێ، خێرێکـی نەبـڕاوە، زانسـتێکی سـوود بەخـش، منداڵێکـی باشـی هەبـێ نـزای بـۆ بـکا ) ئـەوە پێچەوانـە نییـە لەگـەڵ ئـەوەی گوتـت؟

---

٢٥١- سووڕەتی موئمینون ، ئایەتی ١٠٠.

- نـا کـورِم، لـەم فەرموودەیـە بەهەڵـەدا نەچـی بڵێـی قورئـان خوێنـدن و خێرکـردن سـوود بەمردووناگەیەنـن، چـون خۆشەویسـت  فەرموویەتـی ئـەو مرۆڤـە کەمـرد کردەوەکانـی خـۆی دەپچـڕێ، نەیفەرمـووە هـی خەڵکـی پێـی نـاگا، ئەمانـە دوو شـتی جیـان.

+ ئەها، تێگەیشتم قوربان گیان.

ئینجـا هـەر بەپێـی فەرمـوودەی خۆشەویسـتمان ئێسـکی کلینجە کـە ئێسـکێکی بچووکە و لەکۆتایـی زنجیـرەی پشـتی مرۆڤدایـە، نـاڕزێ و لەنـاو ناچـێ. هـەر لـەو ئێسـکەش ئـەو مرۆڤـە لـەڕۆژی قیامـەت دروسـت دەکرێتـەوە.

یەکـێ لەفریشـتە گـەورەکان بەنـاوی (ئیسـرافیل) لـەو ڕۆژەدا فـوو دەکاتـە (سـووڕ) کەشـاخێکە بەژمـارەی گیانلەبـەران کونـی تیایـە و هەمـوو خەڵـک دەمـرن و ئـەو کاتـەی بۆجـاری دووەم فـووی پیـا دەکاتـەوە گشـتی زینـدوو دەبنـەوە بەفەرمانـی خـوا، کەلەباسـی بـاوەڕ بەفریشـتەکانیش لێـی دوایـن. جـا خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: فـوو دەکرێتـە سـووڕ و هەرکەسـێ لەئاسـمان و زەمینـە دەمـرێ جگـە لەوانـەی خـوا حەزبـکا نەمـرن، دووبـارە فووێکـی تـری دەکرێتـێ و گشـتیان زینـدوو دەبنـەوەو چـاوەڕێ دەکەن چیـان بەسـەر دێ [٢٥٢].

ئینجـا سـیراج گیـان، هەروەکـو یەکەمجـار گیانمـان بەبـەردا دێتـەوە و زینـدوو دەبینـەوە بەبـێ ئـەوەی هیـچ کـەم و کوڕیـمان تێدابـێ و پارچەیەکـمان لـێ کـەم بـێ.

پـاش زینـدوو بوونـەوە ئـەو خەڵکـە دەبردرێـن بـۆ گۆڕەپانـی مەحشـەرو لـەوێ کـۆ دەکرێنـەوە، هـەروەک خۆشەویسـت ئاماژەی پێداوە کـە ئەو خەڵکە کۆدەکرێنەوە لەسـەر زەویەکـی سـپی پاتـی وەکـو کولێـرە سـوور کـراوە. واتـا جیایـە لـەو زەویـەی ئێسـتا.

گۆڕەپانـی مەحشـەر شـوێنێکی گەلـێ سـەختە و ڕۆژ بەئەنـدازەی میلێـک لەخەڵکـی نزیکـەو هەرکەسـەو بەگوێـرەی کردەوەکانـی لەئارەقەدایـە. هەنـدێ کـەس تـا گۆزینـگ، هەنـدێ تـا ئەژنـۆ، هەنـدێ تـا پشـدێنی، هەنـدێ تـا دەم و لووتـی لەژێـر ئارەقـدان، هـی واش هەیـە لەژێـر سـێبەری عەرشـی خـوا دایـە و نەهامەتـی نابینـێ.

یەکێکـی تـر لـەکارە گەورەکانی ڕۆژی پەسـڵان پرسـیاری خـوای گەورەیـە لەبەندەکانی هەروەکـو فەرموویەتـی: پرسـیار لـەو کەسـانە دەکەیـن کـە پەیامبەرمـان بـۆ نـاردوون،

---

٢٥٢- سووڕەتی زومەڕ ، ئایەتی ٦٨.



پرسـیار لەپەیامبەرانیـش دەکەین[٢٥٣].

جا هـەر بەندەیـەک پرسیاری لـێ دەکـرێ کـە تەمەنـی چۆن بەسـەر بـردووە، هـەروا کـردەوەی بۆچـی کـردو ماڵەکـەی لەکـوێ هێنـاوە و لەچیـدا ئاڵوگـۆڕی پـێ کـردووە، لاشـەکەی لەچـی بەکارهێنـاوە؟.

هەرکەسـێ دان نەهێنـێ بەگوناهەکانـی ئـەوا ئەندامەکانـی لـەو ڕۆژەدا لەسـەری دەبنـە شـایەد، هـەروەک خـودا لەقورئانـی پیـرۆزدا ئامـاژەی پێـداوە کـە لـەو ڕۆژەدا زوبـان و دەسـت و قاچەکانیـان شـایەدی لەسـەر خەڵکـی دەدەن بـەو کارەی کردوویانـە [٢٥٤].

یەکێکـی تـر لەدیمەنەکانـی ڕۆژی پەسـڵان دانـەوەی کتێـب و دەفتـەری کردەوەکانـە کەلـە دونیـادا فریشـتەکان نووسـیبوویان لـەو ڕۆژەدا وەری دەگریتـەوە. جـا خـوای گـەورە بـەو بەندەیـە دەفەرمـوێ دەفتـەری کـردەوەت بخوێنـەوە و بـۆ خـۆت بەسـی کـەوا لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ خـۆت بکـەی [٢٥٥].

جـا ئـەو دەفتـەر کردەوەیـە لـەلای ڕاسـتەوە بەبـاوەڕداران و مرۆڤـە باشـەکان دەدرێ و ئەوانیـش بەدەسـتی ڕاسـتە وەری دەگـرن. وەلـێ لـەلای چـەپ یاخـود پشـتەوە بەکافـرو خراپـەکاران دەدرێ و ئەوانیـش بەچەپـە وەری دەگـرن، کەئەمـەش نیشـانەی چوونـە دۆزەخیانـە خـودا بمـان پارێـزێ.

جـا لەپـاش وەرگرتنـی دەفتـەر کـردەوەو لێکۆڵینـەوە ئەمجـا تـەرازوو دادەنـرێ و کردەوەکانمـان دەکێشرێـن، وەکـو خـودا فەرموویەتـی کـە ئێمە تـەرازووی دادپـەروەری دادەنێیـن لـەڕۆژی پەسـڵان[٢٥٦]. جـا لێـرەدا هەندێـک دەڵێـن دەفتـەری کـردەوەکان دەکێشرێـن و هەندێکیـش دەڵێـن کـرداره چاکـەکان دەکرێنـە جەسـتەی پـاک و نوورانـی و هـی خراپیـش دەکرێنـە جەسـتەی ڕەش و تاریکـی ئینجـا دەکێشرێـن. هەروەهـا زانایـان فەرموویانـە ئـەم تـەرازووە پێچەوانـەی تـەرازووی دونیایـە و تـای سـووکی نـزم دەبێتـەوەو تـای قورسـی بـەرز.

جـا کەسـێک چاکەکانـی گرانـتر بـوو دەچێتـە بەهەشـت و گـەر خراپـەی گرانـتر بـوو بـەرەو دۆزەخ، خـودا پەنامـان بـدا.

---

٢٥٣- سوورەتی ئەعراف ، ئایەتی ٦.

٢٥٤- سوورەتی نوور ، ئایەتی ٢٤.

٢٥٥- سوورەتی ئیسرا ، ئایەتی ١٤.

٢٥٦- سوورەتی ئەنبیا ، ئایەتی ٤٧.



+ ئەی قوربان ئەگەر چاکەو خراپەی هەردوو وەک یەک بوون چی؟

- ئەگـەر بەئەنـدازەی یەکتر بوون ئەوا لەشـوێنێک لەنێوان بەهەشـت و دۆزەخ دەمێنێتەوە کەپێـی دەڵێن (ئەعراف) پاشـان خودای گـەورە بەمیهرەبانی خۆی دەیباتە بەهەشـت.

ئینجـا پردێـک لەسـەر جەهەنـەم دادەنرێ کەدەبـێ هەمـوو خەڵکـی بەسـەریدا بـڕۆن وەکـو خـودا دەفەرمـوێ: هەمـوو کەسـێ دەبـێ بەسـەر دۆزەخـدا تێپـەڕێ، خـوای گـەورە بڕیـاری داوەو بڕاوەتـەوە، جـا ئەوانـەی خۆیـان پاراسـتووە لەتـاوان ڕزگاریـان دەکەیـن و سـتەمکارانیش لەنێـو دۆزەخ دەهێڵینـەوە [٢٥٧].

جـا ئـەم پـردە پێـی دەڵێن پـردی (سیراط) کـەوا هێنـدە لووسـە قاچـی مرۆڤی لـێ دەخزێ و لەتاڵـی مـوو باریکـترو لەدەمـی شمشـێر تیژتـرەو لەملاو لـەولا قولاب و دڕکـی پێوەیە. ئیمانـداران پێیـدا تێدەپـەڕن بەئاسـانی، هەنـدێ وەکـو چـاو چوقانێـک ، هەنـدێ وەکـو چەخماخـە[٢٥٨] یاخـود بـا یـان وەک باڵنـدەو سـواری ئەسـپ، وەلـێ ئـەوەی ڕەفتـاری چاکی نەبـێ ئـەوا دەکەوێتـە خـوارێ و تووشـی ئاگـری دۆزەخ دەبـێ، پەنـا بەخـوا.

پاشـان هەرکەسـێ لەدونیـا مافـی کەسێکی تـری لەسـەربێ و نەیدابێتەوە ئـەوا لەڕۆژی پەسـڵان لێـی وەردەگیرێتـەوە، هەروەکـو خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی: بـاوەڕداران کـە لەپـردی دۆزەخ ڕزگاربـوون، لەسـەر پردێکـی تـر ڕادەگیرێـن لەنێـوان بەهەشـت و دۆزەخـدا، تۆڵەیـان بـۆ لەیەکـتری وەردەگیرێتـەوە، هـی ئـەو سـتەمانەی لەدونیـا لەیەکتریـان کردبـوو، جـا کەپـاک بوونـەوە ئینجـا مۆڵـەت دەدرێـن بـۆ بەهەشـت.

هەروەهـا باوەڕمـان هەیـە بەحـەوزی کەوسـەر کەئامادەکـراوە بـۆ خۆشەویسـتمان، هەروەکـو خـۆی فەرموویەتـی حەوزەکـەی مـن مانگـە ڕێیـەک گـەورە و فراوانـە، ئاوەکـەی لەشـیر سـپی تـرو لەمیسـک بـۆن خۆشـترە، گۆزەکانـی ئەوەنـدەی ئەسـتێرەی ئاسـمانن، هەرکـەس لێـی بخواتـەوە هەرگیـز تینـووی نابـێ.

جـا هەنـدێ دەڵێـن ئـەو حـەوزە لەگۆڕەپانـی مەحشـەرەو هەنـدێ لەزانایانیـش دەڵێـن بەڵکـو لەپـاش پەڕینـەوەی خەڵکـە لەپـردی دۆزەخ. ئوممەتـی ئـەو خۆشەویسـتە لـەو ئـاوە دەخۆنـەوە و بـۆ جارێکـی تـر تینوویـان نابێتـەوە. وەلـێ کافـران و سـتەمکاران و ئەوانـەی گۆڕانیـان هێناوەتـە سـەر دیـن لـەم ئـاوە ناخۆنـەوە و ڕێگریـان لـێ دەکـرێ.

---

٢٥٧- سوورەتی مەریەم ، ئایەتی ٧١ ، ٧٢.

٢٥٨- چەخماخە: بروسک.




پاشی ئەم هەموو ماندووبوون و لێپرسینەوەیە، ئەم خەڵکە یان دەڕۆن بۆ بەهەشت و لەنازو خۆشیدا دەژین، یاخود بۆ جەهەنەم و ئاگری بڵێسەدار.

جا بەهەشت و دۆزەخ هەردووکیان دروستکراوی خودان و ئێستا بوونیان هەیە و گوێ بەقسەی موعتەزیلەکان مەدە کەدەڵێن هێشتا دروست نەکراون، چونکە خودا فەرموویەتی پێشبڕکێ بکەن بۆ بەهەشتێک کەبەرینی بەقەد ئاسمان و زەویەو ئامادەکراوە بۆ باوەڕداران[259]. وەلەبارەی دۆزەخیشەوە دەفەرموێ خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کەبۆ بێباوەڕان ئامادە کراوە [260].

سەیرکە چۆن هەردووکی بەکاری ڕابردوو هێناوە کە فەرموویەتی ئامادەکراوە.

ئەوەش بزانە کوڕم، کەبەهەشت هەشت دەرگای هەیەو دۆزەخیش لەحەوت نهۆم پێک هاتووە، وە هەردووکیان هەردەم دەمێننەوە و لەناو ناچن. باوەڕداران بەیەکجاری لەبەهەشت دەمێننەوە و بێباوەڕانیش یەکجاری لەدۆزەخ.

- ئیدی گەر پرسیارت نەبن تۆ ئازادی لەڕۆیشتن کوڕم.

لێرەدا ئارای جوانکیلە دەفتەرەکەی دەستی داناو هەستی کرد چاوانی هێزی خوێندنەوەیان نەماوە. خێرا چوو سەیری کاژێرەکەی کرد (١٠)ی شەو بوو، لەسەر جێگاکەی ڕاکشاو لەبەر خۆیەوە گوتی: ئای خودایە من خۆ ئاگام لەکات نەماوە، دەبێ بەیانی زوو هەڵسم بۆ قوتابخانە. سەیرە ئەمشەو دایکم نەهاتە ژوورەکەم پێم بڵێ کاتی خەوتنتە لەکاتێکدا هەموو شەوێ ئەم کاتانە دێ تاوەکو دڵنیابێ لە خەوتنم!.

لەوەیە نەیویستبێ خوێندنەوەکەم لێ بشێوێنێ، چون ئەمە سەروەتێکی گرنگی بابمە بۆم.

ئەی خودایە، باشە ئەمشەو چۆن خەو دەچنە چاوانم، من هەرگیز باوکی خۆم بەم چەشنە نەناسیبوو. باوکە گیان خۆزگە یەک ڕۆژ دەگەڕایتەوە باوانەکەم، بەس یەک ڕۆژ، خودا ڕۆحم بکا بەقوربانت، لەم ڕێگای عیشقە دەرگیری[261] چ ئازارێک بوویت. لەدوای تۆ چۆن گلێنەی هەردوو چاوم نەبن بەڕووبار. خۆ تۆ پێت گوتم دەربارەی عیشق نازانم کاکە، ئەی وات نەگوت؟ دەی ئێستا چی دەخوێنمەوە و چی دەبینم !

---

٢٥٩- سوورەتی حەدید ، ئایەتی ٢١.

٢٦٠- سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی ١٢١.

٢٦١- دەرگیر: تێوەگلان ، تووشبوون.

لێم ببووره، تخوا لێم ببووره، ئێستا هەست دەکەم چەندە ئازاری دڵم داویت کە گوتم تۆ لەم مەسەلەی عیشقە سەر دەرناکەی. ئاخر من چووزانم تۆ چ سەرداری بووی لەم مەیدانەدا.

من هیچ نەبێ دوو سێ ڕۆژ جارێ ماڵی پووره دالیام دێن و مەریەمی کچی پوورم لەبەر چاوانمە کەیەکترمان خۆشدەوێ و هیچ بەربەستێکی واش لەبەردەم بەیەک گەیشتنمان دا نییە. کەچی ناوم لەوە ناوە عیشق و ئازاری پێ دەچەژم، لەکاتێکدا تۆ هەرگیز سەناریات نەدۆزیەوە، تەنانەت ناتوانی نامەیەکیش بگەیەنیتە دەستی باوکە گیان. شەرمەزارم بەرامبەرت بەخوا شەرمەزارم، سوێندت بۆ دەخۆم هەرگیز لەڕێگای هەڵە نزیک نابمەوە چون پەروەردەی تۆم باوانی من.

سەناریا... ئەم سەنارىايە کێیە باوکە کە سەرجەم ژیان و ڕێڕەوی تۆی وەها شڵەژاندووە. لێم ببووره ئەگەر بێژم ڕقم لێی دەبێتەوە، ئاخر ئەو چۆن دەبێ وا لەتۆ بکا چۆن؟

کاشکی دەمزانی ئەو ئافرەتە کێیە، ماوە یاخود مردووە؟ ئەگەر بیدۆزمەوە سوێندبێ پاساری بدەم[٢٦٢]. بێگومان ئەو دایکم نییە، چون ئەو چاوی سەوز نییە و ناویشی سەناریا نییە، دەی ئەو کێیە؟

ئاخر چی دەبوو گەر لەباوکم دوور نەکەوتبایتەوە کچێ چی دەبوو؟ لەوەیە ئەوکات من لەدایک نەبووبام، وەلێ نەبوونی من چاترە لەوەی باوکم ئازار بچەژێ.

دەی ئیمشەو من چۆن بخەوم خوایە، واباشە پرسیاری ئەم سەنارىايە لەدایکم بکەم، نا نا لەوەیە باوکم ئەو بابەتەی بەو نەگوتبێ، نابێ نهێنی باوکم بدرکێنم.

ئەها چشتێکی سەیر، مامۆستا سەناریا، مامۆستای وانەی ئینگلیزیمان، خۆ ناوی سەنارىايە ! ڕێک چاویشی سەوزن ! تۆ بڵێی ئەو نەبێ؟ خەریکە سەرم ژان دەکا، ئەگەر ئەو بێ لێی خۆش نابم.

نا نا چۆن دەکرێ ئەو بێ، خۆ ئەو کەسێکی هێندە پابەند نییە بەدین، ئەوەی باوکم باسی دەکا دەبێ جیا بێ، واچاکە لێی بکۆڵمەوە، ئەگەر ئەو بوو چاکی پاسار دەدەم.

---

٢٦٢- پاساردان: داخی دڵ ڕشتن بەکەسێ.




ئـەو شـەوە ئـارا تاوەکـو بەیانـی دیـەی لێـک نەنـان، بیـری لەهەمـوو ئـەو دێڕانـە دەکـردەوە کەباوکـی بـۆی نووسـیبوو، دەم نـا دەمێکیـش خەیاڵـی دەچوویـە سـەر (ڕەنـج). تـۆ بڵێـی ئـەو کەسـە کـێ بـێ کـە لـەدوو شـوێندا باوکـم نـاوی بـردو گوتیشـی هاوڕێیەکـی دڵسـۆزبە بـۆی؟

بـۆ بەیانـی زوو لەسـەر جێگاکـەی هەڵسـاو چوویـە ناندینەکـە، ڕوانـی دایکـی وا نانـی بەیانـی چـێ دەکا.

+ بەیانیت باش دایکی میهرەبانم.

- ئـای ئـارا گیـان، بەیانـی تـۆش بـاش باوانەکـەم، تاقـە ڕۆڵـە چـاو ڕەشـەکەم، ئـەوە چۆنـە وازوو هەڵسـای؟

+ لەڕاسـتیدا ئەمشـەو نەمتوانـی بخـەوم، دەفتەرەکـەی باوکـم زۆر کاری لێـم کـرد، داوای لێبوردنـم هەیـە دایکـە.

- مـادام لەبـەر ئـەو بابەتـە نەنوستووی لۆمـەت ناکـەم، وەلـێ قەبووڵـم نییـە بـۆ بابەتی دیکـە نەخـەوی، مەگـەر لـە پەرستشـا بی.

+ ناپرسی کە باوکم چی نووسیوە؟

- ئەمە نهێنی نێوان ئێوەیە، لازم نییە من بیزانم.

+ چۆن لەناوی سەناریا دەڕوانی؟ ناوێکی خۆشە؟

- ئـەرێ خـراپ نییـە، ئەمـە چ پرسـیارێکە لـەو دەمەیـدا، مەگـەر ماڵـە هاوڕێیەکـت مناڵیـان بـووەو داوایـان کـردووە ناویـان بـۆ بدۆزیتـەوە؟.

+ نا دایکە، دەی نازانم ئەمە چی بوو هاتە سەر لێوانم.

- قـەرارە ئەمـڕۆ ماڵـی پـوورە دالیـات بێـن، پێـم خـۆش نییـە زۆر لەگـەڵ مەریـەم بەیەکـەوە بدوێـن کـوڕم، ئێسـتا ئێـوە گـەورەن و مناڵەکـەی جـاران نییـن بەیەکـەوە یـاری بکـەن.

ئـارا بەپێکەنینـەوە: دەڵێـی دڵـت لێـم پیـس بـووە دایـە گیـان، دەی ماڵـی خوشـکتن حەتمـەن لەمـن خۆشـترت دەوێـن.

- ئەوە چی دەڵێی ناشیرن، مەگەر کەس هەیە لەئێوە خۆشەویست تر بێ لام.



+ دەی گەر ناشیرنم بۆچی هەموو جار ڕێگریم لێ دەکەی لەچوونە دەرەوە تا چاوێنی لێم نەدا[٢٦٣]؟

لێرەدا ئەو دایک و کوڕە بەزەردەکەنیەوە ڕوونیشتن بۆ نانی بەیانی. ئەو ڕۆژە ئارا هێندە لەدایکی ڕامابوو کە دەتگوت یەکەم جارە دایکی بەم جوانیەوە دەبینێ. ئەو تا ئێستا درکی بەجوانی دایکی نەکردبوو، بۆیە لەدڵی خۆیدا دەیچرپاند کە ئەگەر باوکم سەناریای لەدەست داوە بەڕاستی ڕێی لەفریشتەیەکی دیکە کەوتووە. ئەمەش بۆ تاوێ ئارای خستە خەندەوە، وەلێ هۆکاری خەندەکەی بۆ دایکی نەدرکاند.

لەدوای خواردنی پەنیرو چایی خێرا هەڵساو خۆی ڕێکخست بۆ قوتابخانە، دیاربوو ئانا و ئاریانی بچووکیش یەشتا خەبەریان نەبوو بوویەوە. ئارا دەستی دایکی ڕامووسی وجانتاکەی لەکۆڵ کردو وەڕێ کەوت.

لەڕێگادا هەر بیری لای مامۆستا سەناریا بوو، تۆ بڵێی ئەوبێ یاخود نا، وەلێ ئەمڕۆ وانەی ئینگلیزیان نەبوو. خەیاڵی ئەوەی دەکرد کە مامۆستا ئەگەرچی تەمەنی زۆرە، لێ جوانیەکی بێ وێنەی هەیە. هەرچەندە ئارا لەوانە نەبوو کە لەئافرەتان ڕابمێنێ، وەلێ زۆرجار دەیژنەوت کە قوتابیان لەجوانیەکەی دەدوێن.

وە هەندێ جار دەیان گوت گوایە هاوسەری مامۆستا لەگەڵی ناڕێکەو زۆری ئازار دەدا، دەی ئەگەر ئەمە هەمان سەناریای باوکم بێ کەوایە زۆری زەرەر کردووە.

لەو بیرو ئەندێشانەدا بوو کە گەییە قوتابخانەو یەکەم هاوڕێی چاوی پێ کەوت لەبەر دەرگا (یاد) بوو.

+ سەلام و عەلەیکوم یاد، چۆنی برا گیان؟

- سڵاو لە ئارای مەولەوی، من باشم ئێوە چۆنن؟

+ ئەمڕۆ ئینگلیزیمان نییە وانییە؟

- نابابە بۆچی دەپرسی، نەکا جوانیەکەی مامۆستا سەناریا ئالوودەی کردبی، کورە ئەم چشتانە بۆ تۆ نەباشن ئارا تۆ کوڕی مەلای.

+ بەخوا قسەی بێ جا دەکەی ها، چەند جار گوتوومە حەزم لەو جۆرە شۆخیانە نییە.

---

٢٦٣- چاوێنی: چاوەزار.




- ئێ دە چی بکەم، گەر دوو قسەی خۆش نەکەین لەقوتابخانە دڵمان دەتەقێ.

+ یاد قسەی خۆش جیایە لەگەڵ ئەو جۆرە ڕابواردنانە.

- دەزانی ئارا هەندێ جار ئیرەییت پێ دەبەم کەتۆ ئاوا زیرەکی و هەمووانیش خۆشیان دەوێی.

+ واش نییە ئیدی، تۆش بخوێنە وەکو من زیرەک دەبی، خۆشەویستیەکەش هی ئەوەیە دڵی هیچیان ناشکێنم. وەلێ هەندێ جار زۆرم پێ ناخۆشە کەئامانج بەنەستەلە بانگم دەکات.

- هاهاها نەستەلە، دەی ئەو کوڕە هەر خۆی وایە، ناو و ناتۆرەی لەهەمووان دۆزیوەتەوە. بەخوا مودیکە منیشی ناو ناوە پووتە، لێ من خۆم دەزانم چ ناوێکی بەدوا دێخم.

+ با بچینە ژوورێ بەر لەوەی درەنگ بکەوین.

ئەو ڕۆژە ئارا هێندەی خەیاڵی لای یاداشتەکەی باوکی بوو، هێندە لای وانەکان و هاوڕێیانی نەبوو. ئارەزووی ڕۆشتنی کاتی دەکرد تاوەکو زوو بگاتەوە ماڵێ. ئەو دەمەی چوویەوەش سەیری کرد ماڵی پوورە دالیا لەوێن و مەریەمیش بە عەزیەیەکی ڕەشی تۆخەوە کە نێوی پڕبوو لەستێرەی ورد ورد، دەتگوت لەئاسمان گەڕاوەتەوە، چاوەنووڕی[264] بینینی ئارای دەکرد.

ئارا دوای بەخێرهێنانی میوانەکان چوو دەستنوێژێکی شۆردو نوێژی نیوەڕۆی بەئۆخژنی کردو تۆزێ لەژوورەکەی خۆی ڕاکشا تا کاتی ئامادەبوونی خواردن. هێندە گرنگی بە مەریەم نەدا وەکو جاری جاران، کەئەمەش مەریەمی وەدڵ تەنگی خستبوو.

لەکاتی نان خواردن هەموو لەسەر سفرەیەک کۆبوونەوەو مەریەم لەبەرامبەر ئارادا ڕوونیشت و تاو نا تاوێ بەتیلەی چاوان سەرنجی دەدایێ. وەلێ خەریک بوو دڵی شەقی دەبرد لەو بایەخ نەدانەی ئارا.

دوای نان خواردن کاک ئادەمی باوکی مەریەم، بەئارای گوت: مامۆستای کوردی داوای نووسینی ڕاپۆرتی لەقوتابیان کردووە و دەڵێن ئارا لەم بوارانە شارەزای چاکی هەیە، بۆیە گەر یارمەتیەکی مەریەم بدەی سوپاست دەکەین کوڕم.

---

٢٦٤- چاوەنووڕ: چاوەڕوان.



خاتــوو داليـا خێـرا هاتــە دەنــگ و گوتــی: ئــەوان بـا بڕۆنــە ئەودیــو بــۆ خوێندنەکــە، چــون لــەو هەڵایــەی ئێمــە هیچیــان بۆ نانــووسرێ.

مەریــەم هەڵســاو ئــاراش بەناچــاری بەدوایــدا بــەرەو کتێبخانەکــە، وەلــێ بــەر لــەوەی بــڕۆن بانگــی ئانــای خوشــکی کــرد کەبــێ لەگەڵیــان ڕوونیشــێ، ئەمــەش تــەواو مەریەمــی خســتە تووڕەییــەوە.

- دەزانی ئەمڕۆ زۆر گۆڕاوی، بۆچی وا بێ مەیلی لەگەڵمدا، مەگەر هیچ لەمن ڕوویداوە؟

+ نـا مەریــەم هیــچ نەبــووە، تەنــێ ئەوەیــە کەئێمــە ئیــدی گەورەبوویــن و ناکــرێ وەکــو جــاران لەگــەڵ یەکدا ڕوونیشــین و بدوێیــن. ئەمــە مانــای ئــەوە نییــە تــۆ چشــتێکت لــێ ڕوویدابــێ یاوەخــۆ خــراپ بیت، بەڵکــو ئاوەهـا شــەرعی تــرە.

- ئانا تۆ بڕۆ تۆزێکی تر وەرەوە باشە جوانکیلەکەم، ئێمە دوو سێ گوتەمان هەیە بەیەکەوە.

+ ئــارا بەتووڕەییــەوە: نەڕۆیــت ئانــا، ســەیرکە مەریــەم، هیــوام وایــە تــێ بگەیــت لێــم، لەتــۆ پــتر حــەزم لەقســەکردنە، وەلــێ گونجــاو نییــە، گــەر وادەکــەی ناچــاری هەڵســان دەبــم، تــەواو؟

- مەریەم بەدڵ تەنگیەوە: تەواو.

+ باشــە ڕاپۆرتەکــەت دەربــارەی چــی بــێ؟ ئەمانــەی دەســتە ڕاســت هەمــووی کتێبــی ئەدەبیــن.

- نازانــم، دەربــارەی هــەر شــاعیرێک کەئــارەزووی دەکەیــت، ژیــان و بەرهەمەکــەی، وەلــێ لەپێنــج لاپــەڕە کەمــتر نەبــێ.

+ نازانــم ئەمــە تــۆی بۆچــی بــوو؟ هــەر لــەژووری وات گوتبـا و خــۆم دەمنووســی، دەی خــۆت مژوولــی کتێبــان بکــە تامــن تــەواو دەبــم. ئــەو دیوانــی مەولەویــەم بــەرێ لەســەر ئــەو دەینووســم، ئانـا تــۆش دەســت بــدە کتێبــێ هــەروا ڕوومەنیشــە بەدیارمانــەوە.

لــەو دەمەیــدا ئــارا مژوولــی نووســینی ڕاپۆرتەکەبــوو دەنگــی مەریەمــی ژنــەوت کــە شــیعرێکی وەفایــی دەخوێنــاوە:

غەمزەدەی خۆتم نیشانەی تیری موژگـانم مـەکـە
عـاشقی ڕووتـم عـــەزیـزم تیرە بـارانم مــەکــە

بـەس دڵــم بشکێنە بەو ئەبرۆیە بۆ مــاچی دەمت
مەمدە بەر تیغ و لەسەر هیچێ لەگـریـانم مـەکـە

عــاشقی خەندێکی تــۆم با بەس بـەئاهو نـاڵـە بم
بولبولم پەروانە نییم و حـــەز بەسووتانم مــەکــە

+ ئــەرێ مەریــەم خــۆ نەمگــوت بەدەنگــی بــەرز کتێــب بخوێنــەرەوە و نووســینەکەم لــێ تێــک بــدە. ئەگــەر ڕاســت دەکــەی دیوانەکــە لەگــەڵ خــۆت ببــە و لەماڵــەوە بیخوێنــەرەوە، وەلــێ دەزانــم هــەر مەبەســتتە تانــەو پــەلارم لــێ دەی.

مەریەم بەزەردەکەنیەوە دیوانەکەی داناو کتێبێکی دیکەی بەدەستەوە گرت.

دوای موددەتــێ ئــارا ڕاپۆرتەکــەی بەکۆتــا هێنــا و دایــە دەســتی مەریــەم و بــۆ ژووری میوانــان هەنــگاوی هەڵگــرت.

- بــەرەو کــوێ ڕادەکــەی ئــارا، هــەر بهێڵــە سوپاســێکت بکــەم، ئــەوە کــوڕی مەلایــان هەمــوو وان، یــان هــەر بەختــی منــە تــۆ وا دەرچوویــت؟.

+ سوپاســی نــاوێ مەریــەم، مــن بــۆ ئــەو بابەتانــە لەخزمەتــم و بەیارمەتــی دانی کەســانی دی دڵخــۆش دەبــم، وەلــێ کارمــان تــەواو بــوو، واچاکــە بڕۆینــەوە ژووری میوان.

ئــەو ڕۆژە تــا نوێــژی عــەسر میوانداریەکــە بــەردەوام بــوو، ئــاراش نەختــێ لەگەڵیــان ڕوونیشــت و دواتــر چوویــەوە ژوورەکــەی و هەنــدێ لەئەرکەکانــی قوتابخانــەی جێبەجــێ کــرد.

ئیــدی دوای ڕۆشــتنی ئــەوان خێــرا دەفتەرەکــەی باوکــی لەنێــو جانتاکــەی دەرهێنــاو دەســتی پــێ کــردەوە.



# کۆتا وانە

کۆتا ڕۆژی چوونە قوتابخانەی سیڕاجی مەولەوی لەگەڵ کۆتا ڕۆژی وانەی بیروباوەڕەکەدا چاک ڕێکەوتبوو، بۆیە ئەو ڕۆژە بە جەختیەکی[٢٦٥] پتر لەڕۆژان هەنگاوی دەنا. سەرەتا وەکو هەموو جاران لەدەرگای مامۆستای دایەوە، هەستی دەکرد کەئیدی بۆ ماوەیەکی زۆر لەم دەرگایە ناداتەوە، ئەمەش تۆزێ نارەحەتی دەکرد.

- تۆی سیڕاج گیان؟

+ ئەرێ قوربان، مەگەر نەت گوت لەدەرگا دانەکەت دەناسم.

- دەی هەر وایە، وەلێ خەیاڵ نەکەی ئەمە لەدەرگادانی کۆتایی بێ، دەبێ دوای نەمانی وانەکەش لەیادت نەچینەوە.

+ ئەوپەڕی بێ وەفاییە قوتابی فێرکەرو ڕێ نیشاندەری خۆی بیربچێتەوە.

مامۆستا خێرا هات و دەرگاکەی لێ کردەوە، وەکو جاران هەواڵ پرسینێکی گەرم لەنێویاندا گوزەرا، تا ئەو کاتەی مامۆستا ئاماژەی بەمەولەوی کرد دەست بەخوێندنەوەی وانەکە بکات.

---

٢٦٥- جەختی: چالاکی و چاپووکی.

+ **تکای خۆشەویست لەڕۆژی دوایی**

بێزارن خەڵکی لە ساعەی مەحشـــەر لەلای ڕەهبەران دەردەبڕن کەســـەر
تـا تکـا بکــەن بۆیان لـەم ئێـشــە هیچ کامیان خۆیان نادەن لەم کێشە
ئەو دەمەی دەچن بۆلای(موحەممەد) تکـاکـار ئــەوە و نـاکـــرێتەوە ڕەد

+ بفەرموو مامۆستا گیان.

- سیراجەکەم، لەگۆڕەپانـی مەحشـەردا کـەوا شـوێنێکی ئێجـگار سـەختە وەکـو پێشـتر لێـی دوایـن، خەڵکـی زۆر بێـزارو ناڕەحـەت دەبـن و دەڕۆن بـۆلای پەیامبـەران تاکـو تکایـان بۆبکـەن لای خـوداو لـەو ناڕەحەتیـە ڕزگار بـن.

خۆشەویسـتمان فەرموویەتـی: لەگۆڕەپانـی مەحشـەر خـوای گـەورە خەڵکـی کۆدەکاتـەوە، هـەوڵ دەدەن و دەڵێـن واچاکـە داوای تـکا بکەیـن لای خـوا تاکـو لـەم ڕاوەسـتانە ڕزگارمـان بـکا. پاشـان دەچنـە لای پەیامبـەران ( ئـادەم و نـوح و ئیبراهیـم و موسـاو عیسـا سـەلامی خوایـان لێبـێ ) تـا لـەلای خـوا تکایـان بـۆ بکـەن، جـا هەریـەک لـەوان دەڵـێ مـن لـەو پلەیـە نییـم، ئینجـا دێنـە لای مـن و منیـش مۆڵـەت لەخـوا وەردەگـرم و خـودا مۆڵەتـم دەدا.

بەڵـێ لـەو کاتـە نالەبـارەدا کەهێنـدە سـەختە پیـری دونیـا دیـدە وەکـو سـاوای لێـدێ و منداڵـی تێـدا پیردەبـێ و لەترسـا ڕیشـی سـپی هەڵدەگـەڕێ و هیـچ کام لەپەیامبـەران ناتوانـن تـکا بـۆ خەڵکـی بکـەن تاکـو خـودا لـەم حاڵـە ڕزگاریـان بـکا. هەرکەسـە خەریکـی دەردو حاڵـی خۆیەتـی، تاوەکـو خۆشەویسـتی ئێمـە سـەری خـۆی لەکڕنـۆش دادەنـێ و هەڵـی ناگـرێ تاوەکـو بانگـی لـێ دەکـرێ، سـەرت بەرزکـەوەو قسـە بکـە، گوتەکانـت دەبیسـرێ، تـکا بکـە لێـت وەردەگیـرێ، داوای چی دەکـەی پێـت دەبەخشرێ، ئەویـش وەکـو مانـگ سـەری خـۆی بـەرز دەکاتـەوەو هـەر بیـری لای ئوممەتەکەیەتـی و دەڵـێ ( ئوممەتـی مـن، ئوممەتـی مـن ). ئیـتر تـکا بـۆ هەمـوو خەڵـک دەکا لەکافـرو موسڵمان، تاوەکـو دادگا دەسـت پـێ بـکاو خەڵـک لـەم ڕاوەسـتانە ڕزگاربـن و خـوداش تکاکـەی قەبـووڵ دەکا.

ئـەم تکاکردنـە پێـی دەوتـرێ (تـکا گەورەکـە). جـا تکاکـردن بەگشـتی لـەم ڕۆژەدا پێنـج جـۆرە. یەکـەم: ئـەوەی تـازە باسـمان کـرد تاوەکـو دادگای خەڵـک دەسـت پـێ بـکا.

دووەم: تکاکردن بۆ تاوانباران تاکو خوای گەورە نەیان باتە دۆزەخ. سێیەم: تکاکردن بۆ ئەوەی هەندێ موسڵمان بەبێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشت، وەکو خۆشەویست فەرموویەتی خوای گەورە بەڵێنی داومێ کە حەفتا هەزار کەس لەئوممەتم بەبێ پرسیار بخاتە بەهەشت. چوارەم: تکاکردن بۆ زیادکردنی پلەو پایەی هەندێ کەس لەبەهەشت. پێنجەم: تکاکردن بۆ ڕزگارکردن و دەرکردنی هەندێ لەو گوناهبارانەی چوونەتە دۆزەخ.

جا بزانە کوڕم، یەکەم و سێیەم بەتایبەتی هی پەیامبەری خۆشەویستمانە، سێیەکانی تریش جگە لەئەویش دەتوانن بیکەن لەپەیامبەران و زانایان و شەهیدان و پیاوچاکان و فریشتەکان، هەروەک خۆشەویست دەربارەی شەهیدان فەرموویەتی کە شەهید تکا بۆ حەفتا کەس لەخزم و کەسی خۆی دەکا. هەروەها خوای میهرەبانیش دەفەرموێ تکای منیش ماوە، چەنگێک لەدۆزەخ دەداو کۆمەڵە خەڵکێک دەردێنێ کە پێست و گۆشتیان تاسەر ئێسک سووتاوە.

- گەر پرسیارت نییە بابەتی دواتر بخوێنەرەوە.

+ **باوەڕ بە قەزا و قەدەر**

| | |
|---|---|
| شەشەم باوەڕە بە قەزاو قەدەر | بیرکردنەوە لێی دەتخاتە خەتەر |
| قەزاو قەدەری خودایە گشت شت | هیچ کەس لەبارەی نازانێ وەک بت |
| هەستان دانیشتن، هەم مردن و ژین | خۆشی و ناخۆشی هەم بەپێ ڕۆین |
| هەمووی بەویست و زانستی خوایە | ئەندازە و بڕیار لەبۆی درایە |

+ بفەرموو مامۆستا گیان.

- سیڕاج گیان، شەشەمین ئەرکانی ئیمان باوەڕکردنە بەقەزاو قەدەر، کە نهێنی خودایەو لەناو دروستکراوەکانی شاردوویەتیەوەو کەس نایزانێ، بۆیە بیرکردنەوە لەقەزاو قەدەر کارێکی نەباشەو دەتخاتە ماندوویەتیەوە. واچاکە خەیاڵت لەسەری نەبێ چون هەر خودا دەیزانێ و بەندە سەری لێ دەرناکا.

قەزا بریتیە لە ویستن وخواستی خودا، واتا بڕیاردان و شت دروستکردنی خودا لەئەزەلدا. وەلێ قەدەر بریتیە لەدروستکردنی شتەکان لەلایەن خودا، هەریەک لەکات و وادەی خۆی و لەسەر ئەو ئەندازەی کەوا بڕیاری داوە، وەکو خۆی

فەرموویەتی: خوا هەموو چشتی دروستکردووە و ئەندازەشی داناوە[٢٦٦].

جا هەموو چشتێک بەقەزاو قەدەری خوایەو هیچ کەسێ لەبارەی نازانێ، تەنانەت پەیامبەران و فریشتەکانیش. هەرچی دەیکەی و دەبێ گشتی بەویست و زانستی خودایەو ئەندازەو بڕیاری بۆ داوە لەئەزەلدا، وەکو هەستان و دانیشتن و مردن و ژیان و خۆشی و ناخۆشی و ڕاوەستان و ڕۆیشتن و....هتد. بەهەشتی یاخود دۆزەخی هەردووکی لای خودا ژمارەیان زانراوە لەئەزەلداو هیچ لەژمارەیان کەم و زیاد ناکرێ.

+ کەوابوو قوربان مادام هەموو چشتەکان ئاوا دیاری کراون، بۆچی ئێمە لێی پاڵ نەدەینەوە ، دەی مادام شوێنەکەمان لەئێستاڕا دیاری کرابێ هەوڵ و کۆششمان بۆچی؟

- کوڕی خۆم پێویستە ئێمە هەر هەوڵ دەین و ناکرێ بڵێین مادام شوێنەکەمان دیاری کراوەو نووسراوە نابێ ئێمە هیچ بکەین، چون لەو کاتەی خۆشەویستمان فەرمووی: هەریەک لەئێوە شوێنەکەی لەبەهەشت و دۆزەخ نووسراوە، گوتیان ئەی پەیامبەری خوا، بۆچی بەتەمای ئەو نووسینە پاڵ نەدەینەوە و واز لەکار نەهێنین؟ فەرمووی ئێوە دەست بەکاربن، هەرکەسە ئەو ڕێگایەی بۆ ئاسان دەکرێ کەبۆی دروستکراوە.

کەوابوو ئەوەی بەهەشتی بێ کردەوەی بەهەشتیان دەکاو ئەوەی دۆزەخی بێ کردەوەی دۆزەخیان دەکا، خودای گەورەش زۆری لێناکا کەئەو کارە بکا بەڵکو تەنیا زانستی هەیە بەکارەکەی.

جا نەکەی کە گوناهێک دەکەی گوناهێکی تری بێنیتە سەرو بڵێی لەزانستی خوا ڕابوردووە کە من ئەو کارە دەکەم و نووسراوە، ئەگەر نەیکەم زانستی خوا ڕاست دەرناچێ!

بۆچی تۆ دەفتەری زانستی خودات لابوو؟ نووسراوی (لەوحی مەحفوز)ت لەبەر بوو؟ چ خەمی دیکەت نەبوو تەنها لەوە دەترسای زانستی خوا بەنەزانین دەرچێ؟ ئەم جۆرە کەسە پۆزشەکەی لەکارە قێزەونەکەی گەلێ خراپترە.

بزانە ئەوەی لەزانستی خودا لە(لەوحی مەحفوز) نووسراوە ئەوەیە کەتۆ بەئارەزووی خۆت لەفلانە شوێن و کاتدا تاوانێک دەکەی و هیچ کەسێک زۆری لێ نەکردووی. وەلێ لەدوای پەشیمان بوونەوە لەگوناهەکە دەتوانی بڵێی کەگوناه

٢٦٦- سوورەتی فورقان ، ئایەتی ٢.



و پەشیمان بوونەوەکەم کەهەردوو بەئارەزووی خۆم بوو، هەردووکیان لەزانستی خودا هەن و لە لەوحی مەحفوز نووسراون.

ئەوەش بزانە کە خودای گەورە فەرموویەتی هەرکاتێ کات و وادەی مەرگ هات نەساتێ دوا دەکەوێ و نەپێش دەکەوێ [٢٦٧].

کەوابوو مەرگی هیچ گیانلەبەرێ دوا ناکەوێ و پێشیش ناکەوێ، وە ئەو کەسەی کە دەشکوژرێ هەر بەکات و وادەی مەرگی خۆی دەمرێ. بەڵام مرۆڤ کوژەکە بۆیە تۆڵەی لێ دەسەنرێ چونکە کارێکی قەدەغەکراوی ئەنجام داوە بەبێ ئەوەی کەسێ زۆری لێ بکا.

ئینجا لەشوێنێکدا خۆشەویست فەرموویەتی کە سەردان و چاکە لەگەڵ خزمدا تەمەن درێژ دەکا. زانایان دەربارەی ئەم فەرموودەیە گوتوویانە مەبەست ئەوەیە کە تەمەنی بەپیت و پڕ خێر دەبێ و ڕێی بۆ ئاسان دەبێ بۆ خواپەرستی و کرداری بەسوود، چونکە تەمەنی مرۆڤ وەکو گوتمان پاش و پێش ناکرێ.

ئینجا کوڕی ئازیزم، گشت کاتێ نزا بکە دوا کردارت چاکەبێ، چونکە دواین کردەوە چاوی لێ دەکرێ، هەروەک خۆشەویست فەرموویەتی بەندەی وا هەیە کردەوەی دۆزەخیان دەکا وەلێ بە بەهەشتی نووسراوە، بەندەی واش هەیە کردەوەی بەهەشتیان دەکا وەلێ بەدۆزەخی نووسراوە، کردەوەکان بەپێی کۆتاییەکەی ڕەچاو دەکرێ.

ئەوەش بزانە کەهەموو کردارەکانی ئێمە دروستکراوی خوان، وەکو خودا خۆی فەرموویەتی: خوای گەورە ئێوەو کردەوەکانی دروست کردوون [٢٦٨].

+ یانی گەر ئێمە چاکە بکەین یان خراپە هەردووکی خودا دروستی دەکا؟ گەر تۆزێ ڕوون کردنەوە بدەن قوربان.

- سیڕاج گیان، ئەو کەسەی دەڵێ مرۆڤ خۆی کردارەکانی خۆی دروست دەکا پێی بێژە کاتێ ئەو کارەت ئەنجام دا چەند شاڕەگ و وردە ڕەگ و چەند جومگە لەکاتی کارەکەتدا جووڵایەوە؟ چونکە کەسێک خۆی کارێک دروست بکا دەبێ ئەو وردەکاریانەش بزانێ.

---

٢٦٧- سووڕەتی یونس، ئایەتی ٤٩.

٢٦٨- سووڕەتی سافات، ئایەتی ٩٦.

ئێمە لەگەڵ ئەوەی دەڵێین خودا کردارەکانمانی دروست کردووە، دەشڵێین مرۆڤ پەیوەندی وەدەست هێنانی بەم کارەوە هەیە، یانی مرۆڤ کارەکە وەدەست دێنێ، نەک هیچی لەدەست نەبێ و زۆر لێکراوبێ. چونکە گەر خەڵک پەیوەندیان بەکردارەکانین نەبوایە بۆ خودای گەورە ڕەوا نەدەبوو داوامان لێ بکا ئەو کارە بکەن یان مەیکەن.

هەروەها جووڵانەوەی مرۆڤ بەویستی خۆی زۆرجیایە لەگەڵ جووڵانەوەی لەکاتی لەرزو تادا.

خودا دەفەرموێ: بەندە پاداشتی وەدەست هێنانی چاکە بۆ خۆیەتی و سزای وەدەست هێنانی خراپەش لەسەر خۆیەتی [٢٦٩]. کەوابوو ڕاستە خودا چاکەو خراپەکە دروست دەکا، وەلێ ئەوە مرۆڤە کەبیەوێ کامیان بەدەست خاو سەرپشکە لەکردن و نەکردنیان.

ڕێبازی شێخ ئەبولحەسەنی ئەشعەری لەم بارەیەوە وایە کەدروست کردنی کردارەکانمان تەنها توانای خوای گەورەیە بەبێ کاریگەری توانای مرۆڤ، ئەم مرۆڤە تەنیا شوێنی کاریگەریەکەیە و توانای خوا لەو دەردەکەوێ. هەروەها لای پێشەوا ماتوریدی کارەکانی مرۆڤ دروستکراوی خوایە، بەڵام ئەو دروستکردنە مەرجێکی هەیە ئەویش بەدەستهێنانی بەندەیە، وەکو گوتمان خودا دروستکەریەتی و ئێمە بەدڵی خۆمان چاکەکە یان خراپەکە دەست دەخەین.

ئێستا سیڕاج گیان، کاری مرۆڤ دوو بەشە، یەکەم: خواست و توانای خودا پەیوەندی پێوە دەبەستێ بەبێ پەیوەندی مرۆڤەکە. دووەم: خواست و توانای خودا بەهۆی خواست و تواناو سەرپشکی مرۆڤەکە پەیوەندی پێوە دەبەستێ، واتا خوای گەورە توانایەکی داوە بەمرۆڤ کە بتوانێ چشتێک ئارەزووی لێ بکا ئەنجامی بدا، خواستێکی واشی پێداوە کەبتوانێ لەچاکەو خراپە لایەکیان هەڵبژێرێ و سەنگی بدا بەسەر لاکەی تر. جا کاتێ مرۆڤ لایەکیانی هەڵبژارد ئەوا تواناکەشی ڕوو لەو لایە دەکا بۆ ئەوەی کارەکە بکا، لەو کاتەدا خواست و توانای خودا پەیوەندی پێوە دەبەستێ و کارەکەی بۆ دروست دەکا.

کەوابوو ڕوون بوویەوە کەخودا کردارەکانمان دروست دەکا باش بێ یا خراپ، بەڵام ویست و توانایەکی بەئێمە داوە کەوا لایەک هەڵبژێرین بەسەر لاکەی تردا،

---

٢٦٩- سوورەتی بەقەرە، ئایەتی ٢٨٦.

جائەگـەر بەنـدە ئـەو توانایـەی خـۆی لـە وەدەسـت هێنانـی چاکـەدا بەکارهێنـا ئـەوا خـودا چاکەکـەی بـۆ دروسـت دەکا، خراپـەش بـەم جۆرەیـە.

جـا ڕێـگای موعتەزیلـەکان واز لێبێنـە کەدەڵێـن بەنـدە خـۆی کردەوەکانی خۆی دروسـت دەکا ، هەروەهـا بەڕێـی جەبریەکانیـش دامەچـۆ کەدەڵێـن بەنـدە هیـچ دەسـەڵاتێکی نییـە لەکردەوەکانـی و سەرپشـک نییـە تێیـدا، بەڵکـو ناچـارە و خـودا زۆری لـێ دەکا.

جـا ئەگـەر بڵێـی بۆچـی خـودا چاکـە بـۆ ئەحمـەد دروسـت دەکاو خراپـەش بـۆ زەیـد؟ ئـەوا دەڵێیـن هەرکـەس ئامادەییەکـی تایبەتـی تیایـە و بەگوێـرەی ئامادەییەکـەی خـودا چشـتی بـۆ دروسـت دەکا. هەروەهـا خـودا بەگوێـرەی توانامـان داوامـان لـێ دەکا وەکـو خـۆی فەرموویەتـی: خـودا داوا لەکـەس نـاکا تەنهـا بەگوێـرەی توانـای نەبـێ [٢٧٠].

جـا کـوڕی خۆم، خودای گەورە هـەر کارێ بکا لێی ناپرسرێ، وەکـو دەفەرموێ لەو کارەی خـودا دەیـکا پرسـیاری لێ ناکرێ بـۆ وای کرد، وەلێ بەندەکان پرسـیاریان لـێ دەکرێ [٢٧١].

هەروەهـا واجـب نییـە لەسـەر خـودای گـەورە چ کارێـک سـوود بەخشـە ئـەوەت بـۆ بـکا، چونکـە هـەر ئـەو دروسـتکەرە و گشـت کارەکان بەویسـتی خۆیەتـی.

- هیچ پرسیارێکت نییە؟

+ هەرچەنـدە بابەتەکـە تـۆزێ ڕەق بـوو، وەلـێ هیچـت نەهێشـتەوە تـا پرسـیاری لـێ بکـەم، مرۆڤیـش هێنـدە بیـر لـەو بابەتـە نەکاتـەوە چاکـە.

- کەواتە بڕۆ سەر بابەتی دواتر.

## + باسی عەڕش و کورسی

عــەڕش مەخلووقی خودایە یـەقیــن گـەورەترە لە ئاسمـان و زەمیــن
کورسیش هەر لەژێر ئەودایە و بەرز گوشادە بۆ گشت ئاسمان و عەرز
هەردوو مەخـلووقی خـودان بزانــە پێویستی نـابێ بەهیچ لـەوانــە

+ بفەرموو مامۆستای ئازیزم.

---

٢٧٠- سووڕەتی بەقەڕە ، ئایەتی ٢٨٦.

٢٧١- سووڕەتی ئەنبیا ، ئایەتی ٢٣.

- عەرش دروستکراوێکی خودایە کەوا پێچکەی هەیەو لەئاسمان و زەوی گەورەترەو شوێنەکەی لەسەرەوەی ئاسمانەکانە لەسەر ئاو، وەکو خودا خۆی لەقورئاندا ئاماژەی پێداوە کە عەرشەکەی خۆی لەسەر ئاو دروست کردوە [٢٧٢]. هەروەها عەرش هەشت فریشتە هەڵی دەگرن لەسەرەوەی گشت فریشتەکان، هەروەکو لەقورئاندا تۆمارە [٢٧٣].

کورسیش هەر دروستکراوێکی خودایە، دەکەوێتە ژێر عەرش و گەورەترە لە زەوی و ئاسمانەکان، وەکو خودا فەرموویەتی کەوا کورسیەکەی ئەو فراوانی بۆ ئاسمان و زەویە[٢٧٤]. ئینجا ئەوەش بزانە کورم کە هەر حەوت ئاسمان و زەوی بەرامبەر کورسی وەکو ئاڵقەیەکی فڕێدراو لەبیابان وایە، کورسیش لەبەرامبەر عەرش بەم شێوەیەیە.

خوای گەورە هەردووکیانی دروست کردووەو پێویستیشی پێیان نییە وەکو خۆی دەفەرموێ: خودا دەوڵەمەندە و پێویستی بەهیچ بوونەوەرێک نییە [٢٧٥].

- هیچی تیا ماوە؟

+ یەک بابەت، وا دەیخوێنمەوە.

## باسی لەوح و قەڵەم

لەوح تەختێکە هەرچی کرداره    بە ئەمری خودا تێیدا تۆمارە

قەڵەمیش یەکەم مەخلوقی خوایە    تا دونیا مابێ نووسینی لایە

+ فەرموو قوربان گیان.

- سیراج گیان، (لەوحی مەحفوز) ئەو تەختەیە کەوا هەرچی کردارە تێیدا نووسراوە و خوای گەورە ئەندازەی هەموو بوونەوەری تێدا تۆمار کردووە، وەکو خۆی دەفەرموێ کە هەرچی حەزبکا دەیسڕێتەوە و هەرچی حەزبکا دەیهێڵێتەوە، چوون لەوحی مەحفوز لەلای خۆیەتی [٢٧٦].

---

٢٧٢- سوورەتی هوود ، ئایەتی ٧.

٢٧٣- سوورەتی حاقە ، ئایەتی ١٧.

٢٧٤- سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی ٢٥٥.

٢٧٥- سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی ٩٧.

٢٧٦- سوورەتی ڕەعد ، ئایەتی ٣٩.

کەواتــە ئــەوەی لەزانســتی خوادایــە هەردەبــێ ببــێ، بــەڵام لەســەر ڕووی لەوحــی مەحفــوزدا خــوای گــەورە هەرچــی حەزبــکا دەیســڕێتەوە. بــۆ نموونــە: لــەو تەختەیــە نــووسراوە، فــڵان کــەس بەدبەخــت دەبــێ، وەلــێ لەزانســتی خــوای گــەورەدا ئەگــەر بێت و دۆستایەتی فــڵان پیــاوی خــراپ بــکا ئــەوا بەدبەخــت دەبــێ، کەچــی ئــەو کەســە هاوڕێیەتــی پیــاوە خراپەکــە نــاکا و لەبــری بەدبەختــی بەختیــار دەردەچــێ.

+ کەواتــە ئــەوەی لــەم تەختەیــە نــووسراوە دەکــرێ گۆڕانــکاری بەســەردابێ، وەلــێ ئــەوەی لەزانســتی خوادایــە ناگــۆڕێ.

- بێگومان وایە، چاک تێ گەیشتووی.

هەروەهــا قەڵــەم ئــەو پێنووســەیە کەخــوای گــەورە هەمــوو چشــتەکانی لــەم تەختەیــەدا پــێ نووســیوە، هــەروەک خۆشەویســتمان فەرموویەتــی یەکــەم چشــت خوا دروســتی کرد قەڵــەم بــوو، جــا پێــی فەرمــوو بنووســە، قەڵــەم گوتــی خوایــە چــی بنووســم؟ فەرمــووی ئەنــدازەی هەمــوو چشــتێ بنووســە تــا دونیــا وێــران دەبــێ.

جــا ئــەوەش بزانــە کەزانســتی خۆشەویســتمان لــەو زانســتەش زیاتــرە کــە لــەم تەختەیــە نــووسراوە، چونکــە ئــەو زانســتی دوای دونیــا وێرانبوونیشــی لابــووە و بــۆ هاوەڵانــی بــاس کــردووە، وەلــێ هــی ئــەم تەختەیــە تاکــو دونیــا وێــران بوونــە.

هەروەهــا خۆشەویســت فەرموویەتــی خــودا ئەنــدازەی هەمــوو چشــتی لــەم تەختەیــە نووســیوە پەنجــا هــەزار ســاڵ پێــش ئاســمان و زەوی.

کەواتــە هــەر چشــتێک خــودا دایناب‌ــێ ببــێ ئــەوا هــەر دەبــێ و هەرگیــز زانســت و زانیــاری خــودا نەزانــی بەســەردا نایــێ.

- وابزانم کۆتایی هات وانییە؟

+ بەڵێ قوربان گیان، سوپاس بۆ خودا.

- خــودا پاداشــتی نووســەرەکەی و پاداشــتی ئێمــەش بداتــەوە کەئــەم ماوەیــە پێیــەوە مــژووڵ[٢٧٧] بوویــن. دڵخۆشــم کەتوانیــت بەکۆتــای بگەیەنــی ســیڕاج گیــان، هیــوای ســەرکەوتنم بــۆت هەیــەو نــزای خێرمــان بــۆ بکــە، لەیادمــان مەکــەو ســەرمان لــێ مەبــڕە، چــون تــۆ ئەندامێکــی ئــەم ماڵەیــت.

---

٢٧٧- مژووڵ: سەرقاڵ.



+ قوربـان ئێمـه پێویسـتمان بەنـزای خێـری ئێوەیـه لـەم ڕێـگا دژوارە تـەژی[٢٧٨] لەکۆسـپ و تەگەرەیـە و لەیادیشـت ناکەیـن تـا دونیـا مـاوە. ئەمـڕۆش کۆتـا ڕۆژی قوتابخانەیـە و دوای دوو هەفتـەی تـر تاقـی کردنـەوەی کۆتایـی سـاڵە، بۆیـە لەوەیـە تـا ماوەیـەک یەکـتری نەبینینـەوە.

- دەسـت لـەو شـەریعەتە هەڵمەگـرە و ئەوەندەی دەتوانـی خۆتی لێ شـارەزاکە، بزانە بەبێ ئـەو هەرگیـز ڕێت لەحەقیقـەت ناکەوێ. ئیـدی دەتوانی بڕۆی تاوەکـو دوا نەکەوی.

دوای تەوقەیەکـی گـەرم و یەکـدی لـە ئامێزگرتـن سـیڕاج دەسـتەکانی مامۆسـتای ڕامووسـی و ماڵئاوایـی لێکـرد، وەلـێ هـەردوو چاوەکانیـان نوقمـی نێـو ئەسرینـی تـەڕ بـوون. دەتگـوت بـۆ جارێکـی دی ڕێیـان لەیـەک ناکەوێتـەوە و کۆتـا دیـداری ژیانیانـە. تاوەکـو سـیڕاج لەچـاوان ون بـوو مامۆسـتا لەبـەر دەرگاکـە تێـی ڕوانـی، ئەویـش دەم نا دەمـێ لای دەکـردەوە بـەلای مامۆسـتا و بەپشـتە دەسـتی چاوانـی تـەڕی دەسـڕی.

---

٢٧٨- تەژی: پڕ.



## گەیشتنی نامەکە

فیدای دەست و بازووت دەبم ئەی کاکی نامەبـــەر
نـامەم ببە بــۆ یــارو ڕێی مەترسی بگــرە بـــەر

سـیڕاجی مەولـەوی ئێسـتا پۆلـی شەشـی ئامادەییـەو بەیانـی یەکـەم ڕۆژی چوونـەوە قوتابخانەیەتـی ، لەلایـێ کەیفـی سازە چون ئیـدی لەوەیە نامەکـەی بگاتـە دەسـتی سـەناریا، لەلایـێ ناڕەحەتـی ئەوەیـە کەپۆلـی شـەش قۆناغێکـی سـانا نییـە و مانـدوو بوونێکـی زێـدەی گەرەکـە. ئیـدی ناتوانـێ هێنـدە بخولێتـەوە و خەیاڵـی مەحبووبـی بکا.

ئـەو ڕۆژە خێـرا خـۆی گەیانـدە ئەمیـرو وەکـو زەمەنـی مناڵـی بەیەکـەوە بـۆلای کانـی گـەورەی گونـد وەڕێ کەوتـن و کەوتنـە گفتوگـۆ.

+ بەیانـی سـەرەتای قوتابخانەیـە ئەمیـر، پێویسـتە کارێ بکەیـن تـا بەزوویـی نامەکـەم بگاتـە دەسـتی سـەناریا.

- ئـای سیڕاج، تـۆ چشـت لەبیـر ناکـەی هـا، گوتـم تـا ئێسـتا لەوەیـە لەیـادت نەمابـێ. مـن دووبـارەی دەکەمـەوە، ئێمـە تـازە لاویـن و دونیـا پڕیەتـی لەکـچ، دڵنیابـە لـەوت جوانـتر وەچنـگ دەکـەوێ. تـۆ چووزانـی ئێسـتا ئـەو چـی لێهاتـووە و چەنـدە گـۆڕاوە؟

+ بەڕاستی سەیرم لەگوتەکانت دێ ئەمیر، تۆ دەڵێی ڕۆژێ لەڕۆژان دڵت ئاوێتەی[279] عیشق نەبووە. تۆ کە سووتانی ئێمەت نەدیوە هەر قسەیەکی تێدا بکەی ناپێکی.

- نا سیراج، من خۆم کۆت نەکردووە بەکچێکەوە. خەبەرت لێ هەبوو کە بەمناڵی منیش چاوم لەسەناریا بوو، وەلێ زۆر بەسانایی توانیم وازبێنم. لەدوای ئەو کەسێکی دیکە چوویە دڵم، سەرەنجام لەئەویش دوور کەوتمەوە. ئێستا شۆخێکی دی خانەی دڵی گرتووم، لێ وەکو تۆ خۆم نەکوشتووە بەدوای کەسێکدا بەدەست هێنانی هێندە تەژی بێ لەئێش.

+ دەی ئەمیر من ئەوە ناو نانێم عیشق، من عاشقی بۆ چێژی دەروونی ناکەم، چۆن دەتوانم خەیاڵ لەکەسێکی دیکە بکەمەوە، ئەسڵەن چۆن خەیاڵ و هزرم ڕێگەی ئەوەم دەدا.

- باشە مەولەوی مادام هێندە گەرمی لەسەر ئەو بابەتە کەچوومەوە لەگەڵ خوشکم دەدوێم، هەوڵ دەدەم ڕازی بکەم تا نامەکەت بگەیەنێ.

مەولەوی بەلێوێکی لێوانلێو لەخەندەوە هاتە گۆ: دەی ئاوا قسەی خۆشمان بۆ بکە برا، ئاوا دڵمان بدەرەوە، بەخوا گەر کارێکی وابکەی هەرگیز لەیادی ناکەم ئەمیر.

ئەو ڕۆژە گەلێکیان قسەی شیرین کردو گەلێ سووڕانەوە بەنێو سروشتە جوانەکەی شاخاندا. دیاربوو ئەمیریش لەیارە تازەکەی دەدوا، تا بەرە بەری نیوەڕۆ نەگەڕانەوە ماڵێ.

بۆ بەیانی زوو مەولەوی لەدەرگای ماڵی ئەمیری دا و بەیەکەوە ڕێگای قوتابخانەیان گرت.

+ هەواڵی خۆشت لایە یاخود نا؟

- مەولەوی برا... زۆر داوای لێبوردنم هەیە، دوێنێ هەوڵم لەگەڵی دا، وەلێ ئەو ڕازی نەبوو بەو کارە. دەڵێ لەقوتابخانەی ئێمە زۆر توندن بۆ ئەو بابەتانە، سەناریاش کەسێکی خۆبەزل زانەو شایەنی ئەوە نییە مرۆیەکی چاکی وەکو سیراج وای خۆشبوێ. ئەو بەمناڵی بینیویەتی، ئێستا زۆر گۆڕاوە ، زۆر لەخۆی ڕازیە، ئەو لەچک لەسەرەی ئەو خەیاڵی دەکا نەماوە. ئەگەر هەر زۆر سوورە لەسەر ئەو کارە با خوشکێکی خۆی بنێرێ.

---

٢٧٩- ئاوێتە: تێکەڵ.



+ ئاخر چۆن دەکرێ ئەمیر، خۆت دەزانی نامەوێ ماڵەوە بەم باسە خەفەتبار بکەم، سەرەڕای ئەوەش خوشکی تۆ لەوێ لەگەڵیەتی و یەکدی دەناسن و کارەکەی ساناترە.

- ئێ چی بکەم برا کە ئەو ڕازی نەبێ؟ بەو خوایە لەدەستی من بوایە ئێستا دەمبڕاندەوە.

+ بەخوا ئەوە ئەمەلێکی چاک بوو بۆم، وەلێ دووبارە دڵگران بوومەوە.

- دەی تۆش هێندە دڵ ناسکی، با ماوەیەک لێی گەڕێین لەکاتێکی تردا پێی دەڵێمەوە.

+ کێشەکە ئەوەیە ئۆخژنم[٢٨٠] نەماوە، خۆ کارێکی زۆر نەگونجاو و قێزەونیشە گەر خۆم بڕۆم.

ئەم هەواڵە دووبارە مەولەوی خستەوە ئازار، لەکاتێکدا موددێ بوو هیوایەکی بۆ دروست بوو بوو، وەلێ سانا نییە چورتمەکان[٢٨١] بتوانن چۆک بەعاشق دابدەن.

ناوە ناوە سەرێکی لەبەردەم ماڵی سەناریا دەداو بەدڵێکی تەژی لەئەوین و ئێش دەگەڕایەوە.

لەدوای تێپەڕینی مانگێ لەو هەواڵە ڕۆژێ ئەمیر لەقوتابخانە بەخەندەوە بەرەو ڕووی مەولەوی چوو.

- مزگێنیم بەرێ مەولەوی، هەواڵی خۆشم لایە.

+ یا ئەڵلا دەبێ چی ڕوویدابێ، نەکا عائیشەی خوشکت ڕازی بووبێ؟

- وەڵا ڕێک هێنات برا، دوێنێ دووبارە ئەو باسەم لەگەڵی کردەوە، گوتی ئەوە بۆ هیچ کەسێ ناکەم، لێ سیڕاج وەکو برامان وایە و هاتووچۆی ماڵێمان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم کوڕێکی چاکە و نیەتی خراپەی نییە. ئەوە دەگری سیڕاج؟

+ نازانی چ هەستێکم هەیە ئەمیر نازانی، لەدوای شەش ساڵ خەریکە نامەکەم دەگا، نازانم بگریم یا زەردەکەنیم بێتێ. لەوەیە دوای ئەو هەموو ماوەیە من هەر لەخەیاڵیشیدا وجوودم نەمابێ. ئێستا ئەو نامەیەی منی پێ بگا دەبێ چ هەستێکی هەبێ خودایە؟

---

٢٨٠- ئۆخژن: ئارام.

٢٨١- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

ئەمـە چ تەناهیەکـە[282] بەمنـت بەخشـیوە ئیلاهـی ! ئـای مامۆسـتا هێمـن تـۆ لەهۆنراوەیەکدا دەڵێی:

پـەیامی من بەگوێی ئەو دولبەرە نـازدارە ڕاناگا
نەسیم بێ سیم دەبینێ شل دەبێ بەم کارە ڕاناگا

وەلـێ گـەر هـی تـۆ نەگەیـی ئەوەتـا هـی مـن دەگا، پەیامـی مـن خەریکـە بەگوێـی ئـەو دولبـەرە نـازدارە ڕادەگا.

- سـوێند بەخـوا سـیڕاج گـەر تـۆم نەبینیبـا نـەم دەزانـی کەعیشـقی لـەم چەشـنە هەیـە ! بەڕاسـتی گـەر سـەناریا ڕازی نەبـێ گەوهەرێکـی گرانبەهـا لەدەسـت دەدا.

ئـەو ڕۆژە مەولـەوی هـەر کـە چوویـەوە مـاڵ خێـرا دەسـتی بـۆ نامەکـەی بـردو لەنێـو کتێبـەکان دەری کـرد. ووردو درشـتی نامەکـەی تـەواو خوێندەوە تـا دڵنیا بوویـەوە کەلە هیـچ شـوێنێکدا هەڵـەی نەکـردووە. لەوەیـە ئـەو ڕۆژە پـتر لـە چـل جـار خوێندبێتیـەوە.

لەنێـو زەرفێکـی سـپی تازەدا نامەکـەی پێچایـەوەو هیچی لەسـەر زەرفەکەی نەنووسـی، چـون لەنێـو دەقەکـەدا ئاماژەی بەهەمـوو چشـتێک کردبوو دەربـارەی خۆی.

بـۆ بەیانـی لەقوتابخانـە نامەکـەی ڕادەسـتی ئەمیـر کـردو گوتیشـی بەعائیشـە بڵـێ کەهیـچ قسـەیەک نـەکا دەربـارەی مـن، کاری ئـەو هـەر ئەوەندەیـە بڵـێ کەسـێ ئـەو نامەیـەی بـۆ نـاردووی و لەکاتـی خوێندنەوەیـدا خـۆت ئاشـنای دەبـی، چـون مـن لەنێویـدا ئامـاژەم بەخـۆم داوە.

- تەواو مەولەوی گیان، ئینشاڵا بەیانی لەدەستی سەنارییە.

ئیـدی ئـەو ڕۆژە لەمەولـەوی نەدەڕۆیـی، دەمـێ دەچوویـە ژووری، تاوێکـی تـر بـەرەو دەرەوەی مـاڵ، سـاتێ خـۆی خەریکـی خوێندنـەوە دەکـرد، هەنـدێ جاریـش لەبانەکـە تەراتێنـی بـوو[283]. هەمـوو خولیـاو ماخۆلانـی هاتنـی بەیانـی بـوو.

بەیانـی بـەر لەنیـوەڕۆ، ئـەو دەمـەی مەولـەوی خـۆی توند کردبـوو بـۆ چوونـە قوتابخانە لـەدەرگا دراو هـەر خـۆی بـەرەو دەرگاکـە چوو.

---

٢٨٢- تەناهی: ئاسوودەیی.

٢٨٣- تەراتێن: هاتووچۆ بە هەڕاکردن.



+ ها ئەمیر خۆ هەواڵی خۆشت لایە؟

- کورە دە بووەستە با سەلامێ بکەین، هەواڵ پرسینێ چشتێ.

+ ببوورە برا، وەلێ ئەمشەو خەو نەچۆتە دیەم لەبەر ئەم باسە.

- مژدەت لێبێ ئێستا نامەکەت لەدەستی سەنارياية، تەنێ ماوەیەک چاوەنوورِ بە تاکو دەیخوێنێتەوە و بڕیارێک دەردەکا.

مەولەوی بە ژنەوتنی ئەو گوتەیە توند ئەمیری لەباوەش گرت و پێکەنین و گریەی ئاوێتەی یەکدی کردبوو. ئەو ڕۆژە بەتەنیا خۆی دەزانێ چ هەستێکی هەبوو، بەس خۆی.

لەکۆتاییدا پەیامی مەولەوی گەیشت وەلێ دەبێ چ جۆرە وەڵامێک بۆ ئەم پەیامە بێ خەوشە ئامادە بکرێ؟ ئەوە ئەو پرسیارە بوو کەبەردەوام لە کەللە سەرو دڵیدا تەراتێنی بوو. دەم نا دەمێ لەبەر خۆیەوە دەیگوت تۆ بڵێی دوای ئەو هەموو ساڵە منی لەیاد بێ؟ یاخود تۆ بڵێی چ هەستێکی هەبێ ئەو دەمەی نامەکە دەخوێنێتەوە؟ لەوەیە ئێستا لەنێو دەستانی بێ و خەریکی تێڕامانی بێ، بەڵێ بەڵێ لەوانەشە، ئەی دەبێ وەڵامی چی بێ؟

بەچەشنێ ئەم پرسانە لەنێو دەمار دەماریدا دەچەرخان خەریک بوو ژینی لێ بشێوێنن. ئاخر چاوەنوورِ بوونی کارێکی وەها سانا نییە، چاوەنوورِ بوونی عاشق بۆ خەبەرێکی مەعشوقی لەخودی خۆیدا مردنێکی بێ دەنگە.

ئەوانەی چاوەنووڕی کارێکی لەم چەشنەیان کردووە دەزانن، بەڵێ هەر ئەوان دەزانن.

مەولەوی لەم ماوەیەدا پتر هاتوچۆی مزگەوتی دەکرد، سەرەڕای قورئان وانەی بیروباوەڕیشی بۆ فێرخوازەکانی دانابوو، فێری ئەرکانی ئیمان و ئیسلامی دەکردن.

ئەحمەدی جوانکیلەش هێندەی نەمابوو کەقورئانەکە بەکۆتا بگەیەنێ و خەتمی بکا، ئەمەش مایەی دڵخۆشی بوو بۆ مەولەوی.

ڕۆژی هەینی، بەیانیەکەی ئەمیر لەدەرگای ماڵی مەولەوی داو داوای لێکرد بەیەکەوە پیاسەیەک بکەن، ئەویش بەخۆشحاڵیەوە لەگەڵی وەڕێ کەوت، بەئومێدی ئەوەی خەبەرێکی لەنامەکە هەبێ.

ئەو دەمەی تۆزێ لەدێ دوورکەوتنەوە، هەستی کرد کەئەمیر ناڕەحەت و بێزار دیارە.

+ چی بووە ئەمیر، دڵت بۆ وا توندە؟

- ئەوە نامەکەتە و لەگەڵ خۆم هێناومەتەوە.

ئـەو دەمـەی مەولـەوی لەنامەکـەی ڕوانـی و ئـەم گوتەیـەی بیسـت بـۆ تـاوێ هێدمـە بوو،[٢٨٤] هیـچ نەهاتـە سـەر لێوانـی، خەریـک بـوو زاری تەتەڵـەی دەکـرد[٢٨٥].

+ ئەمە یانی چی ئەمیر، مەگەر ئەوە لای سەناریا نەبوو !

- بەڵێ لای بوو برا، وەلێ بۆمانی گێڕایەوە.

+ یانی چی بۆمانی گێڕایەوە ! دەی کەوایە دەبێ وەڵامێکی بۆی هەبووبێ؟!

- ئەمیـر بەدەنگێکـی غەمگیـن و گریاناویـەوە گوتـی: بەڵـێ هەیبـوو، ئەمـا دڵـم نایـە پێتـی بێـژم سـیڕاج گیـان، بەخـوا دڵـم نایـە.

لـەو دەمەیـدا مەولـەوی ڕەنگـی زەرد هەڵگـەڕاو چەشـنی کەسـێکی لـەرز گرتـوو جەسـتەی بـێ ویسـتی خـۆی کەوتـە جووڵـە، بەدەنگێکـی لەرزۆکـەوە هاتـەوە گـۆ: بێژە ئەمیـر مەمکـوژە، بێـژە بزانـم چـی گوتـووە؟

- سـیڕاج گیـان، سـوێند بەخـوا وەڵامەکـە زۆر دڵ ڕەقانەیـە، نازانـم چـۆن پێتـی بێـژم، بەخـوا گەلـێ دڵ ڕەقانەیـە.

لەگـەڵ ئـەم گوتەیـەدا مەولـەوی توانـای ڕۆشـتنی نەمـاو وێنـەی کەسـێکی سەراسـیمە بـۆ تـاوێ لەشـوێنی خـۆی ڕوونیشـت. چاوانـی تـەژی ببـوون لەئەسریـن، لـەم حاڵـەی ئـەودا ئەمیریـش خـۆی بـۆ نەگیـراو هـەردوو پێکـەوە خۆڵـی سـەر ڕێگاکەیـان وردە وردە تـەڕ دەکـرد.

دوای ماوەیەک کەتۆزێ هێوڵە[٢٨٦] بوونەوە مەولەوی هاتەوە دەنگ:

+ بێـژە ئەمیـر، هەمـوو چشـتێک بێـژە، بەزەیـت پێمـدا نەیەتـەوەو هەمـوو ئەوانـەی سـەناریا گوتوویەتـی بۆمـی بێـژە.

- ئـەو نامەکـەی خوێندبوویـەوە، دواتـر گوتبوویـە عائیشـەی خوشـکم بـڕۆ نامەکـە بـە سـەرو سـەکوتی دابـدەوە و پێـی بێـژە مـن و ئـەو لەیـەک ئاسـتدا نییـن. مـن سـەدانی

٢٨٤- هێدمە: تاسان ، شۆک.

٢٨٥- تەتەڵەکردن: هەڵەکردن لەگفتوگۆدا.

٢٨٦- هێوڵە: هێوربوونەوە.

وەکو ئەوم ڕەد کردۆتەوەو چەندەها کەسی سەرمایەداری خاوەن سواری و خانووی بەرزو قەشەنگ هاتوونەتە داوام و داوای خۆشەویستیان لێ کردووم، ئێستا ئەو هاتووە باسی منالێم بۆ دەکا !

مەولەوی کە خەریک بوو پرزەی دەوەستا و خیزە خیزی لێوە دەهات. ئەسرینەکانی جۆرەها نەقش و نیگاری خەفەتبارانەیان لەسەر ڕوخساری دەکێشا، ڕووی لە ئەمیر کرد و بەدەنگێکی کزۆڵ و گریاناویەوە گوتی: سەیرە ! بەڕاستی سەیرە ! ئەم گۆڕانە بۆچی؟ ئاخر لەبەرچی؟ لەبەر پارە؟ لەبەر دەوڵەمەندی؟ لەبەر جوانی؟ ئەی عیشق؟ عیشق لەکوێیە ! کوا؟ کوا ئەمیر؟

- بەمن مەڵێ کاکە، بەمن مەڵێ، خەریکە دڵم دەردێ سیڕاج.

+ دەمزانی ئەمیر، دەمزانی ئەو گۆڕاوە، وەلێ هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم هێندە گۆڕابێ کەپێی عەیب و نەنگی بێ باسی منالی بۆ بکەم. نەمدەزانی ئەویش وەکو کەسانی دی بەدوای مادده دەکەوێ، ئاخر ئەو دەمانەی من تێم دەڕوانی لەوپەڕی پاکیزەیی دابوو، ئەم لەخۆبایی بوونە بۆچی؟ تخوا بۆچی ئەمیر؟

- مەگری سیڕاج گیان، لەمەودوا نەنگیە بۆ کەسێکی وا لەخۆبایی بگری. ئەی عائیشەی خوشکم نەیگوت ئەو گۆڕاوە سیڕاج؟ بۆچی بڕوات نەدەکرد؟ چەندین جار گوتی گوناهە کەسێکی گەورەی وەکو سیڕاج ئەم خۆ بەزل زانەی خۆشبوێ. ئاخر ئەو هێندە کوڕان لەدەوری هاتوچوون کە خۆی لێ زۆر بووەو جوانیەکەی هەڵی خەڵەتاندووە.

+ نازانم ئەمیر، زوبانم نایەتە گۆ، قسەم لەبیرچوون، تۆ بڵێی جوانی وا لەمرۆڤ بکا؟ ئاخر ئەوەی من دەمناسی کەسێکی دی بوو، هەر دەڵێی ئەم قسانە هی ئەو نیین.

- ئەوەی تۆ دەتناسی فەنتازیایەک[٢٨٧] بوو ڕۆیی، لەمەودوا کەسێک بوونی نییە بەناوی سەناریا. دەزانی خوشکەکەم چەندە هەولی لەگەڵ دابوو کەپێی بێژێ سیڕاج ئەوە نییە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە، وەلێ لەویش تووڕە ببوو.

ئەو دەمەی ئەمیر دەدوا مەولەوی لەجێگاکەیدا سارد ببوو، وەکو کەسێک کەگیانی لەبەردا نەمابێ، نە دەیزانی چی دەڵێت و نە دەشی زانی چی دەژنەوێ، ئەو گرەی نێو دڵی بەس بوو بۆ سووتاندنی تەواوی وجوودی.

---

٢٨٧- فەنتازیا: خەیاڵ.

لەوکاتـەدا ئەمیـر نامەکـەی لەبەردەمـی مەولەویـدا دڕانـدو بـە جۆگەلەکـەدا خزاندیـە خـواریێ. مەولـەوی هەسـتی دەکـرد کەخەریکـە ڕۆحـی ئـەو بەنێـو جۆگەلەکـەدا دەچـێ نـەک نامەکـە، خەریکـە تـەواوی وجـوودی بەنێـو جۆگەلەکـەدا شـۆڕ دەبێتـەوە بـەرەو مـەرگ، خەریکـە هەرچـی لـە ڕابـردوودا بنیـادی نـاوە ئیمـڕۆ لەبـەر چاوانـی لافـاوی فەنـا دەبیـا.

- ئیـتر بەسـە بـرا، تـەواوی کـە، ئـەم ئـازارە کۆتـا بێنـە، ئـەو مـرۆڤ نییـە نـا، گـەر مـرۆڤ بـا وای لێـت نەدەکـرد، دەئیـتر تـەواوی کـەو بیسـڕەوە.

سـیڕاجیش بەهێمنـی و دووچـاوی پـڕ ئەسرینـەوە لەژێـر لێوانـی دەیگـوت: تەواو....تـەواو.....

- ببـوورە سیـڕاج، کەمـێ پێش ئێستا نامەکەتم خوێندەوەو پرسم پێ نەکـردی، من وەکو کورێـک لەکاتـی تێڕوانینـی دا نەمدەتوانـی ئەسرینەکانـم بوەسـتێنم. تێناگـەم کەچـۆن کاریگـەری لەسـەر ئـەو نەبـووە؟ بەڕاسـتی مـن گومانـم لەمـرۆڤ بوونـی وی هەیە.

+ ئەمیـر مـن نەمـردووم؟ تخـوا دەسـتێکم لـێ بدە، هەست بەسڕ بوونـی جەسـتەم دەکەم.

- نامـری نـا سـیڕاج، بەهێـز بـە کاکـە، هـەزاران لەخۆبایـی ناتوانـن چـۆک بـە مەولەویەکـەی ئێمـە دابـدەن، تکایـە بیـر لـەو چشـتانە مەکـەرەوە.

+ هـەر دەڵێـی خـەون بـوو، سـەناریا وەکـو خـەوێ وابـوو، دەمـەوێ ئێسـتا هەڵسم لـەو خـەوە، تکایـە هەڵـم سێنە، نازانـم چۆنـە مـاوم ئەمیـر نازانـم.

نـووسیم پـەیـامی دڵم تا یار بۆلام بـێـتـەوە
بەتـووڕەیی جـوابی دا یەعنی کەنـایـێـتـەوە
گوتی هەزاری وەک تۆ لەدەورم دەخولێتەوە
دڵ بوو بـەچـەندین پاژو تازە چـانـابێتـەوە
دڵڕەقێکی وەکـو ئـەو لـەژین نـادۆزرێتەوە

ئەو ڕۆژە یەکێ بوو لەڕۆژە هەرە سەختەکانی مەولەوی، کەتا مووددەتێ هەستی بەبوونی خـۆی نەدەکـردو کەنارگیـری لەهەمـوو مرۆڤانی دیکە ڕاگەیانـد. پێیەکانـی بەگوپچڕی[٢٨٨] دەیانتوانـی بەسـەر زەویـدا ڕێ بکـەن، ئەویـش تەنـێ بۆکاتـی قوتابخانـە دەهاتـە دەرێ.

---

٢٨٨- گوپچڕ: دژوار.



لەکاتی پێگەشتنی ئەم هەواڵە ناخۆشەدا بۆ بەیانی تاقی کردنەوەی عەرەبی هەبوو، کەئەمەش کاریگەریەکی ئێجگار زۆری لەسەر وانەکانی دانا.

(بەڵێ سەناریا و دەیانی وەکو سەناریاش دەڕۆن، وەلێ عیشق هەر زیندووە).

هەرچەندە ئەو بابەتە تەواوی وجوودی مەولەوی برژاند، وەلێ ئەو جەستەیەی بەعیشق ببرژێ سەرەنجام لەهەموو جەستەکانی دی پتەو ترە.

لەم ڕۆژانەدا دەتگوت مەولەوی کۆڵ و ئازاری هەموو خەڵکی زەمینی هەڵگرتووە. وەلێ بێئاگا بوو لەوەی کە ئەم عیشقە تەنێ خۆ ئامادەکردنێکە بۆ عیشقێکی باڵاتر. بێ هەواڵ بوو لەوەی کەتاکو بەباڵایی بگا دەبێ بەسەر پەیژە چکۆلەکاندا سەرکەوێ.

دوای موددەتێ کەمەولەوی تۆزێ هێوڵە بوویەوە،[289] پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ هاتە دەرێ و بەرەو لای کانیەکە وەڕێ کەوت، چون هەستی دەکرد گەر بەردەوام لەماڵێ بێ لەوەیە ئازارەکەی توندتر بێ و لەنێوی ببا. ئەو دەمەی نزیک بوویەوە لەوێ ڕوانی وا سیروان لەتەنیشتی کانیەکە خۆش لێی ڕاکشاوە، کەچاوی بەمەولەوی کەوت خێرا هەڵساو بەرەو ڕووی بوویەوە.

+ سەلام و عەلەیکوم سیروان.

- عەلەیکە سەلام برا، ئەحواڵت چۆنە؟ ئەرێ تۆ لەکوێی هەر نزیکە شێوەتم لەیاد بچێتەوە؟

+ ئەو ماوەیە حاڵم باش نەبوو، بۆیە نەدەهاتمە دەرێ.

- خێرە برا؟ لەئەمیریشم پرسی گوتی حاڵی خراپە، قەرار بوو لەم چەند ڕۆژە سەردانت بکەم، خۆ هی مەعشوق و چشت نییە؟

+ تەنیایان کردم سیروان، زۆر خراپیان تەنیا کردم.

- من نازانم ئەو کچە کێیە سیڕاج، وەلی چارەسەرێک هەیە ئەگەر ئەنجامی دەدەی.

+ چی یە؟

- لەو دێیەی تەنیشتمان شێخێکی لێیە، دەڵێن بۆ ئەم بابەتانە یەکاو یەکە، نزایەکت بۆ دەکا و ئەم کچە دڵی نەرم دەبێ، چی دەڵێی؟

---

٢٨٩- هێوڵە: هێوربوونەوە.

+ ئـەوەی تـۆ دەیڵێـی فاڵچـی و سـاحیرە نـەک شـێخ، هیـچ شـێخێ کاری وەهـا نـاکا سـیروان، مەگـەر ئـەو فەرموودەیـەت نەبیسـتووە کەهـەر کەسـێ بڕواتـە لای ئـەو جۆرە کەسـانە ئیمانـی نامێنـێ. دەتـەوێ بەکافـری بگەڕێمـەوە بـەردەم خـوداو پەسـڵانیش[290] لەدەست بدەم؟ جارێکی تر شتی وا بڵێی زۆر عاجزم دەکەی.

- تەواو کاکە بمبوورە، باشە ئەی چی دەکەی؟

+ ئـارام دەگـرم تـا خـودا ئارامیـم پـێ ببەخشـێ، کارێـک ناکـەم بـۆ دەسـت خسـتنی دونیـا کەخـودا لەخـۆم بتۆرێنـم، بێگومـان ئـەو هـەر وەهـا نامهێڵێتـەوە.

- کەواتە لەیادی دەکەی؟

+ ئەمـە چشـتێک نییـە لەیـاد بکـرێ، وەلـێ ناچـارم وازی لـێ بێنـم. هیـوام وایـە خـودا کۆمەکیـم بـکاو نـزای خێریـش بـۆ ئـەو دەکـەم، ئەتـۆش بـێ بەشـمان مەکـە لەنزاکانـت.

290 پەسڵان: ڕۆژی دوایی.





## هەڵوەرینی گوڵێکی دی و تەنیاییەکی لەڕادە بەدەر

لەدوای سەناریا دونیا گەلێ چکۆلە ببوویەوە لەبەر چاوی سیڕاجدا، بەچەشنێ کە لەهەر کاتێکدا ئامادەبوو بۆ جێهێشتنی. وەلێ جگە لە ئۆخژن گرتن کاری دیکەی لەدەست نەدەهات.

ئێوارەیەک لەگەڵ خێزانەکەیدا لەو دەمەی مژووڵی نان خواردن بوو لەدەرگا دراو خاتوو ڕەحمە ئاماژەی بەسیڕاج کرد کە دەرگاکە بکاتەوە.

لەدوای کردنەوەی خێرا سیڕاج بەپەشۆکاویەوە گەڕایەوە ژووری و مام سلێمان هاتە گۆ:

- کێ بوو کوڕم؟

+ کوڕەکەی مام واحیدی دراوسێمانە، دەڵێ بەبابت بێژە کوڕە بچووکەکەی مام سوارە کوژراوە. گەر گەرەکیەتی ئامادەی ناشتنی بێ با زوو بێتە دەرێ دەنا جێی دێڵین.

مام سلێمان بەم هەواڵە تەواو شێوا، خێرا لەسەر نانەکە هەڵسا و گوتی:

- ئەی هاوار خوایە، ئەو بەستەزمانە دەبێ بۆ کوژرابێ! پێی بێژە ئەوا هاتم، گەر تۆش دێی زوو هەڵسە سیڕاج.

+ نا بابە من تۆزێ بێ تاقەتم و دەرسیشم هەن.

دوای ڕۆشـتنی باوکـی، مەولـەوی کەوتـە خەیـاڵ کـردن، باشـە کـوڕی بچووکـی مـام سـوارە کێیـە؟ خاتـوو ڕەحمـەش لـەولاوە هـەر دەیگـوت نەمێنـم بـۆ ئـەم مناڵـە بچکۆلـە، دەبـێ کـێ دەسـتی چووبێتـە کوشـتنی، ڕەبـی خـوا هەنجـن هەنجنـی بـکا.

+ باشە دایە تۆ ئەو مناڵەت بینی بوو، چۆن بوو؟

- ئـەرێ وەڵا جارێکیـان کەچوومـەماڵیـان تـازە لەقوتابخانـە دەهاتـەوە. خوشـکە چنـار گوتـی ئـەوە کـوڕی چووکمـە، پێـم وابـێ نێـوی ئەحمـەد بـوو. مناڵێکـی چـاو سـەوزی جوانکیلـە، هـەر دەتگـوت هـی ئـەم خێزانـە نییـە، ڕەبـی خـودا دەوامـی عومـری نـەدا ئـەوەی ئـەو تاوانـەی ئەنجـام داوە.

+ چی....؟ ئەحمەد، ئەحمەد، قوتابیە نازدارەکەم !.

سـیڕاج بـە ژنەوتنـی ئـەو هەواڵـە لەشـوێنی خـۆی بوورایـەوە. خاتـوو ڕەحمـە بەگریـەو ڕۆڕۆ هەڵسـاو بادیـەک[٢٩١] ئـاوی هێنـاو پژاندیـە دەم و چـاوی تـا وەهـۆش هاتـەوە.

هـەر کـە هەڵسـا لەهارژنـی[٢٩٢] گریانـی داو خێـرا لەماڵـێ وەدەر کـەوت. ئەوەنـدەی هێزی هەبـوو بـۆ نێـو چۆڵایـی و چیـاکان ڕای کـرد، تـا سـەرەنجام لەبـەر ئەسرینەکانـی جگـە لـە لێڵایـی و تاریکـی چـی دیکـەی نەدەبینـی و سـەرپەلۆکی دەبـرد[٢٩٣]. هـەر هێنـدەی زانی خۆی بەنێو لێڕەوارەکەدا[٢٩٤] کێشا و کەوتە سەر زەوی.

وێنـەی جەسـتەیەکی بـێ گیـان لـەو چـۆڵ و چیایـەدا، بـەم ئێـوارە تاریکـە ڕاکشـابوو. نـەرم نـەرم لێڕەوارەکـەی بەئەسرینـی گـەرم ئـاو دەدا، تـاو نـا تاوێکیـش هۆنـراوەی دەگـوت:

بـێـرەوە ئـەی نـازەنـینی نـازک و نەرم و نـیان
بێرەوە ئەی جوانکیلەکەی پڕ لەعیشق و پڕ ژیان

وەرە ئەی بچکۆلانەکەی نێو بـەهەشتی دڵـداری
بـیـا بـا سـەر کـوڵمەکانت بـنـەخشێنم بـە زاری

---

٢٩١- بادی: جامی ئاو خواردنەوە.

٢٩٢- هارژن: هاوار.

٢٩٣- سەرپەلۆکی دەبرد: دەکەوت و هەڵدەستاوە.

٢٩٤- لێڕەوار: دارستان.

خۆشەویستیت واکە جەرگی هەڵدڕیم باوانەکــــــەم
دووریەکەت خستمیە گریان بێرەوە بـــا وانەکــــــەم

ئـای ئەحمـەد گیـان، چەنـدە دڵـم پێـت خۆشـبوو، لـەدوای سـەناریا تاکـە ئۆخژنـم بـووی، قوتابیـە نازدارەکـەم، چـۆن بەرگـەی نەمانـت بگـرم. ئـەوە چ زاڵمێکـە دەتکوژێـت و نایەڵـێ پـێ بگـەی، ئـەوە کێیـە بەخونچەیـی دەتقرتێنـێ. خەریـک بـوو قورئانەکـەت خەتـم دەکـرد باوانـم، خەریـک بـوو دەبوویـە هەوێنـی شـادیم. بۆچـی بەڕۆیشـتنت دڵـم لـەت لـەت دەکـەی کاکـە بـۆ؟ بـۆ وا بـێ بەزەییانـە دەڕۆی، لەکاتێکـدا مـن تـازە سـەناریام لەدەسـت داوە، تـۆش دەڕۆی؟ هـەر لێـت گەڕابـا برینـی ئـەو تـۆزێ کـۆن بـێ.

مەگـەر قـەرار نەبـوو لـەدوای خەتمیـش هـەر بمێنیـەوە و وانـە ئاینیـەکان بخوێنـی؟ مەگـەر نەتدەگـوت دەمهـەوێ ڕۆژێ وەکـو عەبدولباسـیت قورئـان بخوێنـم، ئـەی نەتدەگوت کاتـێ خەتمم کـرد منیـش دەبـم بەمامۆسـتا و قوتابیم دەبـن باوانەکـەم، وەرە و بـۆ سـاتێ مـن دەبـم بەقوتابیت. بـەم هەمـوو پاکیەتـەوە فێـرم بکـە، دەی دەی فێرمـان بکـە چـون گـەورەکان لەنێـو گوناهــ و تاوانـدا ڕۆچـوون. ئەمـا تـۆ گوڵێکـی سـپیت و یەشـتا تـۆزی گوناهــ پەڕەکانـی نەگرتـووی، یەشـتا ئاونگـی[٢٩٥] تـەڕت نەدیـوە. تخـوا تۆیەکـی پـاک و بێگـەرد ببـی بەمامۆسـتا چاتـرە یـان ئێمـەی ڕۆچـوو لەتـاوان.

ئـەو شـەوە تـا درەنـگ لەنێـو ئـەم چیـاو چۆڵیـەدا مایـەوە، شـەوێکی ئەمسـتەچاو[٢٩٦] کـە نەهیـچ چشـتێ دیاربـوو، نـە دەنگـێ وجـوودی هەبـوو جگـە لەدەنگـی بۆقـەکان.

درەنگانی شـەو هەڵسـاو وردە وردە بەچاوی تەژی لەئەسرینـەوە گەڕایەوە. دیاربوو خاتوو ڕەحمـە نەنوسـتبوو لەتاوانـی، کەچـاوی بەکوڕەکـەی کـەوت خێـرا بـەرەو ڕووی چـوو.

- سیڕاج گیان سەلامەتی کوڕم؟

+ سـەلامەتم دایـە گیـان، تەنـێ هەنـدێ ئـازارم چەشـت بـە لەدەسـتدانی قوتابیەکـی ئازیـزم، ئێسـتا توانـای قسـەم نەمـاوە، دەچـم دەخـەوم.

لەڕاستیدا نەخـەوت، ئاخـر چـۆن بخـەوێ، لەدەسـت دانی دوو ئازیـز لەماوەیەکـی کەمدا مـرۆ دێنێتـە ڕیـزی مـردوان، گـڕێ دەکاتـەوە کـە بەهەرچـی ئـاوی دەریایـە داناسـەکنێ.

---

٢٩٥- ئاونگ: شەونم.

٢٩٦- ئەمستەچاو: شەوی زۆر تاریک.

بەیانی هەرچەند هێزی دەدایە خۆی گوپچڕ[٢٩٧] بوو لای بچێ بۆ پرسەکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕۆژە لەبەر بێ تاقەتی نەچوویە قوتابخانە. سەرەنجام لەژووری هاتە دەرو ڕووەو مزگەوت ڕێی گرتە بەر. ڕوانی وا خەڵکێکی زۆر گرد بوونەتەوە و کەس و کاری ئەحمەد چاوانیان نوقمی گریانە. لەدوو سێ گەنجی بیست کەباسی ڕووداوەکەیان دەکرد، دیاربوو لەکاتی شەڕی باوکی و مامیدا، مامی گوللەیەکی کوێرانەی لەدەست دەرچووە و مێشکی ئەم بەستەزمانەی پژاندووە.

سیراج بە ژنەوتنی ڕووداوەکە خۆی نەگرت و دووبارە لەهارژنی گریانی دا، بەچەشنێ کەتەواوی سەرنجی خەڵکی بۆلای وی چوو.

لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو لەو ڕۆژەدا باوکی ئەحمەد گوتبوویە مەولەوی، باشە من ماڵ وێران و جەرگ سووتاو بووم، تۆ بۆچی وادەکەی؟

مەولەوی لەوەڵامدا گوتبووی: ئەوە پاژێ[٢٩٨] لەدڵ و هەناوی من بوو بەربوویەوە. پەڕە سپییەکەی من بوو کەبەدەستانی خۆم دەمنەخشاند و لێیان سووتاندم. ئەو نەمامە بوو خەریکی پێگەیاندنی بووم و ئاویان لێ بڕی، ئەی چی تۆ بوو پێم ناڵێی؟

دوای چەند مانگێ لەم ڕووداوە مەولەوی بڕیاریدا ئیدی ڕوو لەخودا بکاو ئازارەکانی لەیاد بەرێتەوە، چون دەیزانی جگە لەدەرگانەی ئەو ماوایەکی دیکە شک نابا، لەگەڵ ئەوەشدا تازە هەردوو ئازیزی لەدەست داو ئومێدێکی وای بەدونیا نەما.

تا موددێکی باش جگە لەڕێگای مزگەوت و قوتابخانە، پێیەکانی بۆ جێگایەکی دیکەی نەدەبرد. هەر لەم ماوەیەشدا چوویەوە لای مامۆستا عەبدولڕەحمان و وانەیەکی شەرعی لەخزمەتی دانا و ڕۆژانە لەگەڵ چوونی بۆ قوتابخانەدا سەردانی دەکرد.

هێور هێور ئارەزووی چوونەوە نێو خەڵکی بۆ دروست دەبوویەوە، وەلێ ئەمجارە وەکو کەسێکی دینداری پابەند نەک مەولەویەکەی پێشووتر.

ئەو دەمانەی دەگەیشت بەخەڵک باسی خوداو پەیامبەرو بیروباوەڕ و پابەند بوون بەنوێژەکان و بابەتە ئاینیەکانی بۆ دەکردن.

---

٢٩٧- گوپچڕ: دژوار.

٢٩٨- پاژ: بەش ، جوزئێک.

وەلێ ئەمجارەیان بەئاشکرا هەستی دەکرد کە خەڵکی لێی دوور دەکەونەوە و هاوڕێکانی بەرەو نەمان دەچن.

لەڕاستیدا گەنجەکان حەزیان لەدینداری نەبوو، ئەوان گەرەکیان بوو ڕابوێرن و گاڵتە و گەپ بکەن و بەیاری و کۆمەڵێ بابەتی دیکەی پووچ مژووڵ ببن.

بۆیە نەئەوان لەگەڵ مەولەوی دەیان کرا، نەمەولەوی لەگەڵ کۆڕو مەجلیسی وان دەیکرا.

لەنێو تەنیاییدا خەریک بوو خۆی دەخواردەوە، ڕۆژانە لەگەڵ دارو بەردو چیاوچۆڵەکان دەدوا، چون مرۆیەکی شک نەدەبرد. نەکۆڕی دیندارەکان هێوڵەیان[٢٩٩] دەکردەوە، نە مەجلیسی تازە لاو و کەم دینەکان.

هەرچی دیندارەکان بوون لەگەڵ عیشقدا تەبا نەبوون و لەحاڵی مەولەوی تێ نەدەگەشتن. هەرچی تازە لاوەکانیش بوون گاڵتەو گەپەکانیان لەگەڵ پابەندیەکەی مەولەویدا نەدەکولا و ئامۆژگاریەکانی مەولەوی دەیخستنە بێزاریەوە.

بۆیە لەم نێوانەدا وەکو کەسێکی حەیران و سەرگەردان بەتەنهایی دەیچەرخاند.

ئەو دەمەی لەکەسانی نێو مزگەوتی دەروانی هیچ عیشقێکی تێیاندا بەدی نەدەکرد، هەستی دەکرد کەئەم پەرستشانە ڕۆژانە وەکو نەریت دووبارە دەکرێنەوە، نابێ پەرستش ئاوەها بێ و دەبێ چشتێکی دیکە هەبێ کەمن نایزانم.

لەو دەمەش کە لەخەڵکی دەرەوەی دەڕوانی کەچۆن خەریکی دونیان و هەموو دەمێکیان بەیاری و گوتەی بێ بەهاوە بەڕێ دەکەن و لەبیری پەسڵاندا نیین، نازانن خۆیان بەعیلم و ماریفەتێ مژووڵ بکەن و کتێبێ بخوێننەوە. ئازار بەدڵ و دەروونی دەگەیشت و بێ تاقەت دەبوو بۆیان.

لەهەردوو مەجلیسەکە هەڵهات، وەلێ هەرچەندی دەکرد ئەو کەسەی ئەو دەیهەویست نەیدەدۆزیەوە.

ئەو ساڵە لەپۆلی شەشی ئامادەیی نەیتوانی نمرەیەکی بەرز وەدەست خا، چون نمرەی بەرز تێکۆشانی گەرەکە و ئەویش توانای ئەو هەوڵدانەی نەمابوو.

---

٢٩٩- هێوڵە: هێوربوونەوە.



هەرچۆنێ بێ بەچورتمی[٣٠٠] ئەم قۆناغەش کۆتایی هات و ناوی لەکۆلێژی ئاداب، بەشی عەرەبی گەڕایەوە، کەئەمەش لەگەڵ کەسایەتی ئەودا نارێک نەبوو.

لەکۆتایی هاویندا خۆی کۆکردەوە بۆ چوونە شار. (ئەختەر) شارێکی گەورە بوو، جگە لەیەک دوو جار کەلەگەڵ باوکی چوو بوو بۆ کڕینی هەندێ پێویستی شارەزاییەکی ئەوتۆی لەژینی شار نەبوو، وەلێ ناچار بوو بۆ خوێندنی کۆلێژ ڕوو لەوێ بکا.

ئەمەش لەیاد نەکەین کە خاتوو ڕەحمە لەکۆتاییدا هاوسەرێکی باشی بۆ سەلمانی کوڕی دۆزیەوە و بەر لەوەی مەولەوی بڕوا زەماوەندێکی خنجیلانەیان بۆ سەلمان چاکرد[٣٠١].

مەولەوی بەچاوی تەژی لەئەسرینەوە ماڵئاوایی لەماڵەوەو مامۆستا عەبدولڕەحمان و تەواوی ئازیزان کردو مام تاهیر کەتازە شڕە پیکابێکی کڕی بوو، بۆ بازرگانی دەچوویە شار، ئەو بەیانیە مەولەوی لەگەڵ خۆیدا گەیاند.

لەهەر کەندو لەندو تاسەیەکی دەدا پیکاب وەها دەلەریەوە ڕۆحی مرۆی دەردێنا. سیڕاج دەم نا دەمێ ئایەتی کورسی دەخوێندەوە و مام تاهیریش چون لەڕێگاکە ڕاهاتبوو لەدارو بەردی نەدەگێڕاوە.

هەرچۆنێ بوو گەیشتە ئەختەرو ئەو بەشە ناوخۆیەی دۆزیەوە کەقوتابیان تێیدا دەمانەوە.

دوای خودا حافیزی لەمام تاهیر، ئەو دەمەی ویستی بچێتە ژووری یەکەم کەس چاوی کەوتە سەر گەنجێکی چاو سەوزی قژ خۆڵەمێشی، کە زناکێکی[٣٠٢] ڕەشی چووکی لە لاملی ڕاستەی هەبوو، لەوە دەچوو ئەویش قۆناغی یەکەمی بێ. مەولەوی بەترسێکەوە دەستی درێژ کردو تەوقەی لەگەڵی کرد.

+ سڵاو، من سیڕاجم، تازە هاتوومەتە شارو لە قۆناغی یەکەم.

گەنجەکە بەتۆزێ ساردیەوە گوتی: بەخێربێی، منیش ناوم (سەمیر)ە.

مەولەوی لەبەر خۆیەوە گوتی: ئای خودایە، وادیارە لەشاریش چاوسەوز هەن !.

---

٣٠٠- چورتم: دەردەسەری ، سەغڵەتی.

٣٠١- چاخکردن: سازکردنی شت.

٣٠٢- زناک: نیشانە.

بەشە ناوخۆییەکی تەواو شەپڕێو و شپرزە، کەلەبەر ناچاری نەبا مرۆڤ تێیدا ئیدارەی نەدەکرد. بینایەکی بچووکی پڕ لەقوتابی، ژوورەکانی هێندە شپرزە بوو بوون دەتگوت لەزیندانی. ئەمە جگە لەو هەموو شیعرو پەخشان و ساڵ و بەروارەی لەسەر دیوارەکانی نووسیبوویان.

مەولەوی لەوێدا لەگەڵ کۆمەڵێ کەسایەتی نوێ ئاشنابوو، وەلێ هێندە خۆی تێکەڵیان نەدەکرد. دەم نا دەمێکیش لەگەنجە چاو سەوزەکە ڕادەما کەلەدووری هەمووانەوە ڕوودەنیشت و وێنەی مەولەوی تێکەڵاوی ئەوانی دی نەدەبوو.

درەنگانی شەو هەموو دەکەوتنە خەوێکی قووڵەوە، لێ مەولەوی تا نوێژی بەیانی خەو نەدەچوویە چاوانی. ئاخر دوای لەدەست دانی دوو ئازیز دووری ماڵەوەشی هاتەسەر. شەوان هێندە هەستی بەتەنیایی دەکرد کەدەتگوت گۆشتی خۆی دەخواتەوە.



# ئەشکەوتەکەی شێخ موستەفا و ژیانی حوجرە

دوای مانگێ لەچوونە کۆلێژ شەوێکیان مەولەوی لەدوای چەندین ڕکات نوێژ دەستەکانی بەرەو قاپی خودا بەرز کردنەوەو گەلێ نزای کرد کەخودا لەم حاڵەتە ناهەموارە ڕزگاری بکاو تەناهی[303] پێ ببەخشێ.

ئەو شەوە هەمان مامە پیرەی پێشووتر دەفتەرەکەی پێ بەخشی بوو هاتە خەوی، بەجلێکی سەرتاپا سپی و لەزەویەکی سپی پاتدا وەستابوو. لەچوار دەوریدا کەسانێکی خاوەن سام و هەیبەت بەدی دەکران، کە دەتگوت تەواوی جەستەیان لەنوور خولقاوە.

تەواو لەسیراج نزیک بوویەوەو گوتی: ئەوە چیتە کوڕم؟ دەبینم تەواو بێزارو ناڕەحەتی، دەڵێی بیرت چووە کەهەموو کارەکان لەخودا وەن؟ ئێمە تۆمان لەیادە و پاماڵمان[304] نەکردووی. لەو ئەشکەوتەی تێیدا دەمامەوە چەند پەڕێکی نووسراوم تیا داناوە لەژێر بەردێک. بەزوویی بڕۆو دەستیان خە، دەبنە مایەی ئارام گرتنت.

---

٣٠٣- تەناهی: ئاسوودەیی.

٣٠٤- پاماڵ: پێشێل.

لـەم بەشـە ناوخۆییـەش خـۆت ڕزگارکـە و حوجرەیـەک لـەم نزیکانـە هەیـە بـڕۆ بـۆی و لـەوێ بخوێنـە و بمێنـەرەوە.

مەولـەوی لەخـەو ڕاپەڕی و گشـت گیانی ئارەقەی کردبوو. تاوێ لەسـەر جێگاکەی بیری کـردەوە، ئـەم ئەشـکەوتە دەڵێـن پڕیەتـی لەجنۆکـەو شـوێنێکی سـامناکە. تۆ بڵێـی بتوانم بچـم و ئـەم پەڕاوانـە لـەوێ دەست خـەم؟ ئاخـر بۆچی دەبـێ بـاوەڕ بەخەوێکـی هەڵیت و پەڵیتـی وابکـەم. ئەسـڵەن کـێ دەڵـێ شـەیتانێک نییە و دەیهـەوێ فێڵم لـێ بکات؟

خێـرا دڕدۆنگیەکـەی وەلانـا و هەڵسـا نوێـژی بەیانـی کـردو بڕیـاری چوونـەوە گونـدی داو خـۆی کۆکـردەوە. چـون ئـەو ڕۆژە هەینـی بـوو ماوەیەکـی باشـی لەبـەر دەسـت بـوو بـۆ چـوون و هاتنـەوە.

ئـەو ڕۆژە لەگـەڵ هاژۆرێکـدا[305] ڕێکـەوت و بـەو تـۆزە پـارەی لایبـوو توانـی خـۆی بگەیەنێتـەوە ماڵـێ.

دوای گەیشـتنەوەی بەدایـک و باوکـی و دەسـت لەملان و یـەک ماچکـردن و گێڕانەوەی سـەربوردەی کۆلێـژو بەشـە ناوخۆیـی، بـۆ ئێـوارە بڕیـاری چوونـە ئەشـکەوتەکەی دا. وەلـێ بەتەنیـا زاتـی نەدەکـرد بچـێ، چـون ئـەوێ شـوێنێکی تـەواو سـامناک بـوو. ناچار ڕۆیشـت و لـەدەرگای ماڵـی سـیروانی داو سـیروان هاتـە دەرێ و پێیـدا واق بـوو[306]!.

- ئـەی خوایـە، ئەمـە تـۆی کاکـە سـیڕاج! کـورە تـۆ لەشـار بـووی چـۆن هاتیتـەوە بـرا، بەخـوا ئـەو موددەیـە ئێـرە بـێ تۆیـی پێـوە دیاربـوو، حاڵـت چۆنـە؟

+ سوپاسـت دەکـەم بـرا گیـان، شـوکر بۆخـوا چاکـم، دەمـەوێ پێکـەوە بڕۆیـن بـۆ شـوێنێک، خـۆت کۆکـەرەوە گـەر دێـی.

- دەی وەڵا من ئامادەم، با بڕۆین برا، لەخزمەتی تۆم.

مەولـەوی و سـیروان وەڕێ کەوتـن، لەڕێـگادا باسـی ژینـی شـارو کۆلێـژی بـۆ سـیروان دەگێڕایـەوە. تـاو نـا تـاوێ سـیروان دەهاتـە گـۆ: ئـەرێ بـرا بـۆ کـوێ دەچیـن ئێمـە، وا زۆر لـە دێ دوور کەوتینـەوە؟ وەلـێ مەولـەوی تـا تـەواو نزیـک نەبوونـەوە نەهاتـە دەنـگ، چـون دەیزانـی سـیروان کەسـێکی ترسـنۆکە و گـەر بڵـێ بـۆ ئەشـکەوت دەچیـن هـەر زوو دەگەڕێتـەوە.

---

٣٠٥- هاژۆر: شۆفێر.

٣٠٦- واق بوون: سەرسام بوون.

ئـەو دەمـەی تـەواو نزیـک بوونـەوە مەولـەوی هەمـوو چشـتێکی دەربـارەی شـێخ موسـتەفا بـۆ سـیروان باسـکرد و تێـی گەیانـد کـە بـۆ کوێـی دەبـا.

- وەلـێ بـرا ئـەوێ زۆر ترسـناکە، تـۆ فێڵت لەمـن کـرد، بۆچـی لەسـەرەتا وات نەگـوت؟ ئـەی گـەر جنـەکان لێـمان دەرکەوتـن چـی؟

+ ئـەم چشـتانە درۆو دەلەسـەی خەڵکیـن، دەبینـی کەهیـچ چشـتێکی وای لـێ نییـە، تەنـێ وەگەڵـم کـەوە و تـەواو.

لـەو دەمەیـدا کـە (ئـارا)ی جوانکیلـە تـەواو کەوتبوویـە نێـو باسـەکە یاداشـتەکەی دەسـتی کۆتایـی هـات.

+ ئـەی خودایـە، خـۆ ئەمـە تـەواو بـوو ! وەلـێ بۆچـی لێـرە ! ئاخـر دەمـەوێ بزانـم دواتـر چـی ڕوویـدا، لەنێـو ئەشـکەوتەکە چیـان کـرد؟ چارەنووسـی سـیراج بەکـوێ گەیشـت؟ نـا نـا هەرگیـز نابـێ ئەوەنـدە بـێ، چـۆن باوکـم چشـتێکی وا نیوەچڵـم بـۆ جـێ دێڵـێ !

دەبـێ ئانـا نەهاتبێتـە ژوورەکـەم و هەنـدێ پـەڕی لـێ کردبنـەوە ئـەو دەمـەی چـووم نانـم خـوارد؟ ئاخـر ئانـا بـۆ کارێکـی وا دەکا! واچاکـە لەدایکـم بپرسـم، لەوەیـە دەفتەرێکـی دیکـە بوونـی هەبـێ. بەدەسـتەکانی ڕووپەڕەکانـی[٣٠٧] هەڵگێـڕو وەرگێـڕ دەکـرد و نـووسراوی دیکـەی نەدەبینـی.

ئـەو دەمـەی چـوار پێنـج پـەڕی سـپی هەڵدایـەوە لـە ڕووپـەڕی کۆتایـی چـاوی کەوتـە سـەر پەڕاوێزێکـی بچـووک کـە لێـی نووسرابـوو (ئۆخـژن بـە کـوڕم، ڕۆژێ دێ نیوەکـەی تریشـت بەدەسـت دەگا).

+ ئاخـر چـۆن بەدەسـتم دەگا باوکـە، خـۆ تـۆ لەژیـن نەمـاوی باوانەکـەم ! بۆچـی لـەو مەراقـەدا دەمهێڵیـەوە؟ ئـای خودایـە دەمـەوێ بزانـم دواتـر چـی ڕوویـدا.

+ دایکە.... دایکە...

- بەڵێ ئارا گیان، چی بووە، ئەوا هاتم.

+ دەفتەرەکەی باوکم کۆتایی هات، وەلێ بەنیوەچڵی، هیچی دیکەی بەتۆ نەداوە بۆم؟

- نا کوڕم، وادیارە هەر ئەوەندەی بۆت نووسیوە، چشتێکی دیکەی بەمن نەداوە.

+ ئـەی ئـەوەی تـر دەبـێ لای کێبـێ؟ ئاخـر چـۆن بەدەسـتم دەگا...؟ ڕەنـج... ڕەنـج، بەڵـێ ئـەو، وەلـێ چـۆن ئـەو کـوڕە بدۆزمـەوە؟.

---

٣٠٧- ڕووپەڕ: لاپەڕە.



## ـ پاژی دووەم ـ

# ٢٠١٥ی میلادی، گەڕەکی سوورتاو- ئەختەر- ڕەنج و دەفتەرەکەی

ئێستا ٢٠١٥ی میلادیە، ئێمە لە ئەختەرین، شارێکی مەزنی دڵڕفێن. لەیەکێ لەگەڕەکەکانی ئەم شارە بەناوی (سوورتاو) گەنجێک بوونی هەیە، نێوی (ڕەنج)ە. تازە لاوێکی چاوسەوزی قۆز، زیرەک و وشیار لەکارو بارەکانی، وەلێ تێکەڵ نەبوو لەگەڵ خەڵکی. ئەو حەبیبەی خۆشدەوێ، ئەمما عیشقێک دوور لەهەرچی خرت و خاڵ و لیتەیە. هێندە دیوانی نالی خوێندبوویەوە کەزۆربەی دێڕەکانی لەبەر بوون.

ڕەنج تەنێ دایکی هەبوو، چون باوکی هەر لەگەنجیدا بە شێرپەنجە کۆچی کردبوو، ئەو بەتەواوی وێنەی باوکی نایەتەوە خەیاڵی.

ڕۆژانە سەردانی مامۆستاکەی دەکرد بۆ خوێندنی وانە ئاینیەکان. ئەو مووددێ بوو تێکەڵی دین ببوو، یانی هەر لەو کاتەی مامۆستای ناسی بوو.

مامۆستاکەی ڕۆژێک بەر لەوەفاتی دەفتەرێکی بچووکی پێدا کەبیخوێنێتەوە، وەلێ دوای خوێندنەوەی پەڕێکی زانی کە ئەم دەفتەرە لەنێوەندی ڕا دەستی پێکراوە، کەئەمەش تەواو ڕەنجی سەراسیمە کرد.

چەند جارێ دەیهەویست بچێتەوە بۆ خوێندنەوەی، وەلێ هەر جارەو ڕێگریەکی دەهاتە پێش لە وانەکانی قوتابخانە و هاتنی ماڵە خاڵی و ئازار گەیشتن بەقاچی لەیاری تۆپی پێدا.

سەرەنجام ڕۆژێک دوای نان خواردن چوویە ژووری و دەفتەرەکەی لەژێر چارپاکەی[٣٠٨] دەرکردو دەستی بەخوێندنەوەی کرد:

لەکۆتاییدا مەولەوی و سیروان گەیشتنە پاڵدامێنی[٣٠٩] ئەو شاخەی ئەشکەوتەکەی لێیە.........[٣١٠]

مەولەوی دەستەکانی سیروانی توند گرتن و تا سەری سەرەوە لەگەڵ خۆیدا بردی. وەلێ بەر لەوەی بچنە ژووری لەسەر بەردێکی گەورە تۆزێ ڕوونیشتن چون لەڕادە بەدەر ماندوو ببوون.

دوای تۆزێ حەسانەوە مەولەوی هەڵساو ڕووی لەئەشکەوتەکە کرد، وەلێ سیروان لەجێگاکەی نەبزووت.

+ هەڵسە ئیدی تازە هەر هاتووین، لازم نییە هێندە بترسی.

- دەی تا ئێرەت لەگەڵ هاتم، وەلێ لەچوونە ژوورەوەدا بەتەنیا بڕۆ. ڕاستیەکەت دەوێ برا زۆر دەترسم، ئەوەش پێم وانییە نەنگی تیابێ.

مەولەوی ئەم جارەشیان ڕووی تێکردو دەستەکانی گرت و بەزۆر هەڵی ساندو هەنگاوی پێ هەڵگرت بۆ ژووری. لەبەردەمی دەرگاکەدا دوو کۆتری سپی لانەیان خۆش کردبوو، کەچاویان بەوان کەوت هەڵفڕین، چەند تەونێکی جاڵجاڵۆکەش بەدی دەکرا کەنیشانەی ئەوە بوو موددێکی زۆرە کەس نەهاتووە بۆ ئێرە.

مەولەوی کەتۆزێ ترسی لەدڵ بوو هێزی دایە بەر خۆی و پێی خستە ژووری. وەلێ هێندە تاریک بوو کە چشتێکی وای نەدەبینی، ئەمەش ترسەکەیانی پتر دەکرد.

لەپڕێکدا دەنگی سیروان بەرزبوویەوە، ئەی هاوار بگەن بەفریام، خواردمی..... خواردمی....

---

٣٠٨- چارپا: قەرەوێڵە.

٣٠٩- پاڵدامێن: داوێنی شاخ و گرد.

٣١٠- بگەڕێوە سەرەتای کتێبەکە.

لەگـەڵ هارژنەکەیـدا[311] هـەردوو زیڕەیـان کـردو هەڵهاتنـە دەرێ. وەلـێ کەمەولـەوی سەیری کرد جگە لەچەند شەمشەمە کوێرەیەک چی دیکە نەبوو.

.+ ئـەی دارڕزێـی باشـە، وەڵا زەندەقـی منـت بـرد، ئەمانـە خۆیـان کوێـرن لەکـوێ دەتبینـن تـا بتخـۆن، هەمـووی ئەشـکەوتەکە چـوار مەتـر درێـژە، خـۆ نەهاتوویتـە ئەشـکەوتی ئەسـحابی کەهـف، ئـاوا زراوت ڕژاوە.

- کـورە وەڵا دەتگـوت دەعبا بـوون خۆیـان تیـژ کـردەوە بـۆم، دەی بـا ئـاوا بۆتۆ هێرشـیان هێنابـا ئینجـا دەتزانی.

+ واز لــەوە بێنــە، ئێــرە زۆر تاریکــەو هیــچ ڕووناکیەکــمان پــێ نییــە، نازانــم ئــەو پەڕاوانـە چـۆن بدۆزمـەوە؟ دەی خـۆ هێنـدە گـەورە نییـە، دەسـت بەزەویەکـەدا دێنـم تـا بـەر دەسـتم دەکـەون.

- ئاگاداربـە کاکـە، جنۆکەیـێ بـەر دەسـتت نەکـەوێ، لێـمان پەیدابـێ، بەخـوا زۆر چشـت مـاوە بیـان کەم.

مەولـەوی ئەمجارەیـان بەتەنیـا چوویـەوە ژووریَ و ترسـەکەی کەمتربـوو لەجـاران. لەسـەر چـۆک ڕوونیشـت و دەسـتی بەزەویەکـەدا دێنـا، تـا لەیەکـێ لەزاویەکانـدا بەردێکـی کەوتـە بـەر چنـگ، کەلایـدا هەسـتی کـرد سـێ پـەڕی لەژێردایـە، بۆیـە خێـرا پەڕەکانـی هەڵگـرت و هاتـە دەرێ و ئامـاژەی بەسـیروان دا کـە بگەڕێینـەوە.

ئـەو دەمـەی ئـەو دوو لاوە گەڕانـەوە کاتـی نوێـژی عیشـا بـوو، مەولـەوی هێنـدە مانـدوو بـوو کەچەنـد دەقیقەیەکـی نەبـرد خـەو بردیـەوە.

بەیانـی زوو هەڵسـاو دەسـتی بەخوێندنـەوەی پـەڕاوەکان کـرد. لەچۆنیەتـی و ئادابەکانی زیکـرو یـادی خـودا دەدوا، لەگـەڵ نووسـینی هەنـدێ زیکـری تایبەتیـدا بـۆ کەسـێک کەتـازە پێـی لەدونیـای تەسـەوف و عیرفـان نابـێ.

لەکۆتاییەکەیـدا ئامـاژە بەشـێخێک کرابـوو بـە نێـوی (جەلالەدیـن)، کەدەبوایـە مەولـەوی خـۆی بەخزمەتـی بگەیەنـێ.

دوای گەڕانـەوەی مەولـەوی بـۆ شـار، یەکـەم کاری دۆزینـەوەی حوجرەکـە بـوو، کەهـەر کیلۆمەتـرێ دوور دەبـوو لـە بەشـە ناوخۆییەکـە. مزگەوتێکـی چـووک بـوو کـە

---

٣١١- هارژن: هاوار.

لەئاتەکیدا[312] ژوورێک بۆ فەقێکان چاخکرابوو[313]. بەئەسپایی لەژووری فەقێکان نزیک بوویەوە و لەدەرگای دا و یەکێ لەوان دەرگای واڵا کرد.

دوای سڵاو و چاک و چۆنی مەولەوی ئاماژەی بەوە کرد کە دەیەوێ لێرە بخوێنێ، وەلێ هەستی کرد کە فەقێکان پێیان خۆش نییە، چون جێگاکەیان تۆزێ تەنگ و ناخۆش بوو ، وازیان لێ نەبوو کەسی دیکە بێتە نێویان.

تەواو مەولەویان بێ ئومێد کرد لەوەی کە مامۆستا (عومەر) وەری بگرێ، بۆیە بەناچاری گەڕایەوە، لێ لەپڕێکدا هەستی بەدەستێک کرد لەسەر شانی دانرا، کە لای کردەوە ڕوانی مامۆستایەکی ئاینیە.

- سەلام و عەلەیکوم کوڕم، دیارە میوانی فەقێکان بوویت، بینیم لەوێ هاتیە دەرێ.

+ عەلەیکە سەلام قوربان، ئەوەی ڕاستی بێ بۆ خزمەت جەنابتان هاتبووم.

- دەی بۆ نەهاتیە ماڵێ لای خۆم لەخزمەتت دا بم؟ بفەرموو.

+ ڕاستیەکەی دەمەوێ لای جەناباتن بخوێنم، وەلێ فەقێکان تەواو بێ هیوایان کردم، هەر بۆیە دەمهەویست بگەڕێمەوە.

- باشە بابچین ڕووبنیشین چاییەک بخۆین، ئەودەم لەو باسە دەدوێین، ئاوا بەسەر پاوە نابێ.

مەولەوی لەگەڵ مامۆستادا چوویە ژوورێ و لەبەر بێڵایی[314] مزگەوتەکەدا ڕوونیشتن. لەوێدا خەوەکەی شێخ موستەفای گێڕایەوەو باسی مامۆستا عەبدولڕەحمانیشی کرد کە وانەی بیروباوەڕ و شەریعەتی لەلا خوێندبوو.

مامۆستا عومەر گەلێ کەیف خۆشبوو بەبینینی مەولەوی، چون ئەو ناو و دەنگی شێخ موستەفای ژنەوتبوو، دەیزانی کەسێکی مەزنە، بۆیە هەر زوو جێگای بۆ کردەوە لەنێو فەقێکاندا.

ئەو ڕۆژە کەلوپەلەکانی خۆی لەبەشە ناوخۆییەکە گواستنەوە بۆ حوجرە و ماڵئاوایی لەهاوڕێیانی ئەوێ کرد.

---

٣١٢- ئاتەک: تەنیشت.

٣١٣- چاخکردن: سازکردنی شت.

٣١٤- بەر بێڵایی: بەر هەیوان.

حوجرەیەکـی شـەق و شـڕی کـۆن و بائەنگێو،[315] کـە لەبەشـە ناوخۆیەکـە چێـتر نەبـوو، تـەواوی ئەجـزای شـەق شـەق ببـوو، هەروەکـو نالـی فەرموویەتـی:

دوودی سەر میچی گوڵەنگی لەت لەتی دەسرازە کـــــۆن
بـــان و دیـــواری بـــەمیسلی لانکـــەی ئـــەجزا شکـاو

فـــەسڵی هاوینی جەهەننەم، فـــەسڵی ئێستای زەمهەریـــر
زەمهەریر کـــەی وا بـــەتەئسیرە و جەهەننەم وا بـــەتـــاو

لەهاوینانـدا دەتگـوت نیشـتەجێی ئاگـری، چـون ڕۆژ لەهەمـوو کـون و کەلەبەرەکانـی دەهاتـە ژووریێ، لـەوەرزی زسـتانیش فەقێـکان خەمبـاری ئـەوە دەبـوون کـە بـاران هەڵـی کردبـا.

ئەمـا ئـەویێ جێگایەکـی ئـارام بـوو بـۆ مەولـەوی، چـون لەبەشـە ناوخۆیەکـەدا تـەواو ناڕەحـەت دەبـوو لەبـەر ژاوە ژاوی دەوروبـەری، سـەرەڕای ئـەوەش لێـرە دەتوانـێ وانـە ئاینیـەکان بخوێنـێ.

مەولـەوی ڕۆژانـە بەباشـی وانەکانـی حوجـرەو کۆلێـژی دەور دەکردنـەوە، کەئەمـەش تـەواو خۆشەویسـتی کردبـوو لـەلای مامۆسـتا عومـەر و مامۆسـتایانی کۆلێـژ، سـەرەڕای ئـەوەش هەمـوو ڕۆژێ ئـەو ویردانـەی دەخوێنـد کەشـێخ ئامـاژەی پێدابـوون.

مامۆسـتا یەحیـا موسـتەعیدی[316] حوجـرە بـوو، زۆرێـک لەفەقێـکان لای ئەویـان دەخوێنـا، وەلـێ لەهەموویـان پـتر گرنگـی بەمەولـەوی دەدا، چـون دەیبینـی کەچەنـدە مانـدووە بەوانەکانـی.

هێنـدە لەگەڵـی ئاوێتـە ببـوو کەشـەوانە تـا درەنـگ لەبـەر بێڵایـی مزگـەوت ڕوودەنیشـتن و باسـی ناڕەحەتیەکانـی ژیانیـان دەکـرد.

مامۆسـتا یەحیـا ڕووپـەڕی مەینەتیەکانـی خـۆی بـۆ مەولـەوی هەڵدەدایـەوە، وەلـێ مەولـەوی شـەرمی دەکـرد باسـی سـەناریای بـۆ بـکا، ئەمـا ئەوەنـدەی دەیتوانـی هۆنـراوەی ڕازاوەی بـۆ دەخوێنـدەوە.

٣١٥- بائەنگێو: کونێکە بای لێ بێتە دەر.

٣١٦-موستەعید: ئەو فەقێیەی لەوانەکانی سەرەوەیە و ئامادەیە بۆ وانە وتنەوە بەفەقێکانی دی.



# چاو سەوزێکی دیکە

سیڕاجی مەولەوی لەکۆلێژدا خۆی تێکەڵی قوتابیان نەدەکرد، لەڕاستیدا نەیدەویست کەس بناسێ و هێزی ئەوەی نەمابوو بەرگەی دابڕانی هیچ مەخلووقێ بگرێ.

ئەو ڕۆژەی وانەیەکی بەتاڵیان هەبوایە دەچوویە نێو باخەکەی کۆلێژ ڕوودەنیشت و ویردەکانی دەخوێنا.

ڕۆژێ لەنێو باخەکەدا هەستی کرد کەسێ لەئاتەکی ڕوونیشت، ئەو دەمەی چاوانی کردەوە ڕوانی سەمیرە.

- زۆرت بەتەنیا دەبینم وێنەی خۆم، مرۆڤی وام خۆشدەوێ، کێشەیەکت هەیە؟ ئەوە چیت دەخوێند لەبەر خۆتەوە؟

+ نا سەمیر گیان، کێشەیەکی ئەوتۆم نییە، خەریکی هەندێ ویردی ڕۆژانە بووم.

- بەڕاست، تۆ ویردیش دەخوێنی ! من هەر نوێژیش ناکەم.

+ بۆچی؟ خۆ ئەوە ڕوکنێکی دینە !

- چووزانم سیڕاج، واز لەو چشتانە بێنە، مەلاکان دینەکەیان زۆر لەسەر توند کردووین.

+ کوڕی باش، ئەمە کاری بەمەلادا نییە، چشتێکە خودا واجبی کردووە، بۆچی دەیبەیتە سەر لایەکی دیکە.

- باشە سیڕاج، دەڵێن تۆ هۆنراوە نووسی، دەتوانی چشتێکم بۆ بنووسی لەسەر خۆشەویستەکەم؟.

+ ئەو خۆشەویستە کێیە؟

- مەگەر دەبێ کێ بێ !

+ چووزانم، هەزار جۆر خۆشەویستی بوونی هەیە.

- کچێکی خەرامانە[٣١٧] سیڕاج، زۆرم خۆشدەوێ، وەلێ یەشتا ئاگادارم نەکردۆتەوە، دەتوانی یارمەتیم دەی لەم بابەتە؟

+ باشە وەلێ سەرەتا لازمە تۆزێ گوێم بۆ بگری.

مەولەوی ئەمەی بەدەرفەت زانی تاکو هێندێ ئامۆژگاری ئەو لاوە بکا و دووری خاتەوە لەڕێچکەی لارو لەوێر، بۆیە دەستی بەقسەکرد دەربارەی خوداو پەرستشەکان، بەتایبەتی باسی نوێژی کرد کە ڕوکنێکی هێندە گەورەی دینە و مرۆڤ بە وازهێنان لێی هیچ پەیوەندیەکی نامێنێ بە خودای تاقانەوە.

ئینجا گوتی: گەر بەڵێنم پێ دەدەی بە نوێژکردن ئەوکات دەتوانم یارمەتیت بدەم.

- بەڵێن بێ کەچوومەوە خۆم دەشۆرم و دەست پێ دەکەمەوە، وەلێ تۆ هۆنراوەکەم بۆ دەنووسی؟

+ تەواو دەینووسم، ئەمما ئەو هۆنراوەیە تەنێ لای خۆت دەبێ، وە پێویستە ئۆخژنت هەبێ لەم بابەتانە، نابێ خۆشەویستی تێکەڵی گوناهـ بکرێ.

ئیدی سەمیر هەموو ڕۆژێ دەهاتە لای مەولەوی و دەردە دڵی بۆ دەکرد، ئەویش تا دەیتوانی هەڵگری خەمەکانی دەبوو، وە ئاڕاستەی دەکرد بۆ ڕێی دروست. زۆرکات باسی ئاینی و هەندێ دەمیش باسی عیشق و ئەدەبیاتی لەگەڵیدا دەوروژاند. هۆنراوەی بۆ دەخوێندەوەو ناوەش کتێبێکی چووکی بەدیاری بۆ دێنا و لەگەڵ کتێب و پەڕاوەکان ئاشنای دەکرد.

---

٣١٧- خەرامان: ئافرەتی شۆخ و شەنگ.

وەلێ هەمیشە خۆی لەچاوانی دەپاراست، چون ئەو چاوانە دوو کەسی ئازیزی دەخستنەوە یاد.

سەمیر تەواو عاشقی ئەدەبیات و شیعر ببوو، سەراسیمە دەبوو کەچۆن مەولەوی هێندە جوان ئەم هۆنراوانەی نالی و مەحوی شیدەکاتەوە. چۆن تا ئێستا نەیتوانیوە ئەم ئەدیبە بەرزانە بناسێ و لەهۆنراوەکانیان بگا!.

وورده ورده ئەو کوڕە لای مەولەوی مەحبوب دەبوو، کە ئەمەش جێگای ترس بوو بۆی، چون پێشتر هێندە ئازار درابوو نەیدەویست کەسی تر دەرگای دڵی بگرێ.

ئەو تەنێ دەیهەویست لەڕێی ئەو عیشقەوە سەمیر بۆ بابەتە ئاینیەکان کێش بکا.

ئیدی وای لێهات ئەو دەمانەی سەمیر دیار نەدەما مەولەوی بەبێ ویستی خۆی دیەی بۆ دەگێڕاو بێ قەرار دەبوو بۆی، بەتایبەت کە هەستی دەکرد سەمیر گەنجێکی باوەڕ کزەو لەوەیە بەبایێ هەڵفڕێ.

سیڕاج هەمیشە لەسەر هەندێ کاری هەرزەکارانە لۆمەی سەمیری دەکرد. وەلێ ئەو هەندێ جار بە ئامۆژگاریەکانی وەڕەز دەبوو، چون نەیدەویست ئارەزووەکانی خۆی تێک بدا.

کێشەی سیڕاج لەوەدابوو دەیهەویست سەمیر بەمووددێکی کەم وەکو خۆی لێبێ، وەلێ ئەوە زۆر گوپچڕە.

ڕۆژێ لەنێو نادیەکە ڕوانی وا سەمیر لەگەڵ گەنجێ وەستاوە و قسەو باسیانە، مەولەویش زۆر جار لەدواوە بۆی دەچوو تا بەبەری دەستی چاوەکانی دەگرت، لێ هەمیشە سەمیر دەیزانی کە مەولەویە، چون کەسێکی دی ئەو کارەی لەگەڵدا نەدەکرد.

وەکو جاران لەدواوە بۆی چوو، ئەمما کە ژنەوتی دەربارەی ئەو دەدوێن لەشوێنی خۆیدا چەقی. دیاربوو گەنجەکە دەیگوت ئەو کوڕە کێیە وا ڕەگەڵی کەوتووی؟

- نێوی سیڕاجە، کوڕێکی باشە، لێ ئەوەندە هەیە هەندێ جار بێزارم دەکا بەلۆمەکانی، دەیهەوێ وەکو وی دیندار بم. وەلێ من ناکرێ دەست لەهەندێ چێژی نەفسی هەڵگرم.

+ ئاگات لێبێ بابە، ئەو دیندارانە زۆر دواکەوتوو وخەتەرن.

- هاهاها، کورە وەڵا من هەر نوێژیش ناکەم، تەنێ لەبەر دڵی ئەو هێندێ شت دەڵێم.

مەولـەوی کەئەمـەی ژنـەوت خەریـک بـوو هۆشـی نەمێنـێ، لەتوورەییـدا لێوەکانـی خـۆی دەکرۆشـت، خێـرا لەشـوێنی خـۆی کشـایەوە دواوە و بڕیـاری دا ئیـدی لەسـەمیر دوور کەوێتـەوە، هەرچەنـدە زۆریشـی خۆشدەویسـت.

بـۆ مـاوەی هەفتەیـەک بەهەمـوو شـێوازێک خـۆی لەسـەمیر دەشـاردەوە و نزیکـی نەدەبـۆوە. هەرچەنـد لەناخـەوە دڵـی شـەقار شـەقار دەبـوو بـەم کارە، چـون ئـەو تاکـە کـەس بـوو کەلـەدوای ئـەو هەمـوو بێدەنگیـە مەولـەوی بەگـۆ خسـتبوو، لەتەنیایـی هێنابوویـە دەرێ، وەلـێ چارەیەکـی دیکـەی نەبـوو.

سـەرەڕای ئـەوەش کەسـەمیری لەگـەڵ هەنـدێ هاوڕێـی تـازەدا دەبینـی و دەیزانـی کەسـانێکی بـاش نییـن و سـەر بـە ئـاژاوەن پـتر دەرگیـری[318] خـەم دەبـوو.

ئـەم کارەی هێنـدە لەسـەر دڵ گـران بـوو کـە پـتر لەهەفتەیـەک خـۆی بـۆ نەگیـراو چوویـەوە لای.

ئاخـر دوورکەوتنـی مەولـەوی دەبوویـە هـۆی نزیـک بوونـەوەی کەسـانێکی چوختـی[319] لەسەمیر.

ئەو ڕۆژە لەنێو باخەکە سەمیری لەگەڵ دوو سێ گەنجدا بینی و بانگی کرد.

دوای هەواڵ پرسین بەیەکەوە لە سووچێک ڕوونیشتن و کەوتنە گفتوگۆ:

- دەبینم ئەم ماوەیە منت لەیاد نەماوە سیڕاج، هەست ناکەی بێ وەفای؟

+ سـەمیر مـن چەنـد جـارم پێـت گـوت کـە نامـەوێ لەگـەڵ کەسـێکی نوێژنەکـەر هاوڕێیەتـی بکـەم، تـۆ پەیوەندیـت لەگـەڵ خـودا پچڕانـدووە بـرا.

- دەی مەگەر من نوێژ ناکەم؟

+ نەخێـر نایکـەی، بێگومـان دەیزانـم نایکـەی، وا هەسـت نەکـەی دەتوانـی ئەمـە لەمـن بشـاریتەوە، وایـە یـان نـا؟

- وایـە سـیڕاج، لەڕاسـتیدا مـن نایکـەم، تەنـێ لەبـەر دڵـی تـۆ وام گـوت، نەمدەویسـت لەدەسـتت بـدەم، بمبـوورە.

---

٣١٨- دەرگیر: تێوەگلان ، تووش بوون.

٣١٩- چوختی: چەقاوەسوو.

+ کاشکی لەسەرەتادا ڕاستیەکانت دەگوت، ڕاستی گەر تاڵیش بێ گەلێ چاترە لەدرۆیەکی شیرین، چون درۆ ڕۆژێ دێ پەردەی لەسەر لادەدرێ و مرۆڤ شەرمەزار دەکا.

سەمیر گیان، من گەر هەڵە لەخەڵکی دیکە ببینم لەوەیە هێندە خەمبارم نەکا، وەلێ تۆیەک کەهێندە خۆشم دەوێی، چکۆلەترین هەڵەت دەمهێنێتە ئێش، تێبگە لێم کاکە.

قسە گوتنی خەڵکی بەمن ئازاردەر نییە، لێ تۆ کە خۆشەویستی چکۆلەترین گوتەت بەرامبەرم دەممرێنێ.

- شەرمەزاری تۆم سیڕاج گیان، بەڵێنت پێ دەدەم تەواو خۆم بگۆڕم، تەنێ ئۆخژنم لێ بگرە برا، دەزانم خەمباری منی، هەڵە لەمنەوەیە، وەلێ یەک داوام لێت هەیە، ئەوە موددێکی زۆرە بەیەکەوەین و من زۆر چشتم دەربارەی خۆم پێ گوتووی، ئەمما تۆ هەر ئەوەندەت گوت کە کەسێک لەژیانی منیش هەبوو، ئێستا دەمهەوێ باسی ئەو کەسەم بۆ بکەی.

مەولەوی بەنەرمی لەمەڕ سەناریاوە دوا بۆی، هەر لەباسی مناڵیەوە تا ئەو دەمەی وەڵامە دڵڕەقانەکەی ژنەوت و بوو بەئێشێکی گەورە لەسەر دڵی. ئەو سەناریای بەدڵ بەردو شوێنکەوتەی ماددە وەسف کرد. مەبەستی لەم باسکردنە تەنێ گەیاندنی عیشقێکی پاک بوو بۆ دڵی سەمیر، ئەمما کە ڕوانی ئەو کوڕە وردە وردە لەگەڵ باسەکەدا ڕەنگی دەپەڕی و تێک دەچوو.

+ خێرە سەمیر، خۆ چشتێ ڕووی نەداوە، بۆ ئاوا ڕەنگت گۆڕا؟

- سەمیر بە پەشۆکاویەوە: هیچ چشتێ نییە، وەلێ دەبێ من بڕۆم، هەندێ کارم هەیە.

مەولەوی هەرچەند لەدواوە بانگی کرد، وەلێ ئەو کوڕە دەنگێکی نەماو ڕۆشت. لەدڵی خۆیەوە گوتی لەوەیە باسەکە کاریگەری لەسەری هەبووبێ، واچاکە وازی لێ بێنم.

ئەو ماوەیە هێندە لەخەمی سەمیردا بوو، هەستی دەکرد کاریگەری لەسەر وانەکان و ویردەکانیشی دادەنێ، لێ هێندەی خۆشدەویست کەنەیدەتوانی بیری لێ نەکاتەوە، وا دیاربوو کەتووشی نەخۆشی دەروونی بووە.

ڕۆژێ سەمیر داوای لێکرد کە لەگەڵیدا بێتەوە و بەماڵەوەی بناسێنێ. دەیگوت لەماڵەوە هێندە لێت دواوم لای هەموویان شیرین بوویت، دایکم گوتی هەرچۆنێ

بـێ ئەمـڕۆ دەبـێ ڕازی کـەی لەگەڵـت بێتــەوە.

+ وەلـێ سـەمیر گیـان ئێمـە ئیمـڕۆ کاژێـر دووی نیـوەڕۆ لەکۆلێـژ تـەواو دەبیـن، خـۆ ئەمـە کاتــی پشــووە و دەترسـم ماڵەوەتـان ناڕەحـەت بکـەم.

- گەر ئیمڕۆ نەیەی زۆر دڵگران دەبم لێت سیڕاج، ماڵی ئێمە هی تۆشە برا.

ئـەو ڕۆژە مەولـەوی ڕەگەڵـی کـەوت، وە زۆریـش کەیفـی سـازبوو کەئاشـنای دایـک و باوکـی سـەمیر دەبـێ، ئەمـا ڕێگاکـە زۆری خایانـدو هـەر نەدەگەیشـتن.

+ مەگـەر تـۆ نەتگـوت ماڵـی ئێمـە تەنـێ بیسـت دەقیقـە دوورە لەکۆلێـژ، دەی ئـەوە نیـو کاژێـرە ڕێ دەکەیـن بۆچـی ناگەین؟

- ئاخر ئەو دەمەی تەنیام خێراتر ڕێ دەکەم، دواتر تۆ پەلەت چییە، زۆرمان نەماوە.

تۆزێکی تر بەپێ ڕۆیشتن تا گەیشتنە سەر کەندێکی چۆڵ. لەوێدا مەولەوی ڕوانی وا چوار گەنج بەرەو ڕوویان دێن، دیاربوو ڕوخساری سەمیریش وردە وردە تێک دەچوو.

+ چی بووە سەمیر، ئەمانە کێن؟

- ئـەوەی ڕاسـتی بـێ سـیڕاج ئەمانـە بـۆ مـن هاتـوون، تـۆزێ کێشـەم لەگەڵیانـدا هەبوو، وابزانـم تـێ کەوتین.

سـەمیر گوتەکانـی تـەواو نەکـرد کـە یەکـێ لـەوان یەخـەی گـرت و بۆکزێکـی خێواندێ و دە خۆڵێـی وەردا.

مەولـەوی کەئەمـەی بینـی هۆشـی لەسـەردا نەمـا. خێـرا جانتاکـەی دەسـتی فـڕێ داو بەردێکـی لەسـەر خۆڵەکـە هەڵگـرت و وەشـاندیە بۆکـز وەشـێنەکەو خوێنـی لەسـەری جـاری کـرد. ئەمجـا ئـاوڕی لەئەوانـی دیکـە دایـەوە و بـەرەو ڕوویـان ڕۆشـت، لـێ ئـەوان سـێ مـرۆی زەبـەلاح و سـیڕاج بەتەنیـا. بـە هەرسـێکیان مەولەویـان تونـد گرت و یەکـێ لـەوان سـەری مەنهۆڵەکـەی[٣٢٠] هەڵدایـەوە و خسـتیانە نێـوی، دواتـر بەقوفڵێکـی گـەورە گاڵەیـان دا[٣٢١] لەسـەری.

مەولـەوی جگـە لەتاریکـی و جڵقاوەکـە[٣٢٢] کـە تاوەکـو ناوکـی هاتبوو چشـتێکی دیکەی

٣٢٠- مەنهۆڵ: مەزرا.

٣٢١- گاڵەدان: داخستنی دەرگا.

٣٢٢- جڵقاو: چڵکاو.

بەدی نەدەکرد. هەرچەندی هێزی دەخستە سەری مەنهۆڵەکە، وەلێ بێ سوود بوو.

ترس هەموو گیانی داپۆشیبوو، بەرەو هەرلایەک هەنگاوی دەنا هەستی دەکرد وردە وردە لەقووڵایی نزیک دەبێتەوە تاوەکو ئاوەکە دەگەیشتە بنە قاقای، بۆیە بەناچاری بەرەو جێگاکەی خۆی دەگەڕایەوە. هێندەی هاوار لەدەرەوە کردو بانگی سەمیری کرد کە هەستی دەکرد توانای گۆ کردنیشی نەماوەو هیچ کەسێ دەنگی ئەو ناژنەوێ، چون ئەوێ بەتەواوی چۆڵاییە.

ناچار بە دەستەپاچەیی چاوەنووڕی گەڕانەوەی سەمیر بوو، وەلێ تۆ بڵێی بگەڕێتەوە؟ تۆ بڵێی زانیبێتی من لەنێو مەنهۆڵەکەم؟ ئاخر چۆن نەیزانیوە، خۆ من لەبەر ئەو وام لێهات، ئەینا دوژمنایەتیم لەگەڵ چ کەس نەبوو.

چەند کاژێرێ تێپەڕی، وەلێ نە سەمیر دیاربوو نە دەنگی مرۆیەک دەهات. مەولەوی هەستی بەنزیک بوونەوەی مردن دەکرد کە مووددێ بوو لەیادی کردبوو. هەموو ساتەکانی منالی و سەناریاو ئەحمەد و سەمیر یەکە بە یەکە چەشنی فیلمێک دەهاتنە بەر چاوانی.

لەبەر خۆیەوە دەدوا: چییە سیڕاج لەمردن دەترسی؟ مەگەر تۆ نەبووی ئاواتت بەمەرگ دەخواست؟ ئەی ناتەوێ بەدیداری خودا بگەی؟ بۆچی دەتەوێ لەدوای لەدەست دانی ئازیزانت بژی؟ سەناریا جێی هێشتی، ئەحمەد جێی هێشتی، دەی چیت لەدونیا ماوە کاکە، با بمری، با بمری.

نا... نا.. زۆر چشت ماوە بیکەم، کەسانێ لەماڵەوە چاوەنووڕی منن، کەسانێ لەحوجرە چاوەنووڕی منن، خۆ دایک و باوکی سەمیریش چاوەنووڕم بوون. دڵنیام دەمدۆزنەوە، من بێ ئومێد نیم، بێ ئومێد نیم خودایە.

بەرە بەری ئێوارە بوو، هەستی دەکرد تووشی سەرسووڕان بووە، خۆ نیوەڕۆش نانی نەخواردبوو، گەر لەهۆش خۆی بچێ ئەوا بەبێ گومانی لەنێو ئەم جلْقاوەدا دەخنکێ.

بەرەو لای زاویەکە چوو، پشتی بەدیوارەکەدا، چون ئەو پشت ئێشەیە زۆری نارەحەت کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرسووڕانیشی هاتە سەر.

دەم نا دەمێ بۆ هێزدانەوە بەر خۆی دەیگوت ئێستا سەمیر دەگا، بەڵێ ئێستا دەگا.

ئـای خوایـە، خـۆ مـن نوێـژی عـەسرم نەکـرد، وا ئێـوارەش بانگـی داوە، چـی بکـەم؟ مامۆسـتا عەبدولڕەحـمان دەیگـوت گـەر لەشـوێنێکی پیـس بوویـت و هیچـت دەسـت نەکـەوت هـەر واجبـە نوێژەکـەت بکـەی و نابـێ لێـی غافـڵ بـی.

سیڕاجی مەولـەوی لەنێـو مەنهۆڵەکـەدا بـەو نارەحەتیـەوە نوێژەکانـی ئەنجام دا، وەلـێ بـۆ سـوژدە و ڕکـوع تەنـێ تـۆزێ خـۆی لار دەکـردەوە چـون نەدەکـرا سـەری بخاتـە نێـو جڵقاوەکەوە.

تاریکـی شـەو و تاریکـی مەنهۆڵەکـە ئاوێتـەی یەکـدی بـوو بـوون. تەنانـەت مەولـەوی نەیدەتوانـی جەسـتەی خۆشـی ببینـێ. وورده ورده بـێ هیـوا دەبـوو، هـەر نزایـەک دەهاتە سـەر لێوانـی دەیخوێنـد بـۆ ڕزگار بوونـی.

هەسـتی دەکـرد سەرسـووڕەکەی لـە زێدەیـی دایـە، خـۆ هیچیشـی لێنەبـوو بیخـواو تـۆزێ هێـزی بێتـەوە بـەر، ناچـار دەسـتی لەنێـو جڵقاوەکـە نـاو تۆزێکـی فڕکـرد، سـا بەڵکـو لێوانـی هەنـدێ تـەڕ ببنـەوە و گێـژ بوونەکـەی کـەم بێتـەوە.

درەنگانـی شـەو بـوو، دەسـتی لەدیـواری مەنهۆڵەکـە دەدا تـا هەسـت بەزینـدوو بوونـی خـۆی بـکا. لەپـڕ دەسـتی کەوتـە بـەر شیشـەیەکی درێـژو خستیە ژێـر باڵـی و تـۆزێ سـەری خـۆی لەسـەر دانـا و پشـتی لەگـەڵ دیوارەکـە قایم کـرد، بەڵکـو گەر لەهۆشـیش بچـێ بەهێـزی شیشـەکە ڕابوەسـتێ و نەکەوێتـە نێـو ئاوەکـە.

خەیاڵـی دەکـرد کـە دەمـرێ بەبـێ ئـەوەی کەسـی لەلابـێ، بـێ ئـەوەی بتوانـێ وەسـیەتێ بـکا، بـێ ئـەوەی کـەس ئـاگاداری تەرمەکـەی بـێ و لەشـوێنێ بینێـژن. دەمـرێ بەبـێ ئـەوەی بەئازیزێکـی شـادبێ، ئاخـر گـەر لەنێـو ئازیزانـم بـام سـەد جـار هاتبـای مـردن، وەلـێ لێـرە تەنیـا و بـێ کەسـم. لەپڕێکـدا بیرێکـی بـۆ هـات، دەسـتی خسـتە گیرفانـی، قەڵـەم و چەنـد کاغەزێکـی تیابـوو، وەلـێ کاغـەزەکان لەبـەر تـەڕی تورابوونـەوە.

هێنانیـە دەرێ و بەفـووی دەمـی هەوڵـی وشـک کردنـەوەی دانەیەکیانـی دەدا، هەرچەندە کارێکـی سـانا نەبـوو وەلـێ تاکـە ڕێـگا بـوو کـە بـۆی مابوویەوە.

ئەوەنـدەی توانـی فـووی پیاکـرد تـا هەسـتی کـرد کەلکـی ئـەوەی هەیـە لەسـەری بنـووسرێ. بەقەڵەمەکـەی بەگەورەیـی لەسـەری نووسـی ( چەنـد کەسـانێ خسـتمیانە ژێـر مەنهۆڵەکـەوە، تکایـە دەرم بێنـن ).

پارچە کاغەزەکەی لەکەلێنێکی سەری مەنهۆڵەکەوە ڕەوانی ئەودیو کرد، سا بەڵکو یەکێ بەوێدا ڕابورێ و بکەوێتە بەر چاوانی.

مەولەوی هەر لەوێدا بەیانی کردەوە، وەلێ چ بەیانیەک ! بەهەردوو دەستەکانی شیشەکەی گرتبوو. تاو نا تاوێ دڵی هەڵدەچوو دەیهەویست بەرەوە بێ، خێرا لەژێر لێوەوە ئەو ویردانەی شێخ بۆی نووسیبوو دەیگوتنەوە و هەستی دەکرد هێزی پێ دەبەخشن.

لەکۆتاییدا بەتەواوی بەرچاوەکانی تاریک بوون و دونیای لا چەپ و چێر بوو[٣٢٣]. لەژێر لێوەوە چەند جارێک گوتەی شایەدی دانی دووپات کردەوە. لەناکاو گوێی لە تەقە تەقێ بوو، هەستی کرد کەئەمە فریشتەی مەرگەو بۆ ڕۆحی هاتووە.

ئەو دەمەی چاوەکانی کردەوەو سەیری دەوروبەری کرد، لەنەخۆشخانە دەچوو. ژوورێکی فراوانی تەژی لەخەڵک، دەستی بۆ دەم و لووتی برد، هەستی کرد چشتێکی سەیری لەسەر دانراوە، چون تا ئێستا ئۆکسجینی نەدی بوو.

لەناکاو گەنجێ لەلای ڕوونیشت و گوتی مەترسە، تۆ ئێستا لەنەخۆشخانەی. نووسراوەکەتم بینی، ئەو دەمەی هاتبووم هەندێ پاشماوە لەسەر خۆڵەکە فڕێدەم. سەرەتا وامزانی مناڵێک نووسیویەتی و موبالاتم پێی نەکرد، لێ دڕدۆنگیەکی[٣٢٤] زۆری لەدەروونمدا چێ کرد، تاوەکو وای لێکردم چەکوشێ بێنم و قوفڵەکە بشکێنم. شوکر ئێستا سەلامەتی، ئەو دەمەی وەگۆ هاتی برایانی پۆلیس دێن و هەندێ لێدوانت لێ وەردەگرن و کەس و کارت ئاگادار دەکەینەوە.

مەولەوی ئەو ڕۆژە لەنەخۆشخانە مایەوەو هیچی بۆ نەگوترا لەبەر پرزە تەنگی و بێ ئۆقرەیی، بەیانی بۆ پۆلیسەکان هاتە گۆو تێی گەیاندن کە لەکاتی چوونە ماڵە هاوڕێیەکەم چەند کەسێکی چوختی[٣٢٥] ڕێیان لێ گرتووم، وەلێ بەباشی نایان ناسمەوە. هەروەها ناونیشانی مامۆستا عومەری پێدان چون لەحوجرەی ئەو دەمێنێتەوە و پێویست بەئاگادار کردنەوەی ماڵێ ناکا لەم ڕێگا دوورەوە.

---

٣٢٣- چەپ و چێڕ: شتی خوارو گێڕ.

٣٢٤- دڕدۆنگ: دوودڵ.

٣٢٥- چوختی: چەقاوەسوو.



# بەرەو عیرفان

لەدوای ئەوەی مامۆستا عومەر هاتە نەخۆشخانەو مەولەوی لەگەڵ خۆیدا بردەوە حوجرە چەند رۆژێک نەیتوانی وانەکانی بخوێنێ و بچێتە کۆلێژ، چون هەرچی هێزبوو لەلاشەیدا نەمابوو. مامۆستا چی چارەسەری پێویست بوو بۆ مەولەوی سەندبوو، چون ئەوی لە سەرجەم فەقێکان خۆشتر دەویست.

ئەو دەمەی چوویەوە کۆلێژ یەکەم کەس بەرەو ڕووی هات سەمیر بوو.

بە پەشۆکاویەوە هاتەگۆ: سیڕاجی برا، ئەوە لەکوێی کاکە؟ بەخوا شوێن نەما بەدوات دا نەگەڕێم، شوکر سەلامەتی؟

+ سەلامەتم سەمیر، بەم شێوازە لێمان دەپرسی؟ یەک شەو و ڕۆژی تەواو لەنێو مەنهۆڵەکەدا بووم، گەر خێرۆمەندێک دەری نەکردبام ئێستا لە ژێر گڵدا دەبووم.

- ئەی هاوار، ئەم هیچ و پووچانە تۆیان خستە ژێر مەنهۆڵەکەوە! باوەڕم پێ بکە سیڕاج ئەو دەمەی بوو بەشەڕ من بە ڕاکردن چووم هەندێ هاوڕێ ئاگادار کەمەوە، وەلێ کەهاتین کەستان لەوێ نەمابوون، چەند ڕۆژە جێگا نەما بەدواتدا تەی نەکەم.

مەولـەوی داوای لێبوردنـی کـرد کـە هەڵـەی بیـر کردۆتـەوە بەرامبـەری. ئـەو ڕۆژە بەیەکـەوە چوونـە نادیەکـە و بـەدەم خواردنـەوە لەمـەڕ ناڕەحەتیەکانـی ژێـر مەنهۆڵەکـە بـۆ سـەمیر دوا.

وەلـێ هەسـتی دەکـرد وردە وردە سـەمیر خـۆی لـێ دەکشـێنێتەوە و دوورە پەرێـزی لـێ دەکا. تەنانـەت گەیشـتە ڕادەیەک کە هەر شـوێنێ سـیڕاجی لـێ بووایە ئەو کـوڕە بەلایدا گـوزەری نەدەکـرد، ئەمـەش بەڕادەیەک تاقەت پڕوکێن بوو بۆ سـیڕاج کە خەوی شـەوانی لەیـاد بردبوویـەوە. ئاخـر لای سـەیر بـوو هاوڕێیـەک بـێ ئـەوەی هۆیەکی بەدەسـتەوە بێ وەفـای بیـر چێتـەوە، هـەر دەبێ شـتێک لەگۆڕێدا هەبـێ و ئـەو نەیزانێ!.

ڕۆژێ کـە لەنێـو حوجـرە خەریکـی موتاڵای وانەکانـی بوو لـەدەرگا درا، خێـرا دەرگاکەی کـردەوە، ڕوانـی گەنجێکـی تـازە پێگەیشـتوو بـوو، لـەدوای سـەلام کـردن گوتـی:

- کەسێ لێرە هەیە بە نێوی مەولەوی؟

+ منم بفەرموو.

- ئـەم پارچـە کاغـەزە بگـرە، لەمـەودوا واز لـەو ویردانـەی پێشـوو دەهێنـی و ئەمانـە دەخوێنـی. گەورەمـان (جەلالەدیـن) سـەلامی هەبـوو بـۆت، گوتـی پێـی بێـژن هێـزی ئـەم ویردانـەی خوێنـدی ڕزگاری کـرد لەژێـر مەنهۆڵەکـە، ئـەم گەنجـە تەنـێ هۆکارێکی بچـووک بـوو نێـردرا بەهـۆی لەیادبوونـی دروسـتکەرەوە، وە فەرمـووی بـەم نزیکانـە وادەی دیـدار دێ.

ئەمـەی گـوت و بـۆی دەرچـوو، مەولـەوی هەرچەنـد لـەدواوە بانگـی لـێ کـرد لای نەکـردەوە.

سـیڕاجی مەولـەوی وردە وردە لەوانەکانـی حوجـرە وەسـەر دەکـەوت. ئـەو دەمـەی گەیشـتە قۆناغـی سـێیەمی کۆلێـژ ( موغنـی تـوڵاب[٣٢٦])ی دەخوێنـد لەزانسـتی لۆژیکـدا و بوو بەیەکێک لەموستەعیدانی[٣٢٧] حوجرە.

سـەرەڕای ئـەوەش ڕۆژانـە کۆمەڵـێ فێرخـواز سـەردانیان دەکـرد بـۆ خوێندنـی قوڕئـان و تەجویـدو وانـە ئاینیـەکان.

---

٣٢٦- موغنی توڵاب: کتێبێکی لۆژیکیە لەحوجرەکاندا دەخوێنرێ.

٣٢٧- موستەعید: ئەو فەقێیەی لەوانەکانی سەرەوەیەو ئامادەیە بۆ وانە وتنەوە بە فەقێکانی دی.

ڕۆژێـک لەکاتـی بـازاڕ کردنـدا هەمـان ئـەو گەنجـەی دیـەوە کـە سـەلامی شـێخی بـۆ هێنابـوو. بەئەسـپایی وەدوای کـەوت تـا بزانـێ بـۆ کـوێ دەڕوا. دوای چارەکـێ لـە ڕۆشـتن بینـی چوویـە نێـو خانوویەکـی مـەزن کـە چـوار دەورەکـەی بەبـاغ تەنرابـوو. دوو سـێ کـەس لەبـەر دەرگا بـوون هـەر لەخزمەتـکارو چشـت دەچـوون. ئـەو دەمـەی مەولـەوی تـەواو نزیـک بوویـەوە ژنەوتـی کەسـێ دەیگـوت جەنابـی شـێخ لەژوورێیـە؟ هەرچەنـدە نەیزانـی خزمـەت چیـەکان چۆنیـان وەڵام دایـەوە، لـێ کابـرا چوویـە ژووریێ. مەولـەوی ئەمـەی بەدەرفـەت زانـی و خێـرا لەگـەڵ کابـرا خـۆی وە ژووریێ دادا.

خانووەکـە لـەوە قەشـەنگ و نایـاب تـر بـوو کـە لـەدەرەوە بینـی بـووی. باخێکـی مەزنـی لێوانلێـو لەمیـوەی جیـا جیـا، لەنێوەڕاسـتیدا حەوزێکـی دڵگیـر بـەدی دەکـرا کـە هەمـووی بەبـەردی گرانبەهـا نەخشـێندرابوو. مەولـەوی نەیدەزانـی لـەکام لای بڕوانـێ، لەبـەر خۆیـەوە گوتـی باشـە گـەر ئەمـە شـێخە ئـەم هەمـوو سـامانەی لەکـوێ بـوو؟ ئـەی ئـەم خزمـەت چیانـە چـی بـوون لەبـەر دەرگا !

کاتـێ لەدیوەخانەکـە نزیـک بوویـەوە، دی خەڵکێکـی زۆر ڕوونیشـتوون و جەنابـی شـێخ بۆیـان دەدوێ، کـە دوو ڕیزیـان پێـک هاتبـوو لەمامۆسـتای ئاینـی مێـزەر لەسـەر، بەچەشـنێک کـە هەندێکیـان بەپـاوە وەسـتابوون بەرامبـەری.

مەولەوی لەپەنجەرەکە تێیان ڕامابوو، تاوەکو شێخ لەگوتەکانی بوویەوە.

لەپڕ یەکـێ لەموریـدەکان دەسـتی لەسـەر شـانی مەولـەوی دانـاو گوتـی جەنابـی شـێخ تـۆی گەرەکە.

مەولـەوی بەترسـەوە وەگەڵـی کـەوت، خۆشـی نەیدەزانـی لەچـی دەترسـێ، وەلـێ تۆزێ شـڵەژابوو. موریدەکـە مەولـەوی بـردە ژوورێـک هەرچـوار دەوری بەکتێبـی جۆربەجۆر تەنرابـوو، تـا ئێسـتا هێنـدە کتێبـەی لەهیـچ شـوێنێ بـەدی نەکردبـوو. زۆرینـەی پەرتووکـەکان کـۆن بـوون هەندێکیـان نەبـێ.

لـەو دەمـەی بەسەرسـامیەوە خەریکـی تێڕامانـی پەرتووکـەکان بـوو جەنابـی شـێخ دەرگای کـردەوە.

- سـەلام و عەلەیکـوم وە ڕەحمەتـولڵا، ئازیـزی ئێمـە سـیڕاجی مەولـەوی، ئێسـتا حاڵتـان چۆنـە؟ شـوکر لەکۆتاییـدا گەیشـتی.

مەولەوی کەسەری بەرزەوە کرد پیاوێکی سورو سپی ڕیشداری بینی، کەڕیشی پتر بەلای سپیەتیدا دەینواند. هێندە بەسام و هەیبەت بوو مرۆڤ شەرمی دەکرد تێی ڕابمێنێ. ئەو دەمەی چاتر ورد بوویەوە زانی ئەوە هەمان ئەو کەسەیە ئەو ڕۆژە لە کەندەڵانەکە هەڵی گرتەوە و بردیەوە ماڵێ، وەلێ زۆر لەجاران بەهەیبەت ترە.

خێرا وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و بەبێ ویستی خۆی دەستی ڕاموسی[٣٢٨].

- ئەم موڵک و سامانە هی من نییە کوڕم، هی خودایە داویەتی و لەڕێی ئەویشدا بەکاری دێنین. ئێمە ژیانی زبری و چەڵەمەیی مان وەڕێ کرد تا خودا دەرووی لێ کردینەوە. ئەمەی تێی دەڕوانی هەمووی بۆ خزمەتی خەڵکیە و لەنێو دەستانمان دامان ناوە نەک لەنێو دڵ.

ئەم خزمەت چیانەش لەڕێگای خودا هاتوونە بۆ خزمەتی ئەو کەسانەی دێن لێرە دەمێننەوە و بۆ خزمەتی خۆم نەمگرتوون.

ئەم مامۆستایانەش کە بەپاوە وەستابوون خۆیان وازیان لەوەیەو من چەند جارێک پێم گوتوون کە ڕووبنیشن، وەلێ دەڵێن ئاوا ڕاحەت ترین.

هیچ ڕەخنەی دیکەت هەیە؟

- ئەستەغفیرەڵا قوربان، ئێمە بۆمان نییە ڕەخنە گربین لەخزمەتی ئێوەدا.

+ کوڕم سیڕاج، دەزانم لەم زەمەنەدا گوێچکەکانت لێرەو لەوێ سیخناخ[٣٢٩] دەبن لە وشەی خۆشەویستی و ئاورینگدار[٣٣٠]. دەبینی هەموویان شاعیرانە نێوی عیشق و ئەوین دەبەن، ئەمما تۆ نەخەڵەتێی بەبریقە و دەنگ و ڕەنگی ئەوان، چون تۆ ڕێبوارێکی تینووی و لەدوورەوە کە ئەم گۆزە ڕەنگاو ڕەنگانە دەبینی وا تێدەگەی وەک چۆن دیمەنی گۆزەکان سەرنج ڕاکێشن بەهەمان شێواز تەژین لەئاوی سازگاری تینوو شکێن. وەلێ کاتێ نزیک دەبیەوەو سەرنجی نێوی دەدەی دەبینی خاڵیە لەهەرچی ئاو، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو لیخن بووە لەخڵت و تۆزی بێ بەها.

---

٣٢٨- ڕاموسین: ماچکردن.

٣٢٩- سیخناخ: پڕکردنی شتێک لەشتێک.

٣٣٠- ئاورینگ: بروسکانەوە ، ئاورینگدار: بریسکەدار.

کوڕەکەم لەم سەردەمەی وا تیایـن، عیشـق و ئەوینـی سـەر زاری ئـەم خەڵکە چەشـنی گۆزەکـە نێـوی خاڵیە.

وا هەسـت نەکـەی ئـەو عیشـقەی نالـی بـۆ حەبیبـە و مەولـەوی بـۆ عەنبـەر خاتوونـی دەربڕیـوە هەمـان ئەوەیـە کەئێسـتا لـەو خەڵکـەی دەبینـی.

عیشـقێ لەسـەر زاربێ جیایـە لەگـەڵ ئـەو عیشـقەی تێکەڵـی ڕۆحـە، عیشـقیش گـەر لەگـەڵ ڕۆح ئاوێتـە بـوو بیـر لەئـارەزوو بـازی ناکاتـەوە.

چاوەنـووڕی وەدەسـت هێنانـی خۆشەویسـتی لەکەسـانی دەوروبـەرت مەکـە. وەلـێ تـۆ هەموویانـت خۆشـبوێ لەپێنـاوی خـودا، چـون ئەسـڵ لەخۆشەویسـتی خۆشەویسـتی مـەولای حەقـە، جگـە لـەو هەرچـی دیکـە هەیـە مەجـازە.

گـەر هەمـوو دروسـتکراوان خۆشـیان ویسـتی بزانـە کێشـەو کەموکوڕیـەک لەتـۆدا هەیـە کـەوای کـردووە هەمـوو لێـت ڕازی بـن. دڵنیابـە ئەگـەر حەقێکـت وتبـێ ئـەوەی لەسـەر ناحەقـە ڕقـی لێتـە ، وە گـەر ڕۆژێـک ئامۆژگاریـت کردبـن کەسـانێک هەبـوون حەزیـان لـە ئامۆژگاریەکانـت نەبـووەو بێزاریـان بەرامبـەر دەربڕیـوی.

ئەگـەر هەمـوو سـاتێکیش بەپێـی خواسـت و ویسـتی ئـەوان جووڵابێتیـەوە ئـەوا لەمرۆڤ بـوون دەرچوویـت. کەوابـوو تـۆ ناتوانـی دڵـی هەمـووان ڕازی بکـەی مەگـەر هەندێکـی نەبـێ. بۆیـە ڕوو لەخـودای حـەق بکـەو پشـت بکـە لـە دروسـتکراوان.

خـۆ ئەگـەر ئـەوان گوتـە چاکەکانـی تۆیـان وەرنەگـرت ئـەوا بڵـێ ئـەوا مـن ئامۆژگاریم کـردن، وەلـێ ئێـوە ئامـۆژگاری کەرانتان خۆشـناوێ.

ئیـدی هێنـدە دڵگـران مەبـە کەگـوێ بەگوتەکانـت نـادرێ. هێنـدە بەسـە بـۆ تـۆ کەیـەک کـەس سـوودت لـێ وەرگـرێ و بەهـۆی تـۆوە ڕێـگای ڕۆشـن بناسـێ، ئەمـە وەکـو ئـەوە وایـە چەندیـن وەچـە و بنەماڵـەت نەجـات دابـێ لەلافـاوی وێرانکـەر.

ئەو دێڕەی مەحویت لەیاد نەچێ:

هەتا حەق ناسیرە هەر حـەقمە مەنزوڕ

وەکو مەنسوڕ ئەگەر بمکەن بـە دارا

- ڕوونیشـە کـوڕم، لەمـەودوا ئێـرە وەکـو ماڵـی خۆتـە، تـۆ یەکێکـی لـە سـالیکان و بـەردەوام ویردەکانـت لەیـاد بـووە.

مەولـەوی بەشـەرمەوە ڕوونیشـت لەخزمەتـی شـێخ (جەلالەدیـن). هەسـتی بـەدڵ ڕۆشـنیەک دەکـرد کـە لەمەوپێـش بـە خایلـەو ختـوورەی دڵیـدا نەهاتبـوو، دەتگـوت لەشـەقەی بـاڵ دەداو ئاسـمانە فراوانـەکان تـەی دەکا.

+ قوربـان مـن تـازەم و چشـتێکی وا نازانـم دەربـارەی (تەسـەوف)، ڕێگاکـەی ئێـوە چۆنـەو لـە چییـەوە سـەرچاوەی گرتـووە؟

- کوڕەکـەم تـۆ چەندیـن سـاڵە زانسـتە شـەرعیەکان دەخوێنـی، هـەر زانسـتە و دەربارەی بوارێکـەو لەئـەوی دیکـە جودایـە. نەحـو سـەڕف دەخوێنـی تاوەکـو فێـری ڕێزمانـی عەڕەبـی ببـی، فیقهـ دەخوێنـی تاوەکـو ئـاگاداری حـەڕام و حـەڵاڵ و مەکڕوهـ و موبـاح و ئـەم بابەتانـە بـی، عەقیـدە دەخوێنـی تاوەکـو شـارەزای بیروباوەڕەکـەت ببـی. ئـەم زانسـتانە هەمـووی بەخوێنـدن وەدەسـت دێـن، وەلـێ زانسـتێکی دیکـە هەیـە پەیوەنـدی بـە پـاک کردنـەوەی دڵ و نهێنیـت هەیـە، ڕووت لەعیشـقی دونیـاوە وەردەچەرخێنـێ بـۆ عیشـقێکی ئیلاهـی، ڕزگارت دەکا لەنەخۆشـیە کوشـندەکانی دڵ.

تۆ تا ئێستا زانستەکانت دەخوێنا، وەلێ تەسەوف فێرت دەکا چۆن کار بەو زانستانە بکەی، چۆن ئیخڵاست هەبێ تیایانداو گشت جووڵانەوەیەکت لەبەر ڕەزامەندی خودابێ.

ئەمە وەکو زانستەکانی دیکە بەخوێندن وەدەست نایە، بەڵکو دەبێ بیچەژی.

گـەر تـۆ تامـی ئـەم میوەیـەت نەکردبـێ تـا بەیانـی پێـت بێـژم ترشـە یاخـود شـیرینە ناتوانـی لەحەقیقەتەکـەی بگـەی، چـون زۆر شـتی دیکـەی تـرش و شـیرین هـەن. وەلـێ ئـەو دەمـەی خـۆت میوەکـەت بـۆ دەمـت بـردو چەشـتت ئەوسـا دەزانـی تامـە حەقیقیەکـەی چییـە.

گەر تەسەوف و عیرفانت گەرەکە وەرەو بیچەژە، ئەمە کاری باسکردن نییە.

لەهەمـوو زەمەنێکـدا کۆمەڵەیەکـی تایبـەت هەبـوون کـە خۆیـان بـۆ خـودا یەکلایـی کردبوویـەوەو نەفـس و دونیایـان تـوڕ دابوویـە ئـەولا. لەشـوێنە تەنهاکانـدا دەمانـەوەو کاریـان یادکردنـی خـوداو لـەدڵ دەرکردنـی دروسـتکراوان بـوو. ئیـدی لەهـەر سـەردەمێک جـۆرە ناوێکیـان بـۆ ئـەم خواناسـانە دانـاوە ( ڕاهیـب – ڕەبـەن – عـەوداڵ – نوسـاک – زاهیـد – عاریـف)، لەسـەدەی دووەمـی کۆچـی نـاوی سـۆفی بەربـڵاو بـوو، هەروەکـو ئیبن خەلـدون دەفەرمـوێ ( کاتـێ لەسـەدەی دووەم بـەرەو سـەر ڕووکردنـە دونیـا بـڵاو بوویـەوەو خەڵکـی باڵیـان بـۆ دونیـا ڕاخسـت، لـەو دەمەیـدا خەڵکانێـک

بەتایبەتــی ڕوویــان لەعیبــادەت و خــودا پەرەســتی کــرد کــە پێیــان دەگوتــرا ســۆفی ).

ڕەحمەتــی خــوا لەپێشــەوا شــافیعی بــێ کــە لەدیوانەکەیــدا دەفەرمــوێ ( شــەرعزان بــەو ســۆفیش بــە ، نەکــەی تەنیــا یەکێکیــان بــی، چــون گــەر تەنهــا شــەرعت زانــی و گرنگیــت بەپــەروەردەی دڵ نــەدا، کەسێکی تونــدو دڵ ڕەق دەردەچــی. ئەگــەر ســۆفیش بوویــت بەبــێ عیلــم و زانســتی شــەرع، ئــەوا کەسێکی نــەزان و جاهیلــی ).

+ باشە من چی بکەم، تا بەو ڕێگایەی ئێوە دابچم؟

- دڵــت پاڵفتەکــە بــۆ خــوداو واز لــە دروســتکراوان بێنــە. ئــەوان ستایشــت بکــەن یاخــود بەخراپــە لێــت بدوێــن یەکســان بــێ لــەلات، چــون کاری تــۆ بەدەســت هێنانــی عیشــقی خودایــەو هیچــی دی.

لەکردارەکانــت دڵســۆزی بنوێنــە بــا بــۆ خــودا بــن، لەســەر ویردەکانــت بــەردەوام بــەو هەفتانــە ســەردانمان بکــە، ئیــدی وردە وردە تامــی عیشــقی ئــەو دەچــەژی.

ئێستا بڕۆ تا لەحوجرە چاوەنووڕت نەبن.

مەولــەوی هەڵســاو گەڕایــەوە حوجــرە، وەلــێ هەســتی دەکــرد کــە گەوهەرێکــی بەنرخــی وەدەســت خســتووە.



## ئەو دەمەی عیشق دەتگوشێ

ئێــوارەی ڕۆژی هەینــی مامۆســتا عومــەر لەنێــو فەقێکانــدا ڕوونیشــتبوو، بــاس و خواســی چێژبەخــش لەنێویانــدا دەگــوزەرا. هەنــدێ جــار نوکتــەو گوتــەی گاڵتەئامێــزی دەوروژانــد بــۆ دڵخۆشــی فەقێــکان.

لەنــاکاو لــەدەرگای مزگــەوت دراو مەولــەوی چــوو دەرگاکــەی واڵاکــرد، وەلــێ چــی بینــی ! هێدمــە بــوو[٣٣١] ئــەو دەمــەی چــاوی بەســەمیر کــەوت. ئاخــر ئــەو موددێکــی زۆر بــوو هــەر سڵاویشــی لــێ نەدەکــرد.

لــەدوای هــەواڵ پرســینێکی گــەرم ســەمیر هاتــە گــۆ: کارێکــی خێــرم پێــت هەیــە مامۆســتا ســیڕاج، دەبــێ هەرچۆنــێ بــێ بۆمــی جێبەجــێ کــەی.

+ لــەدوای ئــەو هەمــوو ون بوونەشــت چــی لەدەســت ئێمــە بــێ دەیکەیــن، بەتایبەتــی گــەر ڕوو لەخێــر بــێ.

- ئەمشــەو خوشــکەکەم مــارە دەبــڕدرێ لەئامۆزایەکــی خــۆم، دەزانــم تــۆ چەندیــن ســاڵە لێــرە دەخوێنــی و هێنــدەت نەمــاوە ببــی بەمامۆســتایەکی کامــڵ. زۆرم لا خــۆش دەبــوو

٣٣١- هێدمە: تاسان ، شۆک.

گـەر تـۆ مارەبڕینەکـە ئەنجـام بـدەی.

+ وەلێ تا مامۆستا عومەر لێرەبێ من ئەو کارانە ناکەم، دەبێ زۆر بمبووری.

- ئاخـر مـن قسـەم لەگـەڵ ماڵـەوە کـردوە کـە تـۆ دێـی بـرا، دڵنیـام دڵـم ناشـکێنی مەولـەوی گیـان، ئەمجارەیـان ئۆتۆمبێلـم لایـە و دڵنیابـە تووشـی هیـچ حاڵەتـی نەخـوازراو نابیـن.

سـەمیر هەرچەنـدە پێداگـری دەکـرد، وەلـێ سـیراج ئامادەیـی دەرنەدەبـڕی بـۆی، لـەو گوتانـە دابـوون مامۆسـتا بـەرەو دەرگا هـات و گوتـی: ئـەوە چـی بـووە مەولـەوی؟

سـەمیر خێـرا هەڵـی دایـێ: قوربـان ئێمـە هاوڕێـی کۆلێژیـن، مامۆسـتا سیـڕاجیش شـوکر بـۆ خـوا چەندیـن سـاڵە خەریکـی زانسـتی ئاینیـە و کەسـێکی شـارەزایە. دەمێکـە داوای لێدەکـەم ئەمشـەو بـۆ مارەبڕینـی خوشـکەکەم بـێ وەلـێ ئـەو ڕازی نابـێ.

- ئیمشـەو لەگەڵـی بـڕۆ مەولـەوی، تۆ ئـەم بابەتانـەت تێپەڕانـدووە و لازمـە بەکرداریش ئەنجامیـان بـدەی. ئێسـتا شـەرحی عەقائیـدی نەسـەفی[٣٣٢] دەخوێنـی، گەرەکـە ڕابێـی لەگـەڵ ئـەم کارانـە.

سیـڕاجی مەولـەوی لەبـەر گوتـەی مامۆسـتا بەناچـاری شـەوێ خـۆی کۆکـردەوە و جلـە کوردیـە تازەکـەی پۆشـی و مێزەرێکـی سـپی خسـتە سـەر. وەلـێ تـۆزێ ترسـی لـێ نیشـتبوو، چـون یەکـەم جـارە بـۆ کارێکـی ئـاوا وەڕێ کـەوێ.

دوای نوێژی عیشا سەمیر بەسواری ئوتومبێلێکەوە هات و مەولەوی لەگەڵ خۆیدا برد.

هەرچەنـدی نزیـک دەبوونـەوە مەولـەوی ترسـەکەی پـتر دەبـوو. بـەردەوام زاری دەجووڵانـد و وشـەی نێـو کتێبەکانـی دەهێنـاوە یـادی، نەبـادا لـەوێ چشـتێکی هەڵـە بەسـەر زوبانـی دابـێ.

لەنـاکاو سـەمیر ئۆتۆمبێلەکـەی لەکۆڵانێـک ڕاگـرت و گوتی: گەیشـتین بـرا، هەرچەندە حەقـی وایـە ماڵـە زاوا مـەلا بێنـن، وەلـێ چـون ئێمـە خزمیـن و ئەتـۆش کەسـێکی بێگانـە نـی لێمـان، بۆیـە فەرقـێ نـاکا.

مەولـەوی سـەرنجی ڕێگاکـەو شـوێنەکەی بـە وردی دا، وەلـێ ئـەوە هەرگیـز ئـەو جێگایـە نییـە کـە پێشـووتر سـەمیر ئـەوی بـۆ هێنـا گوایـە دەیباتـەوە ماڵـێ.

---

٣٣٢- شەرحی عەقائیدی نەسەفی: کتێبێکە لەزانستی عەقیدە، دانراوی ئیمامی تەفتازانیە.

لەدیمەنـی خانووەکـە ڕا دیاربـوو کەخێزانێکـی پـارەدارن، وە خەڵکێکـی زۆر لـە دەورەی خانووەکـە بـەدی دەکـران و بـۆ ئاهەنگەکـە خۆیـان تیـف تیفـە دابـوو.

سـەمیر مەولـەوی ئاڕاسـتەکرد بـەرەو ژووریَ، تاوەکـو گەیاندیـە دیوەخـان و جێـگای ڕوونیشـتنی میوانـان.

یەکـە یەکـە تەوقـەی لەگـەڵ میوانـەکان کـرد، وەلـێ ئـەو چشـتەی مەولـەوی خسـتە لـەرزە ئامادەبوونـی مـام (ڕەحیـم)ی باوکـی سـەناریا بـوو، ئـەو دەمـەی دەسـتی خسـتە نێـو دەسـت بەبـێ ویسـتی خـۆی ڕەنگـی زەرد هەڵگـەڕا.

ئـەی خودایـە، تـۆ بڵێـی ماڵـی سـەمیر خزمێکـی نزیکـی سـەناریا بـن؟ ئاخـر گـەر وابـێ بۆچـی سـەمیر تـا ئێسـتا لەمـەڕ ئـەم بابەتـە نـەدواوە، خـۆ مـن بەتـەواوی دەربـارەی سـەناریا بـۆ ئـەو دواوم !

وەلـێ خـۆ سـەمیریش باوکـی نـاوی (ڕەحیـم)ە ! چاویشـی سـەوزن و لەسـەناریاش دەچـێ! ناوەکەشـی ڕێـک لەگـەڵ نـاوی ئـەو دێتـەوە، ئـەی خودایـە مـن چـۆن پێشـتر درکـم بـەم شـتانە نەکـردووە !

مەولـەوی لـەم خەیاڵانـە دابـوو لەپـڕ سـەمیر ڕووی لەمـام ڕەحیـم کـردو گوتـی: باوکـە ئەمـە مامۆسـتا سیـڕاجە، کەئەمشـەو قـەرارە سـەناریای خوشـکم لـە شـوانی ئامـۆزام مـارە ببـڕێ، هاوڕێیەکـی خۆشەویسـتی کۆلێژمـە.

بـە بیسـتنی ئـەم گوتەیـە مەولـەوی بەتـەواوی سـوور هەڵگـەڕا، ئارەقـە بەنێوچاوانیـدا غلـۆر دەبوویـەوە. هەسـتی دەکـرد پـرزەی[٣٣٣] بـۆ ناخورێتـەوە و سـەرپاکی[٣٣٤] لاشـەی لـەرزە لەرزیەتـی.

خـۆ گـەر لەشـەرمی میوانـەکان نەبوایـە لەبـێ ئۆقرەییـدا پـڕ بەدەنگـی لەهارژنـی[٣٣٥] دەداو خـۆی بەپەنجـەرە و دیـواری ماڵەکـەدا دەکێشـا.

مـام ڕەحیـم ڕووی تێکـردو گوتـی: بەخێرهاتـی مامۆسـتا گیـان، خۆشـحاڵ بـووم بەدیدارتـان، وەلـێ لـەوە ناچـێ حاڵتـان بـاش بـێ، گـەر چشـتێکتان گەرەکـە بفەرموون؟.

---

٣٣٣- پرزە: هەناسە.

٣٣٤- سەرپاک: سەرتاپا.

٣٣٥- هارژن: هاوار.

+ نا چشتێکی وا نییە، تەنێ لازمە هەندێ ئاو بەسەرو چاوم دابکەم، لەسەر مۆڵەتی ئێوە.

- هەڵسە سەمیر یاوەری مامۆستا بکە بۆ دەست شۆرەکە.

مەولەوی هەڵساو بەتەواوی ئاگای لەدەوروبەری بڕابوو. هەستی دەکرد سەمیر لەژێر لێوانەوە پێدەکەنی، وەلێ مەولەوی لەحاڵێکدا بوو کە نەیدەویست لەکەس بڕوانێ.

دەرگای حەمامەکەی لەسەر خۆی گاڵەداو[336] ئەسرینی چاوانی وەکو لێزمەی باران بەسەر کولمی لەتیفیدا ڕێیان دەکرد.

بگری، هێندەی دەتوانی بگری، دەڵێن گوایە گریان دڵ ئارام دەکا، وەلێ لەم حاڵەدا ئارامی بوونی نییە. لەکوێ ئارامی هەیە لەکاتێکدا تاقە نەمامی چەند ساڵەم ئیمڕۆ بەدەستانی خۆم دەنێژم، هیواو ئاواتی چەندین ساڵم بەدەستی خۆم ڕیشەکێش و هەلا هەلا دەکەم.

گوڵی ئاواتی من ئیمڕۆ بەدەستی خۆم کە دەتنێژم
دە وەڵاهی لەڕۆح کێشان گەلێ ناخۆش ترا ئێشم

دەمێ بووم چاوەڕێی وەسڵت نەهاتی ڕۆحەکەم ئاخر
ئەمێستاکە لەبۆ مەرگم عەزیزم دێیەوە پێشم

گەر لەبەر ڕێزو شکۆی ئەو مێزەرەی سەرم نەبێ لەهارژنی گریانێ دەدەم. وەلێ ئەوان چی تێدەگەن لەعیشق، لای ئەوان مەلا مرۆڤ نییە، ناگری و هەست و سۆزو خەمی نییە، دەبێ هەموو دەمێ لەقوژبنێکی مزگەوتدا بکەوێ و نێتە دەرێ. چووزانن ئەم هۆنراوە پڕ عیشقانە هەمووی لەحوجرە نووسراون، ئەوان چووزانن کەپیرانی عیشق (نالی و مەحوی و مەولەوی) گشتیان مێزەر بەسەرو دەرچووی حوجرەن.

خۆزگە ئەو ڕۆژە لەژێر مەنهۆڵەکە[337] نەجاتم نەدەبوو، خۆزگە نەبووبام و کەس نەیناسیبام[338]. خودا تۆڵەت لێ بکاتەوە سەمیر، چیت بەسەر هێنام،

٣٣٦- گاڵەدان: داخستنی دەرگا.

٣٣٧- مەنهۆڵ: مەزرا.

٣٣٨- ئاماژەیە بەئایەتی ٢٣ لەسوورەتی مەریەم: خۆزگە پێش ئەم حاڵەتە دەمردم و لەبیر دەچوومەوە و فەرامۆش دەکرام.

چۆنت لەلافاوی خەم خستم. خودا ئەو چاوە سەوزانەت بەخاردا بەرێ. نا نا ئەوە من چی دەڵێم، چۆن دەبێ نزای خراپ لەخەڵک بکەم، مەگەر شێخ نەیگوت دەبێ هەمووانت خۆشبوێ. خودایە لێم ببوورە گەر لەم تاقی کردنەوە مەزنەدا چشتێکم گوتبێ و تۆی پێ عاجز بووبی. ئەی ئارام بەخش ئارامیم پێ بدە، سوێند بەتۆ گەر ئارامم نەکەیەوە ناتوانم ئەم پرۆسەیە بەڕێوە ببەم.

سیراجی مەولەوی ئەسرینەکانی سڕین و هەندێک لەویردەکانی خوێندو تۆزێ هێزی هێنایەوە خۆو بەرەو ژووری گەڕایەوە.

هەندێ لەمەڕ گەورەیی خێزان پێکەوەنان دوا، هەموو سەراسیمە ببوون ئەو دەمەی سەیری ڕووی مەولەویان دەکرد کە ئەسرینەکانی ڕایەخەکەی ژووریان تەڕ دەکرد. هەندێ لەبەر خۆیانەوە دەیان گوت لەوە دەچێ مەلایەکی زۆر تەقوادار بێ و بەرگەی خوێندنەوەی ئایات و فەرموودەکان ناگرێ، بازێکیش دەیان گوت بابە لەبەر ڕیایەتی تا تۆزێ ماڵی پتر پێ بدەن.

وەلێ مەولەوی لەحاڵێکدا بوو کە بوون و نەبوون جیاوازیەکیان نەبوو لەلای.

ئەو دەمەی بووک و زاواو شایەدەکان و سەرپەرشتیار ئامادەبوون و بانگی مەولەویان کرد بەرەو ژووری مارە بڕینەکە، هەستی دەکرد دەست و پێکانی قۆڵبەست کراون و خەریکی ڕێکردن بەرەو پەتی سێدارەیە. ئاخر گەر لەبەر شکۆی مەلایەتی و مێزەرەکەی نەبوایە بەبێ گومانی ڕای دەکردو ئەوێی جێ دەهێشت، وەلێ نەیدەویست کارێ بکا مێزەر بەسەرانی پێ لەکەدار بێ.

هەموو ترسەکەی لەوە گرد ببوویەوە کەچۆن بتوانێ لەبەردەمی سەناریا بوەستێ و داوای ڕازی بوونی لێ بکا. تەمەنناى دەکرد خودا ڕۆحی بکێشێ و ئەم دیمەنە نەبینێ.

لەکۆتاییدا چوویە ژوورێ، لەلای زاویەکە هەستی بەبوونی بووک و زاوا کرد، تۆزێ ئەولاتر مام ڕەحیم و شایەدەکان ڕوونیشتبوون.

ژوورەکە تەژی[339] ببوو لەبۆنی سەناریا، جگە لەبۆنی ئەو بۆنی دیکە بوونی نەبوو. مەولەوی هێشتا ئەو بۆنەی منالی دەناسێتەوە، تەواوی یادگاریەکانی منالی وەکو فیلمێک لەبەر چاویەتی و لێی دەداتەوە. ئەو ڕۆژانەی لەبەردەمی سەناریادا دەوەستاو گوێ دەکرد، هۆنراوەی بۆ دەخوێندەوە، باسی قوڕئانیان دەکرد،

---

٣٣٩- تەژی: پڕ.

بەڵـێ ئەمـە هەمـان ئـەو بۆنـەی مناڵیـە کـە ئێسـتا کاسـەی سـەری مەولـەوی مەسـت کـردووە و هۆشـی لا نەهێشـتووە. هەسـتی دەکـرد ئارەقـە تـا ژێـری پـای هاتـووە، سـەری سـوورِ دەخـواو خەریکـە بـەر دەبێتـەوە.

لەپڕێکـدا لای کـردەوە بـەلای زاواو گوتـی: تـۆ ڕازی بەمارەکردنـی خاتـوو سـەناریا و چ کـەس زۆری لـێ نەکـردووی؟ مەولـەوی بەڵێیەکـی نەرمـی هاتـە بـن گوێچکـەی، چـون هیچـی وای نەدەبینـی و ماڵەکـە لای چـەپ و چێـرِ[340] بوویـەوە.

تـۆزێ هێـزی خسـتەوە بـەر خـۆی و ڕووی لەسـەناریا کـرد، لـێ بـەر چاوانـی هێنـدە لێـڵ بـوو کەنەیدەتوانـی ببینـێ، هەمـان پرسـیاری ئاڕاسـتەکردو لەگـەڵ بەڵێـی ئـەودا بوورایـەوە و ئـاگاداری هیـچ نەمـا.

ئـەو دەمـەی وەهـۆش هاتـەوە خەڵکێکـی زۆری لەسـەر خـۆی بـەدی کـرد کەبانگیـان لـێ دەکـردو ڕوخسـاریان تـەڕ کردبـوو.

خێـرا هەڵسـایەوەو دەسـتی گەیانـدە مێزەرەکـە و خسـتیەوە سـەری و گوتـی: داوای لێبوردنـم قەبـووڵ بفەرمـوون لـەم حاڵەتـە. لەڕاسـتیدا ئیمـڕۆ زۆر زۆر نەسـاغم و پێویسـتیم بەدکتـۆر هەیـە.

مـام ڕەحیـم هەڵـی دایـێ: هەرچۆنێـک بـێ پڕۆسـەکە تەواوکـە قوربـان، لـەو دەمـە مـەلای دی لەکـوێ بێنیـن، دواتـر بـا سـەمیر بتگەیەنێتـە نەخۆشـخانە. هـەر لەسـەرەتاوە زانیـم حاڵـت بـاش نییـە، خێـری پێـوە دەبـێ ئینشـاڵا.

دووبـارە خەڵکەکـە چوونـەوە دەرێ جگـە لـە مـام ڕەحیـم و زاواو شـایەدەکان نەبـێ. مەولـەوی بەهانـە هـان هـەردوو گوتـەی تەزویـج و ئینکاحـی[341] دەربڕیـن و مـام ڕەحیـم و تـازە زاوا لـەدوای گێڕایانـەوە. ئـەو ڕۆژە بەدەسـتی خـۆی سـەناریای ئاواتـی چەنـد ساڵەی لـە شـوانی ئامـۆزای مارەبـڕی بەمارەیـی سـەد میسـقاڵ زێـڕ.

بەڕاسـتی سـەختە، ڕۆژانـێ بـوو تەنانـەت بەبیرکردنـەوە لـەم بابەتـە دەمـرد، وەلـێ ئێسـتا دەبـێ بەدەسـتانی خـۆی لەکەسـێکی دیکـەی مارەببـڕێ. وای لـەم ئـازارە، وای لـەم مەرگـە ترسـناکە، وای لـەم عیشـقە کەچـۆن کۆتایـی دێ، مەگـەر کـێ دەزانـێ قـەدەر چـی لێـدێ، هەمـوو لەبەرامبەریـدا دەستەوسـانن.

---

٣٤٠- چەپ و چێڕ: خوارو گێڕ.

٣٤١- تەزویج و ئینکاح: دوو گوتەن لەکاتی مارەبڕین دا دەردەبڕدرێن.

دوای ئـەوە مـام ڕەحیم دەسـتی خسـتە ژێـر باڵی مەولـەوی و لەگـەڵ سـەمیردا گەیاندیانە لای ئۆتۆمبێلەکـە، لـەدواوەش پێقۆتکـەو[342] چەپکوتانێ[343] بوو هەر مەپرسـە.

ئــەو دەمــەی مەولــەوی لەنێــو ئۆتۆمبێلەکــە ڕوونیشــت ســەمیر بەچــاوی تــەژی لەئەسرینــەوە هاتەگــۆ:

- دەچیتە نەخۆشخانە یاخود بتگەیەنمەوە حوجرە؟

+ دەڕۆمــەوە حوجـرە سـەمیر، دەزانـم بەئەنقەسـت وات لێکـردم، وەلـێ نـزای بەخێرتـان بـۆ دەکـەم.

سـەمیر بەگریانـەوە: بمبـوورە سیـڕاج، تخـوا بمبـوورە بـرا، کەسـێکی زۆر خـراپ بـووم لەگەڵـت، لـێ ئـەو ڕۆژەی نـاوی خوشـکمت بـردو بـەدڵ ڕەق و بێوەفـا لێـی دوای بەڵێنـم دا کەتۆڵـەت لـێ بکەمــەوەو ئـازارت بـدەم. ئەمـا کـە ئێسـتا بـەم چەشـنە تـۆم دی گەلـێ پەژیوانـم، نـەم دەزانـی ئـەم عیشـقە بـەم ڕادەیـەش ئـازار بەخشـە مەولـەوی گیــان نەمدەزانــی، ئاخــر مــن تەنــێ لەســەر زاران عیشــقم ناســیبوو، لــێ ئیمــڕۆ تــۆ بەکـرداری نیشـانت دام عیشـق چییـە !.

+ تەنیا بمگەیەنەوە و تەواو، پێویستیم بەپشوویەکی زۆر هەیە و هیچی دی.

سـەمیر مەولـەوی گەیانـدەوە بـەر دەرگای حوجـرە و بـەزۆر پاکەتـێ شـیرینی خسـتە دەسـتی بـۆ فەقێـکان. ئـەو دەمـەی مەولەویـان دی هەمـوو وێکـڕا هاتنـە دیـاری تـا بزانن چـی بـۆ هێنـاون و چـۆن مارەبڕینەکـەی ئەنجـام دا. وەلـێ بەبـێ ئـەوەی یـەک نقەشـی لێوەبـێ، هـەر بەجلـە تازەکانـەوە خـۆی خسـتە ژێـر جێـگاو هەسـتی دەکـرد تایەکـی تونـدی گرتـووە.

---

٣٤٢- پێقۆتکە: هەڵپەڕکێی گەرم.

٣٤٣- چەپکوتان: چەپڵە لێدان.



# هەڵسانەوەیەکی دی

سیراجی مەولەوی نزیکەی هەفتەیەک کەوتە ژێر جێگاو نە توانی وانەکانی حوجرە بخوێنێ، نە بچێتە کۆلێژ.

ئاخر ئەو دەمێ بوو دەستی لەسەناریا هەڵگرتبوو، خەیاڵی لی نەدەکرد، وەلێ لەگەڵ ئەم ڕووداوە هەموو چشتێ تازە بوونەوە.

لەدوای هەڵسانەوە یەکەم کاری چوونە لای شێخ جەلالەدین بوو، چون ئەوێ تاکە مەنزڵی ئۆخژن کردنەوەی بوو.

ئەو دەمەی چوویە لای شێخ سەرنجی کەوتە سەر گەنجێک کە لەبەرامبەری ڕوونیشتبوو، هەمان ئەو گەنجە بوو کە ئەو ڕۆژەی چوختیەکان[٣٤٤] پەلاماریان دا لەماڵی ئەو چاوی هەڵهێنا.

لەبەر ئەوەی شێخ جەلالەدین خەریکی وتار و ئامۆژگاری بوو، مەولەوی بەبێ سەلام چوو لەئاتەک[٣٤٥] گەنجەکە ڕوونیشت و شێخ بەردەوام بوو لەسەر گوتەکانی:

---

٣٤٤- چوختی: چەقاوەسوو.

٣٤٥- ئاتەک: تەنیشت.

خـودا مـرۆڤ تاقـی دەکاتـەوە، بەتایبەتـی ئەوانـەی خۆشـی دەوێـن، وەنەبـێ مەبەسـتی ئازاردانیـان بـێ ، بەڵکـو دەیهـەوێ فێـری ئـارام گرتنیـان بـکا.

کەسـە خۆشەویسـتەکانت لـێ دەسـەنێ تاوەکـو جگـە لـەو دڵ بەکەسـی دیکـە نـەدەی. واز لەفانیـەکان بێنـی و چشـتێ دەسـت خـەی کـە فانـی نییـە.

ئەو دەمەی ئادەم مەیلی بەمانەوەی بەهەشت دا خودا لێی سەند، حەزرەتی یەعقوب مەیلی بەیوسفی کوڕی دا خودا لێی سەند، بۆ ئەوەی عیشقێکی باڵاتر دەست خەن کەعیشقی خودایە، چون خودا نایهەوێ لەگەڵ خۆیدا کەسی دیکە لەنێو دڵت بەدی بکا.

هـەروەک شـێخی گەیلانـی ڕەحمەتی لێبـێ دەفەرموێ ( تـا گەردیلەیەک دروسـتکراوت لـەدڵ بـێ نزیکـی لـەو نابینـی، تـا گەردیلەیـەک دونیـات لـەدڵ بێ پەسـڵان[٣٤٦] لەبـەردەم خـۆت نابینـی، تـا گەردیلەیـەک پەسـڵانت لـەدڵ بـێ نزیـک کردنـەوەی خـودا نابینـی )، بەڵکـو لازمـە واز لەدونیـاو پەسـڵان بێنـی و لەگـەڵ خـودادا تەنهـا بکەوی.

هەنـدێ لـە خواناسـان وەکـو ڕابیعـەی عـەدەوی دەیان فەرمـوو ( نـە لەبەر ترسـی دۆزەخ و نـە لەبـەر ئـارەزووی بەهەشـت خـودا ناپەرسـتم، بەڵکـو تەنیـا لەبـەر خۆشەویسـتیم بـۆی کـە ئـەو شـایەنی پەرسـتنە دەیپەرسـتم ).

سەرەتا واز لەو نوێژە بێنە کە دەیکەی، بەڵێ وازی لێبێنە.

مەولـەوی لەگـەڵ ئـەو گوتەیـەدا خـۆی بـۆ نەگیـراو هاتـە دەنـگ: چـۆن وازی لێبێنـم قوربـان، مەگـەر خـودا پێویسـتی نەکـردووە؟

- بەڵـێ پێویسـتی کـردووە سـیڕاج گیـان، وەلـێ ئـەم نوێـژەی ئێمـە دەیکەیـن وەکـو عادەتـی لێهاتـووە و دوورە لەعیشـق. هـەر پەرستشـێک کـە عیشـقی لەگـەڵ نەبـوو وەکـو توێکڵێکـی بـێ کـڕۆک وایـە.

واز لـەم نوێـژە عادەتیـە بێنـە کەخۆشـت نازانـی چـی دەڵێـی، نوێژێـک بکـە وەکـو ئـەوەی لەبەرامبـەر مەعشـوقەکەت ڕاوەسـتاوی و دەدوێـی. بـا هۆشـت لەسـەر بـێ و چاوەکانـت گریانیـان تـێ بـزێ، ئـەوکات تامـی شـیرینی ئیـمان و پەرستشـەکان دەکـەی.

ڕەحمـەت لەمەولانـا بـێ کەدەیفەرمـوو (حیکمـەت لەنوێژکـردن ئەوەیـە خەمـی خۆمت بۆ بـاس بکـەم و دەردە دڵـت بۆ بکەم، دەنا ئـەوە چ نوێژێکە کە ڕووم لەتۆ بـێ و دڵم لەبازاڕ).

---

٣٤٦- پەسڵان: ڕۆژی دوایی.

هەموومـان مانـدووی دونیایـن، وەلـێ ماندووبـوون کاتـێ خۆشـە کەبزانـی کارەکـەت بەرهــەم داره ، زۆربــەی ماندووبوونەکانــی ئیمــڕۆ چەرخانــە[347] لەنێــو بەتاڵیــدا. ئــەم ڕوخســارانەی دەیـان بینـی تەنهـا دۆلارو تیجـارەت و ئارەزووەکانـی دونیـات دەخەنـەوە یـاد. گــەر کەسـێکت بینـی خـوداو ئاخیرەتـی خسـتەوە یـادت ئـەوا بزانـە کەسـێکی دانسـقەیە و لەدەسـتی مـەدە.

زۆری هاوڕێکانـت سـوودت پـێ ناگەیەنێ گەر لەکاتـی دڵتەنگی و بـەڵادا تەنها بکەوی.

وەلـێ گــەر یــەک هــاوڕێ بەشــداری ناڕەحەتیەکانــی کــردی و بەبینینــی تەناهــی[348] باڵـی دەکێشـا بەسـەرتا و جوانـی و ڕەوشـتی بـاڵات تیایـدا بـەدی دەکرد، ئـەوە شـایەنی هاوڕازیــەو تــۆش هاوســۆزی بــە.

ئەمـما چـی لـەزۆری مرۆڤەکانـی دەورت دەکـەی لـەو کاتەیـدا کەسـێ نییـە ڕازەکانتـی لـەلا بێـژی و دڵـت لای خاڵـی بکەیـەوە؟

بزانــە تــۆ بــێ کەســی و کەســی تــۆ خودایــە، جگــە لــەو گوێگرێکــی دیکــەت نییــە، وەکـو مەحـوی فەرمـووی: بـێ کـەس منـم کەسـێ لەزوبانـم بـگا نییـە
هەمدەم خـــودا نەناسن و دەم پڕ لە یاخـــودا

وەک چــۆن کاتــێ چکۆلــە بوویــت و دەگریــای، دایکــە بەســۆزەکەت بەدەســتە ناسـکەکانی قەتـرە ئـاوە مرواریەکانـی لەسـەر کوڵمـی گەشـت دەخزانـدە خـوارێ، ئـەوا بزانــە ئیمــڕۆ پێویسـتت بـەم گریانــە هەیــە وەکــو پێویسـت بوونـی زەوی بـۆ تیشـکی خـۆر، بـۆ ئـەوەی دڵـت ئۆخـژن بـێ و تووشـی ڕەقـی و قەسـوەت نەبـی.

چون بەڕاستی ئەوەی لەم سەردەمەدا دەگوزەرێ مرۆی عاقڵ تووشی سەرگەردانی دەکا.

وەلـێ ئـەم جارەیـان جـودا لەمنداڵـی بـا هیـچ کـەس ئـاگاداری ئەسرینەکانـت نەبـن و لەسـەر کوڵمەکانـت خۆیـان وشـک بکەنـەوەو مەیـان سـڕە. لێگەڕێ لەسـەر ڕوخسـارت جۆگـە و نەقـش ببەسـتن.

دەزانـی ئەوانیـش غەریـب بـوون و پێیـان خۆشـە لەسـەر کوڵمـی مرۆڤـە دڵ نەرمـەکان بژیـن و تـاوێ لـەوێ وشـک ببنـەوە.

---

٣٤٧- چەرخان: سووڕان.

٣٤٨- تەناهی: ئاسوودەیی.

بـەم گریانـەت کـە لەعیشـقی خـوداو ترسـی لەدەسـت دانـی ئـەو دەیکـەی نـاوت دەچێتـە نێـو چیـن و توێـژی بەئاگایـان.

هێمنیش دەڵێ: بەڵێ گریانی نیوەی شەو دەکا ناسۆری دڵ مەرهەم
کڵوکۆم دادەمرکێنێ و بەجێ دێڵێ دڵی من خـــەم

ئازیزەکانـم... بازۆربـەی پەرستشـەکانتان لەشـەودا بـن، چـون شـەو جێـگا ژوان و خەڵوەتگـەی دڵدارانـە، وەکـو مەحـوی دەیفەرمـوو:

هـەر لەتـاریـکی شەوایـە ڕێ دریێ ئـەهلی نیـاز
ڕازی دڵ ئیفشا بکەن ، خەڵوەتگەهی خاسانە شەو

ئـەی موریـد... دەمـەوێ ئـەوەت پـێ بێـژم کـە ئـاگاداری خـۆت بـی. مەترسـە... دوژمنێ بەدواتـەوە نییـە تـا پێویسـتت بەهەڵگرتنـی چـەک و ئامـرازی شـەڕ بـێ، وە مەبەسـتم ئـاگادار بوونـی تەندروسـتی نییـە، بەڵکـو دەمـەوێ بڵێـم ئـاگاداری ئـەو دوژمنـە بـە وا لەنـاوەوەی خـۆت دایـە. هەرگیـز لـەدەرەوە بـۆ دوژمـن مەڕوانـە لەکاتێکدا دەتوانـی لەنـاوەوە بـۆی بڕوانـی. ئەگـەر ئـەوەی نـاوەوە شکسـت پـێ نەهێنـی چاوەنـوورِی شـکاندنی ئـەوەی دەرەوە مەبـە.

هەمیشـە لەژینـدا (سـەنگین) بـە. نامەوێ کێشـی لەشـت زیاد بکـەی و ببـی بەمرۆیەکی زۆر خـۆری کـەم سـوود، بەڵکـو گەرەکمـە لەهـەر جێـگاو لەگـەڵ هـەر کەسـێکدا بـی، وابکـەی کـە بەچـاوی ڕێـز و ئەدەبـەوە لێت بڕوانـن.

ئەمـەش بەڕێـز گرتـن لەکەسـانی دیکـە وەدەسـت دێ، چـون ڕێـز ئەنجامەکـەی هـەر ڕێـزە. گـەر کەسـێ بـەردەوام ڕێزیـت گرتبـێ هۆکارێکـی بەدەست نییـە تـا بـێ ڕێزیـت بەرامبـەر بـکا، ئەمـما گـەر ڕۆژێ قسـەیەکت بەکەسـێ گـوت و جـۆرە شـۆخیەکت لەگەڵـی کـرد، دەبـێ چاوەنـوورِی ئـەوەش بکـەی کـە ئەویـش بەرامبەرتـی بکاتـەوە.

بۆیـە سـەنگین بـە سـەنگین.... سـوێند بەخـوا هەناسـەکانت، خەنـدە و قاقایەکانـت، گوفتارەکانـت، کردارەکانـت، هـەر هەمـووی کاریگـەری هەیـە لەسـەر کەسـایەتیت و ماڵـەو بەگەردنـت بەنـدە و حیسـاب و کیتابـی هەیـە.

لەشـوێنێکدا قسـە بکـە ئەگـەر قسـەکەت سـوودێکی دەگەیانـد، بـا لەزۆربڵێیـان نەژمێردرێـی. لەشـوێنێکدا پێبکەنـە کەخەندەکـەت دڵـی کەسـانێکی خـۆش دەکـرد،

چـون براکانـت پێیـان خۆشـە کەدەتبینـن وەکـو گـوڵ گەشـاوەبی و خەندە سـەر خونچەی لێوانتـی تەنـی بێتـەوە ، چـون بـاوەڕدار خۆشـی لەسـەر ڕوخسـاری دایـەو دڵتەنگـی لـە دڵـی. گەرنـا لازم نییـە هێنـدە پێبکەنـی کەهیـچ هەیبەتێکـت نەمێنـیٚ لەنێـو خەڵکـی و بەکەسـێکی هەزەلـی و بوودەڵـە لێـت بڕوانـن.

ئەم ژیانە لەوە کورت ترە بەقسەی زۆرو قاقا بەسەری بەرین.

وەلـێ ئاگاداربـە لـەوەی هەمـوو کاتیـش بێدەنگـی بـاش نییـە، چـون گـەر لەشـوێنێک هەڵەیـەک یـا تاوانێکـت بینـی و بێدەنـگ بـووی دیـارە تـۆش بەمـە ڕازیـت.

گـەر غەیبەتـی کەسـێک دەکـراو تـۆش نەهاتیتـە گـۆ یاخـود لـەم کـۆڕە هەڵنەسـتای ئـەوا بەشـداری لەگەڵیـان. ئـەو دەمـەی برایـەک خۆشـی دەوێـی و دەیهـەوێ لەگەڵـت بـدوێ بەبـێ دەنگیەکـەت ئـازاری دەدەی.

کاتـێ پرسـیارێکت ئاڕاسـتە دەکـرێ ناتوانـی بەبـێ دەنگـی وەڵام بەیتـەوە، کەواتـە لازمـە بزانـی چ جێگایـێ قسـەی گەرەکـەو چ جێگایـێ بێدەنگـی گەرەکـە. هەرگیـز نەکـەی لەجێـگای بێدەنگـی بدوێـی و لەجێـگای دوان بێدەنـگ بـی.

هـەر بۆیـە پەیامبـەری ئێمـە سـەلامی خـوای لەسـەر هەمیشـە بێدەنـگ دەبـوو، مەگـەر لەجێگایەکـدا کەلازمـی قسـە بووبـێ.

دەی کەوایـە وشـە لەشـوێنی خـۆی بـدە و زەردەکەنیـش[٣٤٩] لەشـوێنی خـۆی. گـەر لـەوە زیـادو کەمـت کـرد بزانـە لاتـداوە لەیاسـاکان و لازمـە بەخۆتـدا بێیتـەوە.

تـووڕەبوونـێ ئـاسـەواری خـۆشـەویستـی پـێوەبـێ
چـــاترا لەو گـــوفت و خەندەی بۆنی کیزبی لێوەبێ

مەولـەوی هەسـتی دەکـرد جەنابـی شـێخ سـەیری ئـەو دەکاو گوتەکانـی ئاڕاسـتەی دڵـی ئـەوە. لەگـەڵ تێڕوانینەکانـی ئـەودا درکـی بـەوە دەکـرد کـە خەریکـە دڵـی لەشـەقەی بـاڵ دەداو خانـەی ئێـش و ئـازارەکان جـێ دێڵـێ و لێشـاوی ئۆخژنـی بەسـەریدا دەڕژێ.

ئەو دەمەی لەمەجلیس هەڵسا دەتگوت ڕۆژێ لەڕۆژان بەکۆڵانی خەمدا گوزەری نەکردووە.

ئیـدی هەمـوو هەفتەیـەک ئـەوێ بـوو بەمەنزڵـگای. هـەر جـارەو جـۆرە شـەڕابێکی لەدەسـتی سـاقی وەردەگـرت و پـتر و پـتر لەعیشـقی حەقیقـی نزیـک دەبوویـەوە.

---

٣٤٩- زەردەکەنی: زەردەخەنە.

ڕۆژێـک وەکـو هەمـوو ڕۆژانـی دی لەکۆلێـژ دەگەڕایـەوە. ڕوانـی وا چەنـد گەنجـێ لەشـەقامەکە تانەیـان لەکچێکـی تـازە لاو دەدا و لەجوانیەکـەی دەدوان، وەلـێ کچەکـە ئـاگاداری ئـەوان نەبـوو، لەگـەڵ بـرا بچووکەکـەی لەشـەقامەکە دەپەڕیـەوە بـەرەو ماڵـێ و سـەری بـەرزەوە نەدەکـرد.

مەولـەوی ئەمـەی زۆر لـەدڵ گـران بـوو، بەتایبـەت کـە ڕوانـی بـرا بچووکەکـەی یەکـێ بـوو لـە فێرخوازەکانی، بۆیـە بـەرەو ڕووی گەنجەکان هەنـگاوی ناو سەرزەنشـتی کردن.

یەکـێ لـەوان بەگاڵتـەوە گوتیـە مەولـەوی: بەخـوا دیـارە تـۆش سـەروکارێکت لەگـەڵ (ڕویـا)دا هەیـە، بۆیـە وا لەسـەری بـە وەڵامـی.

ئەمما مەولەوی بەر لەوەی کارەکە ناخۆش بێ ئەوێی جێهێشت.

وەلـێ ئـەوەی سەراسیمەی کردبـوو نـاوی ئـەو کچـە بـوو، (ڕویـا). تـەواوی ئـەو ڕۆژە لەنێـو هـزرو دەمارەکانـی دڵیـدا تەراتێنـی بـوو،[350] دەسـتی لـێ هەڵنەدەگـرت، بەبـێ ئەوەی خۆشی بزانێ ئەمە چ حاڵێکەو چی لێی دەوێ !.

لێـرەدا ڕەنـج بەسـەر دەفتەرەکـەوە خـەو بردیـەوە. لەڕاسـتیدا ئـەو ڕۆژە زۆر هیـلاک بـوو، سـەرەڕای ئـەوەش یەشـتا قاچـی ئـازاری دەداو تـەواو سـاڕێژ نەبـوو بـوو. ئـەو دەمـەی دیـەی هەڵهێنـا بانگـی عەسـەری فەرمـوو بـوو، خێـرا نوێژەکـەی بەجـێ هێنـاو گەلـێ نارەحـەت بـوو بـۆ وەی بەسـەر مامۆسـتادا ڕابـوردوە. ئـەو هەرگیـز مامۆسـتای بـەم چەشـنە نەدەناسـی، ئێسـتا ئـەوەی دەیخوێنێتـەوە چشـتێکی دیکەیـە !.

چوویـە بـەر ئاوێنـەو مـوددێ لەچـاوە سـەوزەکانی خـۆی ڕامـا. خەریـک بـوو ڕقـی لێیـان هەڵدەگـرت ئـەو دەمـەی خەیاڵـی سـەناریاو سـەمیری دەکـرد کەچـۆن ئـەم دوو چـاو سـەوزە بـێ بەزەییانـە ئـازاری مامۆسـتایان داوە.

ئـەو ڕۆژە لەگـەڵ ئەحمـەد ڕێککەوتـن بـەرەو پاڕکـی گـەورەی شـار بچـن و هەنـدێ هـەوای تـازە هەڵمـژن، چـون مـوددێ بـوو لەبـەر ئێشـی قاچـی نەچووبوویـە دەرێ.

ئێـوارە ئەحمـەد بەئۆتۆمبێلـی براکـەی هاتـە دوای و دوای مۆڵـەت وەرگرتـن لەخاتـوو هاجـەرەی دایکـی، ڕەنـج وەڕێ کـەوت لەگەڵیـدا.

---

٣٥٠- تەراتێن: هاتووچۆ بە هەڕاکردن.

ڕەنج لەوێدا دەیڕوانی وا هەندێ کەس بەکالە و جلی وەرزشیەوە ڕادەکەن و بای باڵیان دەدەن، چون ئەو دەمێ بوو ڕای نەکردبوو حەزی لەم کارە بوو.

+ چی دەڵێی ئەحمەد ئێمەش ڕابکەین، چێژێکی نایابی هەیە لێرەدا.

- چییە، مەگەر دەتەوێ خاتوو هاجەرەی دایکتم لێ هار بکەی؟ تۆ یەشتا بەقاچی شەلەوە ڕێ دەکەی بابە.

+ نا ئەحمەد قاچم زۆر باشە، دواتر ئێمە بەهەڕوەلە دەڕۆین نە بەخێرایی، گەر نایەی جێت دەهێڵم ها.

- بەخوا تاقەتی ئەم بەزمەم نییە، دەی بڕۆ وەلێ هەر چشتێکت لێهات لای دایکت نەیکەیتە خەتای من.

ڕەنج دەستی بەهەڕوەلە کرد، کەش و هەواکەی هێندە پێ خۆش بوو ئەو دەمەی ڕێی دەکرد چاوەکانی نووقاندبوون و وای دەزانی گوزەر بەنێو ستێراندا دەکا.

لەپڕدا هەر هێندەی زانی خۆی بەکەسێکدا کێشا و بەسەریدا بەربوویەوە، کەسەیری کرد تازە لاوێ بوو، تەمەنی هەر هێندەی خۆی دەبوو.

- هێی کاکە، مەگەر کوێری؟ بۆچی بەهۆشیاریەوە ڕێ ناکەی، خەریک بوو بمکوژی.

+ داوای لێبوردن دەکەم لەم کارە، وەلێ تۆزێ بەڕێزەوە بدوێی چاکترە بۆت.

- من بێ ڕێزم ! باشە تۆ کێت پێ دەڵێن ئاوا خۆت بەخەڵکدا دەکێشی و بەبێ ڕێزیش لەقەڵەمیان دەدەی؟

+ من هەرکەسێ بم، تۆ کێت پێ دەڵێن کەداوای لێبوردنی کەسانی دی قەبووڵ ناکەی؟

- من (ئارا) م پێ دەڵێن. باشترە لاچی لەبەر دەمم چاو سەوز تا پاسارم[٣٥١] نەداوی. مرۆیەکی شەڕکەر نییم و تووشی کارێکی وەهام مەکە.

ئەم دوو لاوە دەستیان نایە یەخەی یەکدی، وەلێ نە ئارا دەیتوانی بۆکزێ بوەشێنێ نە ڕەنج، هەرچی دەیان گوت هەر دەمە دەم بوو و هیچی دی.

لەپڕدا ئەحمەد پەیدابوو، دەستی لەیەخەی یەکدی کردنەوەو هاتە گۆ: دوور کەونەوە برا دەی دەی زیاتر، ئەمە چیتانە پاڵەوانینە؟ کەس نەماوە ئێوە

---

٣٥١- پاساردان: داخی دڵ ڕشتن بەکەسێ.

تێـک هەڵغـژاون[٣٥٢]؟ تـۆش چـاوڕەش کەسـت نەدۆزیـەوە ئێمـە نەبـێ؟ بەخـوا چەنـدی تێتـان دەڕوانـم یەکتـان بەعەمەلـی شـەڕ نایـەن.

ئەحمـەد دەسـتی ڕەنجی گرت و لەگـەڵ خۆیدا بردی بۆ کافتریاکە. ئەمـە کۆتا تووڕەبوونی ئـەم گەنجانە بـوو، هەرچەندە دواتر گەلێ پەژیوان بوونـەوە لەم کردارەیان.

- چییـە ڕەنـج؟ وەرزش دەکـەی یـان شـەڕ؟ تـۆم قـەت نـەدی بـوو دەسـت لەیەخـەی کەسـێ بنێـی، لەڕاسـتیدا زۆرم پێکەنیـن هـات.

+ خۆشـم نازانـم، قـەت مـن ئـاوا تـووڕە نەبـووم. کارەکـە خەتـای مـن بـوو کـە بەبـێ ئـاگاداری خـۆم بەسـەریدا کەوتـم، لـێ ئـەو تـۆزێ بەبـێ ڕێـزی دوا، لـەوە دەچـێ چشـتێ زۆر وەڕەز و تـووڕەی کردبـێ، ئەینـا لەکەسـێکی خـراپ نەدەچـوو، ئـەرێ تـۆ ئـەم پێکەنینـەت لـە چییـە؟

- بەوە پێدەکەنم کە کارێ هی خۆت نەبێ نەیکەی چاکە. سوێند بەخوا نەئەو زانی بووی یەخەی تۆ بگرێ نە تۆش. دەتگوت خۆشەویستی لەگەڵ یەکتری دەگۆڕنەوە، ئا ئا خەریک بوون قەمیسی یەکدیتان دەتەکاند تا غوباری پێوە نەمێنێ. بەخوا هەر بۆ ئەوە چاکە بەدوای دا بچی و بیکەی بەهاوڕێت، شوکر خوایە هاوشێوەی ڕەنجم دۆزیەوە.

+ دە بەسـە ئەحمـەد تـۆش، خەریـک بـوو تووشـی شـەڕێ بێـم و ئەتـۆش لەشـۆخیەکانی خۆت ناکـەوی.

- ئـەرێ دەمێکـە لێـرە ڕوونیشـتووین خـۆ کـەس ناڵـێ چـی دەخـۆن، وا دەڕۆم بیبسـی و نەستەلە دێنم، دەزانـم وازت لـەم بابەتانەیـە.

ئەحمـەد بـەدوو شووشـە بیبسـی و پێنـج شـەش دانـە نەسـتەلەوە گەڕایـەوەو بـەدەم خواردنـەوە کەوتنـە گـۆ.

- قەرارە لەگەڵ حەبیبە چی بکەیتەوە، هەر ئاوا لێی دەگەڕێی؟

+ دەتـەوێ چـی بکـەم؟ دوورو نزیـک هەسـتی بەمـن کـردووە، لەئێسـتادا ئەوەنـدە بەسـە. نامـەوێ ئـەم عیشـقە بـەرەو ڕێـگای چـەوت و لار ببـەم. نەفـس و ئـارەزووم دەیانـەوێ هەمـوو ڕۆژێ تێـی بڕوانـم و لەمـەڕ دڵداریـەوە لەگەڵیدا بدوێـم، لـێ ئـەم نەفسـە دەخەمـە ژێـر پام. ڕۆژێـک لەڕێـی کەسـێکەوە خەبـەری پـێ دەدەم و دەڵێـم کـە

---

٣٥٢- تێک هەڵغژان: شەڕکردن.

چاوەنـوورِم بـێ تـا ئـەو دەمـەی دەگونجـێ بچمـە داوای.

ئـەوە چاتـرە لـەوەی مووددێکـی زۆر لەگـەڵ یـەک بدوێیـن و دواتـر وەڕەز بیـن و پەنـا بـۆ دابـڕان ببەیـن، بـا ئـەم دوانـە بـۆ ڕۆژی ویسـاڵ بـێ.

ئەحمـەد مـن هەرگیـز ئەوانـە بەعاشـق نازانـم کـە تابەیانـی گۆتـە گۆتیانـە لـە تـۆڕە کۆمەڵایەتیـەکان. ئـەوان چووزانـن ئێشـی دووری و چێـژی ویسـاڵ کامەیـە. ئەگـەر هی ئـەوان عیشـق بوایـە دەبـوا بـەرەو ڕێـگای چاکـەی بردبـان و خـودای پـێ ناسـاندبان، دەبـوا جەسـتەی تواندبانـەوە و بەگۆشـت و خوێنێکـی دیکـە گۆشـی کردبـان.

ئـەو دەمـەی لەمەجنونیـان دەپرسـی تۆکێـی؟ دەیگـوت لەیـلام، دەیـان گـوت بـۆ کـوێ دەچـی؟ دەیگـوت لەیـلا. لەهەرچـی چشـتی دیکەیـە جگـە لـە لەیـلا خاڵـی ببوویـەوە و تەنـێ ئـەوی دەبینـی. خۆشەویسـتی ئـەو کوێـری کردبـوو لەبینینـی کەسـانی دی و کـەڕی کردبـوو لەئاسـت لۆمـەی لۆمـەکاران. خـودا ناسـانیش بەرامبـەر عیشـقی خـودا هـەر بـەم چەشـنە بـوون. ئـا ئەمـە عیشـقە ئەحمـەد، ئەمـە عیشـقە، کـورە ئێمـە کـەی عاشـقین، ئەسـڵەن کـەی دەزانیـن عیشـق چـی یـە؟.

- باشە ئەی ئازار ناچێژی بەدووری لێی؟ بە نەدوان لەگەڵی؟

+ بەڵـێ، بەڵـێ، دووری لەهەنـدێ کـەس و نـەدوان لەگەڵـی خـۆی جۆرێکـە لەمردنـی مەعنـەوی، وەلـێ سـەیرکە، گـەر یوسـفی نـازدار هـەر لەکەنعـان بوایـە لەگـەڵ باوکـی ئـەوا ئـەو ئەمیـری و گەورەییـەی دەسـت نەدەکـەوت. گـەر حەبیبـە هـەر لەبـەر چـاوی نالـی بووایـە ئـەم هەمـوو هۆنـراوە جوانـە لەسـەر دەردو ئـازاری دووری لەدایـک نەدەبـوون و بەشـێ لەئەدەبـی گەلەکەمـان دەفەوتـا. گـەر عەنبـەر خاتـوون کۆچـی نەکردبـا بـۆ دونیایەکـەی دی ئـەم هەمـوو لاواندنـەوە شـیعری و ئـاوازە قەشـەنگانەمان لـە مەولـەوی نەدەبینـی، کەفەرمـووی:

نــەیچی وەبێ بەزم یـارانی جانی
کام سەفا مەندەن پەی زیندەگانی

کاکی نەی لێدەر تۆ بڵێی بەبێ ڕابواردن لەگەڵ یاران چ خۆشیەک لەم ژینەدا هەبێ.

گـەر دەبینـی ئـەو ئالەتـی (نایـە) پارچـە دارێکـی بچووکـە و ئـەو ئـاوازە دڵڕفێـن و حەزینـەی لـێ دەردەچـێ، گـەر بێـت و لەئەسـڵەکەی جیامـان نەکردبـاوە و هـەر

بەدارەکـەوە بـاو نەمـان قرتاندبـا لەکـویێ دەمـان توانـی ئـەم ئـاوازە دەسـت خەیـن.

بۆیـە دڵنیابـە ئـەم شـەوق و هەسـتەی لـەدووری یارانـەوە دەسـتت دەکـەوێ و تامـەزرۆ دەبـی بـۆ یەک بینیـن و گفتوگۆیەکی کەم و دڵت گڕ دەگرێ، لەم سـووتانەوە چشـتانێکت دەسـت دەکـەوێ کەهەرگیـز لەحاڵەتـی پێک گەیشـتن و ویسـاڵدا درکت پێیـان نەدەکرد.

جودایـی پێـت دەڵـێ تامـی بەیـەک گەیشـتن کامەیـە، گـەر مانـگ لـەزەوی جیـا نەبوایەتـەوە لەکـوێ ئـەم شـەوق و ڕووناکیـەی وەدەسـت دەکـەوت.

- کاشکی هەمووان وەکو تۆ لەعیشقیان دەڕوانی ڕەنج... کاشکی.

ئـەو ڕۆژە تـا زەردەپـەڕ[٣٥٣] لەگـەڵ ئەحمەد لەمـەڕ عیشـقدا دوان و کاتێکی چێژبەخشـیان وەڕێ کرد.

دوای ئـەوەی ڕەنـج گەڕایـەوە ماڵـێ، شـەوێ دەفتەرەکـەی لەژێـر چارپاکـە[٣٥٤] دەرکـرد و دەسـتی بەخوێندنـەوە کـردەوە.

---

٣٥٣- زەردەپەڕ: کاتی خۆر ئاوابوون.

٣٥٤- چارپا: قەرەوێڵە.



## بنچینەی ڕێگای تەسەوف

ڕۆژی هەینی مەولەوی لەگەڵ فەقێکان خەریکی ڕێک خستنەوەو پاک کردنەوەی حوجرە بوون، لەپڕدا بیری کەوتەوە کەبۆ مەجلیسی شێخ دوا کەوتووە، بۆیە کارەکانی بەخێرایی بەجێ هێنان و هەر بەجلە تۆزاویەکانەوە بۆی دەرچوو.

وای خەیاڵ دەکرد کەئیمڕۆ لەدواوە ڕووبنیشم، نەبادا جەنابی شێخ بەم جلە تۆزاویانەوە بۆم بڕوانێ. وەلێ ئەو دەمەی گەیشت شێخ جەلالەدین بانگی کردو لەنزیک خۆی ڕوویینیشاند.

ئەو هەمیشە گرنگی بەمەولەوی دەدا و بازێ جار دەیبردە کتێبخانەکەو بەتەنیا بۆی دەدوا.

+ ببوورن قوربان، ئیمڕۆ هەندێ کارم کردووە و تۆزاویم.

- بەهەر جلێ دێی وەرە، تەنها لازمە ژوورەوە پاڵفتە بێ.

ئینجا جەنابی شێخ ڕووی لەخەڵکی کردو هاتەوە گۆ: پێشەوا (نەواوی) دەفەرموێ بنچینەکانی ڕێگای تەسەوف پێنجن، یەکەمیان: تەقوای خودایە لەنهێنی و ئاشکرادا. ئەو دەمەی بەتەنهای و ئەو دەمەی لەنێو خەڵکی هەست بکەی کە خودا چاودێرە

بەسەرتەوە و لەکردارەکانت دەڕوانێ و لێی بترسەو خۆت بپارێزە لەحەڕام.

دووەمیان: شوێن کەوتنی ڕێبازو سوننەتی خۆشەویستمانە لەگوفتارو کرداردا. هەرکەسێ داوای سۆفی بوونی کرد تێی بڕوانن کەچەندە شوێن سوننەتی پەیامبەر کەوتووە، چون شوێنکەوتنی ئەو شوێنکەوتنی خودایە، بەمە دەتوانن چاکی و خراپیەکەی بپێون. شێخی گەیلانی ڕەحمەتی لێبێ دەفەرموێ ( حەقیقەت بەبێ شایەدی شەریعەت زەندەقەیە). واوەیلا بۆ کەسێ خۆی بەسۆفی و پیاوی خودا لەقەڵەم بداو تانە لەشەریعەت بداو شوێنی نەکەوێ.

سێیەمیان: پشت کردنە دروستکراوەکان و بێ نیاز بوون لێیان لە ڕووبەڕوو و پاشەملەدا.

کێشە ئەوەیە ئێمە مەیلمان بەلای مرۆڤانە بۆیە هەمیشە هەست بەتەنیایی و غەمباری دەکەین. نەمان توانیوە خۆمان لەم جەسەدە دەربازکەین، یەشتا هەر داخوازی ماددەین و دروستکەرمان لەیاد کردووە.

پشت بەهەر مرۆڤێ ببەستی بۆ دڵخۆشبوون و پڕکردنەوەی تەنیاییەکەت ئەوا دەدۆڕێی، چون مرۆڤ ناتوانێ ئەم بۆشاییە ڕۆحیەت بۆ پڕکاتەوە، شتی ڕۆحی بەماددە پڕ نابێتەوە. هەرگیز هەموو ئەو کاتانەی تۆ ئەوت دەوێ لەلات نابێ، تەنانەت ناتوانێ لەحاڵی دڵت بگا.

گەر چاوەنووڕی ئەوەبی چارەگی ئەو خۆشەویستیەشت دەست کەوێتەوە لێیان کەتۆ پێیانت بەخشیوە ئەوا خەڵەفاوی، چون ئەوە تۆی بیر لەوان دەکەیەوەو خۆشت گەرەکن نەک ئەوان. مەرج نییە ئەوان تۆ بەخۆشەویست بزانن، گەرچی لەدەربڕینیش وا بڵێن، چ کەس وەک تۆ بیر ناکاتەوە. بزانە کە چاوەنووڕی خۆشەویستی لەهەر کەسێ بکەی جگە لەخودا دەبێ ئازار بچێژی.

گەر گەرەکتە لەخۆشی دابی و هەست بەئازار نەکەی ئەوا سەیری مەعشوقی حەقیقی بکە، چون ئەو کاتەی مرۆڤ لەمەعشوقی دەڕوانێ بەڵاو ئازارەکان بوونیان نامێنێ. مەگەر نەتان ژنەوتووە ئافرەتانی میسر بەسەیرکردنی (یوسف)ی نازدار سەلامی خوای لێبێ، هەستیان بەئێشی دەست بڕین نەکرد؟ دەی لەمەعشوق بڕوانە و بەڵاکان وەلا بنێ.

چوارەمیان: ڕازی بوون لەخودای گەورە لە کەم و زۆردا.

تۆ میوانـی لێرەو میوانیش دەبێ ڕازی بێ بەو بەشـەی خاوەن ماڵ دەیهێنێتە بەر دەسـتی.

پێنجەمیـان: گەڕانـەوە بـۆلای خـودا لەخۆشـی و ناخۆشـیدا. لەکاتـی خۆشـیدا سـوپاس گـوزار بـەو لەناخۆشـیدا ئارامگـر.

ئـەی موریـد... تووڕەبـوون و دڵگـران بوونـی تـۆ بـا سـەرچاوەکەی خۆشەویسـتی بـێ. گـەر ڕۆژێ لەکەسێ تووڕەبووی چـون هەڵەیەکـی لەگـەڵ کـردووی ئـەوا بزانـە یەشـتا لەمـرۆڤ بـوون نەگەیشـتووی. وەلـێ گـەر گرژبوونەکانـت لەبـەر خاتـری خـوداو بـۆ چـاک کردنـی ئـەوان بـێ ئـەوا ناکـرێ نـاوی لـێ بـنرێ تووڕەبـوون، بەڵکـو ئـەوە خـودی خۆشەویسـتیە لەبەرگێکـی دیکـە.

زەردەکەنـی بـەرەو ڕووی ئەوانـە بکـە کـە خۆشـیان ناوێـی، بەدیاریەکانـت دڵیـان ڕاگـرە، چـون ئەوانـی دی بەبـێ زەردەکەنـی و دیاریـش تۆیـان دەوێ.

ئیمـڕۆ کارەکان ئـاوەژوو بوونەتـەوە. پێـت سـەیر نەبـێ ئـەو دەمـەی چەپڵـە بـۆ نـەزان لـێ دەدرێ و ئـەو دەمـەی درۆ دەبێتـە کارێکـی ئاسـایی و ئـەو دەمـەی پەیمانـەکان دەشـکێن و خۆشەویسـتان تووشـی فیـڕاق و جودایـی دێـن.

ئـەو دەمـەی وەفـا لای مرۆڤـەکان دەبـێ بەخەیـاڵ، عیشـق تەنهـا دەبـێ بەنـاو، بـە بـرا نـاوی یـەک دێنـن و یەکتریـش دەپوکێننـەوە.

ئـەو دەمـەی کۆرپـەی تـازە لەبری گریـان قاقـا دەکا، ئـەو دەمـەی تـازە لاوان بـێ هـۆش کـران بەمـاددەی ڕەق، بەبـێ ئـەوەی تامـی ئـاوی تـرێ بکـەن.

ئـەو دەمـەی لەگـەڵ یـەک بوویـن و ئـاگاداری حاڵی یـەک نەبوویـن و ئـازاری یەکدیان هەڵنەگـرت. ئـەو دەمـەی ئـازارت نەچەشـت بەئێشـی مرۆڤێـک بگـرە گیاندارێـک. ئـەو دەمـەی ڕەنگـەکان ئەرخەوانـی بـوون و کـڕۆک بەتـاڵ.

ئـەو دەمـەی گـەڕان و سـەفەر چ تامێکیـان تێـدا نەمـا. ئـەو دەمـەی کەسێ نەبـوو بۆنی گوڵـەکان بـکا، کتێبـەکان تـوڕدران و خـۆڵ سـەری گرتـن. ئـەو دەمـەی کـەس عاشـق نەبـوو، تـۆ جودابـە، تـۆ جودابـە، تـۆ جودابـە، پێچەوانـەی هـەر هەموویـان بیـر بکـەوە.

بزانـە.. نەتـۆ ئیهامـی عومـەری نـە گوێگرەکەشـت ئـەو گوێگـرەی سـەردەمی ئـەوە، بۆیـە ئـەو حەقـەی دەیگەیەنـی بەنەرمـی و سـۆزو خۆشەویسـتیەوە بیگەیەنـە.

گەر هەموو جیهانیش لەدەورەت بێ هەر تەنهای، مەگەر دەتەوێ بەمرۆڤێک تەنهاییەکەت پڕکەیتەوە ! ئەوەی سۆزی عیشق چووبێتە دەروونی بەدیداری (ئەو) نەبێ چ دیداری دیکە بۆ ئەو کەلکیان نییە. دیداری ئەویش بەکۆشش و ئازار نەبێ وەدەست نایە.

گەر کەسێ جارێ لێتی پرسی و تۆی لەلا بایەخدار بوو، چەندین جار لێی بپرسەوە. خۆ گەر ئەو باڵی یارمەتی بۆ ڕاخستی تۆ باڵی خۆشەویستی بۆ ڕاخە، وەلێ مەیخە دڵتەوە با دڵەکەت تەنیا جێگای مەولای حەق بێ.

باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە، ئەو کەم و کوڕیانەی تۆ لەخۆتیان نابینی ئەو دەیان بینێ.

هەمیشە براکانت لەخۆت بەچاکترو پاکتر بگرە و فەزڵیان بدە بەسەر خۆتدا. ئەم ڕێگایە جێگای مرۆڤی بەخیل و بەفیزی تیا نابێتەوە.

بازێ جار دەبێ داوای لێبوردن بکەین لەوانەی هەڵەیان بەرامبەر کردووین.

سەیری ئەو دایکە بکە چۆن لەسەر هەڵەو لاساری لەمنداڵەکەی دەدا. ئایا تۆ بڵێی قینی لەمنداڵەکەی هەبێ؟ یان تۆ بڵێی وازی لێبێ مناڵەکەی لەنێو ئازاردا بێ؟

بێگومان خۆت وەڵامەکەی دەزانی کە بەهەموو جیهانی ناگۆڕێتەوە، وەلێ ئەمە لێدانی خۆشەویستیە، بیرت نەچێ (لێدانی خۆشەویستی).

تەسەوف بریتیە لە (ئیحسان)، ئەو ئیحسانەی خۆشەویستمان پێناسەی دەکاو دەفەرموێ بەشێوازێک خودا بپەرستی وەکو ئەوەی دەیبینی و لەبەر چاوانتە، خۆ گەر تۆش ئەو نابینی گومانی تیا نییە ئەو دەتبینێ.

وشەی سۆفی لە (سەفاوە) هاتووە، بەمانای (پاکی دڵ). ئەو دەمەی پیاوێک دەڵێتە پێشەوا بایەزید شوێنێکی خاوێنم پێ بێژە نوێژی تیا بکەم، ئەویش پێی دەفەرموێ دڵت پاک کەرەوە و لەکوێ نوێژ دەکەی بیکە.

ئەسڵ پاک بوونی دڵەو ئەندامەکانی تر فەرمان بەرداری ئەون، کەوایە تەوبە بکە بەر لەوەی دڵت ڕەش دابگەڕێ بە گوناه..

شێخی گەیلانی فەرمووی ( دڵ باڵندەیەکە لەقەفەسێکی چێ کراودا، هەروەک دوڕێک لەسندووقێک، وەک زێڕو پارە لەگەنجینەیەکدا دانراوە. گرنگی لەباڵندەکە دایە نەک قەفەسەکە، لە دوڕەکە دایە نەک سندووقەکە، لەماڵەکە دایە نەک لە گەنجینەکە ).

تۆ توێکڵەکە دەڕازێنیەوە و وازت لە ئەسڵەکە هێناوە !

سیراجی مەولەوی لەگەڵ هەر کۆڕێکی شێخدا زێدەتر دونیای لا بچووک دەبوویەوە و بەرەو جیهانی مانا هەنگاوی دەنا. لە توێکڵەوە بەرەو کرۆک، لەدونیا ویستی بەرەو پەسڵان ویستی، لە خود ویستی بەرەو خودا ویستی، لە (من) ەوە بۆ (ئەو).

لەقۆناغی چواری کۆلێژدا، ڕۆژێ لەسەربانی حوجرە خەریکی موتاڵای وانەکان بوو، لەگەڵ فەقێیەکی دیکەی هاوڕێی بەنێوی (یوسف)، کە مرۆیەکی بەدەم و دوو[٣٥٥] بوو.

لەو دەمەیدا (ڕویا) و برا بچووکەکەی (موحەممەد)، بەبەردەمی حوجرەکەدا ڕابوردن. مەولەوی خەریک بوو لە موحەممەد ڕامابوو، فەقێ یوسف کەحەزی لەشۆخی بوو هاتە گۆ:

- ئەوە چی یە قوربان؟ دەبینم لەم کچە ڕاماوی خێرە !

+ لەو ڕانەماوم برا، سەیری برا بچووکەکەیم دەکرد کە قوتابی خۆمە.

- نا نا مامۆستا، گەر بە دیەی خۆم نەمدیبا بڕواییم نەدەهات تۆ لەکچان ڕابمێنی. ئاوا سانا لەسەرت تێناپەڕێ ئەم باسە.

+ چییە مەلا یوسف، دەڵێی کەس نەماوە پێیەوە بگری من نەبێ. من و سەیری کچان کووجا مەڕحەبا.

- دەی باشە پاکانە بۆخۆت مەکە، وەلێ کاکە گەر کچەت دەوێ بڕۆ داوای، لەبانی حوجرە تووشی کێشەمان مەکە. هەر بەڕاست مەولەوی بۆچی ناچیتە داوای مادام دەیان ناسی و براکەیشی فێرخوازی خۆتە؟

+ کاکە گەر بۆ شۆخی هاتوویت بڕۆ خوارێ، بەخوا من لەگەڵ تۆدا دەرناچم.

- دەی گاڵتە دەکەم بابە، دەزانم ئەم بێ لەچکانە بۆ تۆ ناشێن، تۆ مومکینە بەدوای نیقاب و چشتدا بگەڕێی. خۆ گەر دوو شۆخی وا نەکەین ڕۆژی درێژمان لێ ناڕوا.

---

٣٥٥- بە دەم و دوو: قسەزان و قسەخۆش.

+ ئەها دەرت خست خۆت تێت ڕوانیوە، ئەینا چۆنت زانی بێ لەچکە. دواتر چی تیایە بچمە داوای، گەر بچم لەڕێگای شەرع و لەدەرگاوە دەچم. هەرگیز جل مەکە پێوەر بۆ ناسینی مرۆڤ، لەوەیە ئەوە زۆر پاکتربێ لەکەسێکی لەچک لەسەر، وەلێ دڵسۆزێ نەبووە فێری بکاو تێی گەیەنێ.

- ئەهای بەخوا کردیە ڕاستی، کورە وەڵا پێم خۆشە، پیرۆزە برا، کەی شیرینیەکە دەخۆین؟

+ مەلا یوسف واز لەشۆخی بێنە، هەر بەڕاستی چشتێ لەدەروونمدا پێم دەڵێ برۆمە داوای ئەم کچە. بەخوا نە بینیومە و نە دەشیناسم، نازانم چ حاڵێکە !

- هەرچەندە سەر لەو حاڵەی تۆ دەرناکەم برا، ئێوە هۆنەرو ئەهلی دڵن، وەلێ کەیف سازم بە وەها بڕیاردانێکت. بەڵێ مەولەوی دوور لەهەموو شۆخیەک دڵنیام ئەوەی تۆ پەنجەی دەخەیتە سەر بەبەختە. ئەو دەمەی هاتە لاتان دەتوانن کاریگەری لەسەر دروست کەن و جلەکەش چارەسەر دەبێ، گەر ژوورەوەی پاڵفتە بێ.



## دڵی بردم بەشۆخی دولبەرێکی تازە سەر لەنوێ[356]

مەولەوی کە قەراری دابوو چی دیکە سینەی نەکاتە مەنزڵی مرۆیان، وەلێ بەبێ ویستی خۆی دولبەرێکی دیکە خۆی تێ هاوێشت. ئەمما ئەوەیان نە دەیزانی چ کەسە و نە دەیزانی خاوەنی چ تەشکێکە،[357] کە ئەمەش تەواو دڕدۆنگی[358] کردبوو.

هەر ئەم شەوە چوویە دەرێ و بڕیاری دا لەم شۆخە نادیارە بکۆڵێتەوە، چون هەرگیز ناکرێ قەراری چوونە داوای کەسێ بدەی و هیچی دەربارە نەزانی.

ئەو هەمیشە جودا لەفەقێکانی دی جار جار جامانەکەی دادەنا و دەچوویە دەرو تێکەڵی خەڵکانی دی دەبوو، پەیوەندی لەگەڵ دەبەستن و ئامۆژگاری تازە لاوانی دەکرد. ئەمەش وای کردبوو گەنجان خۆشیان گەرەک بێ، وە هەمیشە لەگەڵ پڕۆگرامی حوجرەدا پەرتووکی دیکەشی دەخوێندەوە و شارەزابوو لەبیروڕاو بابەتەنا ئاینیەکانیش.

---

٣٥٦- نیوە دێڕێکی (مەحوی) یە ڕەحمەتی خوای لێبێ.

٣٥٧- تەشک: بیچم ، ڕوخسار.

٣٥٨- دڕدۆنگ: دوودڵ.

مامۆستا عومەریش ڕێگەی چوونە دەری لێ نەدەگرت، چون دەیزانی چ مرۆیەکە.

ئـەو شـەوە سـێ گەنجی نیشـان کـرد بـۆ لێپرسـین، کـە لەوانـە بـوون ئاگاهیـان بەحاڵـی گـەڕەک هەبـوو، سەروسـەکوتی کچانیـان چـاک دەناسـی، خـوا نەکـردە کچـێ لـەم گەڕەکـە تووشـی هەڵەیـەک بووبـا نێـوی دەکەوتـە زاران.

شـوکر بـۆ خـوا هەمـوو بەچاکـی لەمـەڕ (ڕویـا) وە دوان، کـە کچێکـی قەشـەنگ و خـاوەن ئەدەبێکـی بـەرزە، سـەر بـۆ کـەس بـەرزەوە نـاکا. وەلـێ ئـەوە هەیـە وەکـو گەنجانـی دیکـە وازی بەجلـی مۆدێلاویـە، کەئەمـەش کێشـەیەک چـێ نـاکا، چـون گەر نـاوەڕۆک بـاش بـوو وردە وردە توێکڵەکـەش قایـم دەبـێ. کێشـە لـە توێکڵـی ئەسـتوور و ناوەڕۆکـی پـووچ دایـە.

ئـەو دەمـەی گەڕایـەوە حوجـرە فەقـێ یوسـف دەسـتی گـرت و بردیـە بـەر بێڵاییەکـە[359] و لەگەڵی کەوتەوە گۆ.

- چیت کرد مەولەوی برا، خۆمان ئامادەکەین بۆ شیرینی یان نا؟

+ شوکر بۆ خوا خەڵکی ستایشی دەکەن، وەلێ چەند کێشەیەک لێرەدا هەس.

- بێژە بزانم چی یە؟

+ یەکـەم: لەئێسـتادا مـن توانـای هاوسـەرگیریم نییـە تـا سـاڵێکی دی کۆلێـژ بەکۆتـا دەگەیەنـم و خـوا بـکا لەجێگایـەک دابمەزرێـم. دووهـەم: ئـەم کچـە لـەڕووی تەمەنـەوە لەمـن چووکـترە، لەقۆناغـی ئامادەیـی دایـەو قوڕسـە لەبـەر خوێندنەکـەی ئـاوا زوو دەسـتی لـێ هەڵگـرن، لەکاتێکـدا مـن چـواری کۆلێـژم، ئەمـەش بەربەسـتێکەو ئـەوان دەتوانـن بیکـەن بەبەهانـە لێـم. سـێهەم: ئـەم بنەماڵەیـە لـەوە نییـە زۆر پابەنـد بـن بەبابەتـە ئاینیەکانـەوە، لەکاتێکـدا مـن موودێکـی دیکـە مۆڵەتـی مەلایـی وەردەگـرم و مێـزەر دەخەمـە سـەر.

چـوارەم: ئـەوان خێزانێکـی بچـووک و شـارین، بیرکردنـەوەو تێڕوانینیـان گەلـێ لەئێمەی لادێیـی جودایە. من شـارەزایی باشـم لێیان نییـە و لەوەیە لەهیچ شـتێکدا یەکانگیر نەبین.

٣٥٩- بەر بێڵایی: بەر هەیوان.

پێنجەم: ئەو کچێکی خەرامانە[360] و چاوی زۆر لەسەرن، هیچ چشتێک ناچاری ناکا کە شوو بەمەلا و شاعیرێکی دڵ سووتاوی وەکو من بکا.

مەگەر ئەمانە هەمووی بەربەست نیین مەلا گیان ها؟

- وای وای، (خودا چین ئەم هەموو دێوە لەدەوری ئەم پەری شێوە )،[361] مەولەوی برا گوتەکانت جوانن، ئەمانەی دەیڵێی کێشەی چووکن چووک، چون جارێک لەزاری خۆتەوە ژنەوتم کە لەعیشقدا بەربەستێک بوونی نییە، مەگەر بیرت چۆتەوە ها، بیرت چۆتەوە؟

+ بیرمە مەلا گیان بیرمە، وەلێ ئەمە جارێ نەگەشتۆتە پلەی عیشق.

- دەی هیچ نەبێ جارێک بۆی بڕوانە، خۆ تۆ نیازی هاوسەرگیریت هەیە.

+ ناتوانم بۆی بڕوانم، من کەسێکی سالیکم و تازە خۆم لەنێو مەقامەکانی تەسەوفدا بینیوەتەوە و هەنگاوێکم ناوە بۆلای حەق. ناکرێ ئەم خۆشەویستیەی ڕۆح ئافراندوویەتی تێکەڵی مادده و بینینی بکەم، چون بینین پاڵنەری خۆشەویستیە بەرەو عیشق، عیشقیش کوژەرێکی هێمنە و سەرەنجام دەتسووتێنێ، مەگەر سەمەندەل[362] بی برا.

- دەتوانی لەڕێگای براکەیەوە هەندێ زانیاری دەربارەیان دەست خەی و ئەمەش نەنگیەکی تیا نییە. وەلێ تۆ دڵنیای ئەمانە لەڕووی ئاینەوە کزن؟ دەی چۆن کوڕەکەی خۆیان ناردۆتە لات بۆ قوڕئان خوێندن؟

سیڕاج بەشۆخیەوە هاتە گۆ: وەڵاهی مەلا یوسف بڵێم چی، من گەلێ جار لەبانەوە دەڕوانم براکەی دەچێتە دوکان و کێک و شیری لەدەستە، لەوەیە هەر بەکێک و شیر گەورە کرابن و جەماعەتی ئەو بابەتانە بن.

ئیتر هەردووکیان قاقا دایگرتن و تریقانەوە[363] لەخۆشیان، بەچەشنێ فەقێکانی دیکەش هاتنە ڕووانینیان و لەگەڵیان دەتریقانەوە بەبێ ئەوەی بزانن چ باسە.

---

٣٦٠- خەرامان: ئافرەتی شەنگ و شۆخ.

٣٦١- نیوە دێڕێکی (مەحوی) یە ڕەحمەتی خوای لێبێ.

٣٦٢- سەمەندەل: باڵندەیەکە بەگڕ ناسووتێ.

٣٦٣- تریقانەوە: پێکەنینی بەدەنگ.

ئیدی هەرکاتێ فەقێ یوسف بەمەولەوی دەگەیشت باسی کێک و شیرەکە دەهاتەوە گۆڕێ و دەبوویەوە بەزم. بەجۆرێ هەموو فەقێکان فێری کێک و شیر خواردن ببوون و هەر ڕۆژەو لەسەر باخەڵی یەکێ سوختەیەکیان[٣٦٤] دەنارده دوکان بۆ کڕینی کێک و شیر. تەنانەت مامۆستا عومەریش لەم باسە دەربازی نەبوو، جار جارە پشکێکیش بۆ ئەو هەنارده دەکرا.

ناوە ناوەش مەولەوی بۆ خۆشی فەقێکان هۆنراوەی بەسەر کێک و شیرەکەدا دەخوێناوەو دەیگوت: تا لەخەمخانەی عیشق دڵ ببێ گیر

دێت و ڕادەبرێ بە دڵما کێک و شیر

مەولەوی نیگەرانی ئەوە بوو ئەم کچە دونیا عیرفانیەکەی لێ تێک بداو پەردەی دڵی بدڕێ، بۆیە دەیهەویست هەرچی زووە بچێتە داوای و خۆی لەم دڕدۆنگیە دەرباز بکا. وەلێ ئەمەش بۆ قوتابیەک سانا نەبوو کە لەبەر خوێندن نەیتوانی بوو هیچ چشتێ پێکەوە بنێ.

لەلایەکی دیکە لەوە دەترسا گەر ئەمەشی وەکو سەناریا لەکیس بچێ گەلێ گوپچڕە جارێکی دی دڵی بەکەسێکی دیکەوە بنووسێ.

شەوێک وەکو هەموو شەوانی دی لەحوجرە هاتبوویە دەرو بەشەقامەکانی شاردا ڕێی دەکرد. دەم دەمێ ویردو دەم دەمێکیش هۆنراوە ناسکەکانی مەحوی بەسەر زاریدا جاری دەبوون.

لەپڕێکدا لەیەکێ لەکۆڵانەکان سەری بەرزەوە کرد، وەلێ چی بینی...! بۆ یەکەم جار چاوی کەوتە سەر چاوانی (ڕویا). لەبەرامبەریدا لەگەڵ موحەممەدی برا بچووکی بەرەو ماڵی نەنکی ڕێیان دەکرد.

ئەو چشتەی لێی دەترسا هاتە دی، بەبێ ویستی خۆی دولبەری بۆ نومایان بوو،[٣٦٥] بۆیە خێرا چاوی داگرتن و بەسرک و تیژیەوە بەرەو حوجرە تێی تەقاند.

هەموو گیانی دەلەرزی، ئەو لەبینین خۆی دەشاردەوە چون دەیزانی بینین چ عیشقێ دەخولقێنێ.

---

٣٦٤- سوختە: ئەو فەقێیەی لەوانەکانی سەرەتایە.

٣٦٥ نومایان: دەرخستن.

ئەو شەوە قەڵەمەکەی گرت و لەگەڵ ڕۆحی (ڕویا) دا دوا:
خۆش بەلەنجەو لار ڕێ دەکەی
دەڵێی دەتەوێ پێم بڵێی
ها بم بینە ئەی ئەو کەسەی
لەخەیاڵت وێنام دەکەی.

ئەی ئەوەی کەوا دەمبینی
لەنێو جیهانی مەعنەوی
وەرە سەیری خەت و خاڵم
ئەگەر تاڵیبی ڕێڕەوی.

نا نا ناکرێ بێمە سەیرت
چون چاوی من
قوەی جەزبی لا نەماوە
هەرچی هێزی بەسەڕ هەیە
لەتاو جوانی پڕ شەوقی تۆ
لەچاوانمدا کوژاوە.

ئاخر منێک کەدائیمەن دێمە دەرێ
کتێبێکی شەیخی مەزن
غەزالیم وا لەنێو دەستن
باس باسی وەرع و تەقوایە
باس لەباسی چاو داخستن.

چۆن دەتوانم لەکاتێکدا
پەڕاوی زەردی غەزالی
لەدەستم بێ سەیرت بکەم
چۆن دەتوانم...
ئەو هەموو زوهدو عیرفانەی
لەنێو ئەو پەڕاوە دایە
ئەمن هەروا توڕی بدەم.

نا نا ناکرێ سەیرت بکەم لەئێستادا
چون تاڵیبی مەعریفەتم
ئەگەرچی کە موددەتێکە
لەگێژاوی ئەوینی تۆ
لەت و پەتم.

تۆ کە جوانی...
مولحەق بە دوڕڕو مەرجانی
ئاشناییت هەس
لەگەڵ لالە، لەگەڵ لاولاو
ئەمما ئەمن....
شاعیرێکی چۆڵ پەرستی
دڵ و دەروون پڕ گلاراو.

چۆن دەتوانم بێمە سەیرت
کە بەم دڵە
لێوان لێوبوو لەخوێنەدا
لەتاڵی بسکانت گیربووم
وەکو گەمیەک کە تێک بشکێ
لەنێو دەریای ڕەش و قولزووم.

دەزانی نایەمە سەیرت
بۆیە وا دێی خەرامانی
دەڵێی هەرچی گوڵی گەردوون
تواوەتەوە بەسەرتا
سەد ئەوەندەی دیکەش جوانی.

مەولـەوی پـتر لەفێرخوازەکانـی دی موحەممـەدی بـرا بچووکـی ڕویـای لا گرنـگ بـوو. هەمیشـە هانـی دەدا بـۆ خوێندنـەوەو نـاوە نـاوە نامیلکـەو دیـاری پـێ دەبەخشـی. ئـەو زووتریـش یەکـێ بـوو لەقوتابیـە ئازیزەکانـی، ئێسـتا کەبابەتێکـی وا لەئارادایـە بەبـێ شـەک ئازیزتـرە.

ڕۆژێ لەدوای وانەکان و چوونەوەی قوتابیەکان، لەگەڵیدا کەوتە گۆ.

+ تۆ وێدەچێ تاقانەبی لەماڵ موحەممەد گیان، وانییە؟

- بەڵـێ مامۆسـتا بـرام نییـن، وەلـێ دوو خوشـکم هـەن ، ڕویـا دوو سـاڵ لەمـن مەزنـترە و دالیـاش سـێ.

+ بۆچی تۆ پۆلی چەند بووی، بیرم نییە؟

- قوربـان ئـەم سـاڵ بوومـە سـێی ناوەنـدی، چەنـد زوو لەیـادت دەچێتـەوە، نەنکیشـم ئاوایـە، هەنـدێ جـار هەمـان پرسـیارم ئاڕاسـتە دەکاتـەوە.

+ دیارە منیش وێنەی نەنکت بەساڵاچووم، بۆیە ئاوا لەیادم دەچێ.

موحەممـەد بەخەنـدەوە: نـا مامۆسـتا، تـۆ یەشـتا تـازە لاوی، تەنیـا لەخێزانێکـت کەمـە. لەوەیـە لەیـاد کردنـت هـی مژوولـی دەرس و ئـەو بابەتانـە بـێ.

مەلا یوسف لەو دیوەوە گوێی لەم باسە بوو، هات و خۆی تێ هەڵقورتاند.

+ ئـا ئـا، ئـەوە چۆنـت زانـی لەخێزانـی کەمـە، دەی کـوڕی بـاش کەسـێکی چـاک بـۆ مامۆسـتاکەت بـدۆزەرەوە، چـی تیایـە؟

مەولـەوی بـەم گوتەیـە سـوور هەڵگـەڕاو سـەیری مـەلا یوسـفی کـردو ویسـتی بێتـە گـۆ، وەلـێ موحەممـەد هەڵـی دایـێ: ئاخـر هەمـوو کەسـێ شـیاوی مامۆسـتا نییـە، دەبـێ مرۆیـەک بـێ لەئاسـتی خۆیـدا.

مـەلا یوسـف هاتـەوە دەنـگ: ئـێ کاکـە ئێمـە کێشـەمان نییـە، بـا لەئاسـتی خۆشـیدا نەبـێ، گرنـگ ئەوەیـە بەیەکـەوە بیکەینـە خاوەنـی مـاڵ.

مەولـەوی هاتـە گـۆ: هەڵسـە موحەممـەد بـڕۆرەوە، ئـەم کابرایـە بـۆ شـۆخی هاتـووە، بەخـوا بەهەردووکـمان بـاری نابەیـن.

- مامۆسـتا بـەر لـەوەی بـڕۆم، دەمـەوێ بڵێـم بەیانـی نایـەم، دەچینـە نـاودۆڵ، زێـدی باپیرانـم، نازانـم چەنـدە دەمێنینـەوە.

مەولەوی بەسەرسامیەوە: بۆچی ئێوە خەڵکی ناودۆڵن؟

- ئەرێ قوربان، وەلێ ئێمە هەر لەشار ژیاوین، باپیرم هی ئەوێیە.

مەولـەوی بـەم گوتەیـە لەجێگاکـەی خـۆی هێدمـە بـوو[٣٦٦] و ڕەق ڕاوەسـتا. دەتگـوت

---

٣٦٦- هێدمە: تاسان ، شۆک.



گوللەیـان پێـوە نـا. دوای ڕۆشـتنی موحەممـەد، مـەلا یوسـف دوانـدی: چـی بـووە بـرا، بۆچـی ئـاوا ڕەق بـووی؟

+ ئـای خودایـە، دووبـارە (نـاودۆڵ)، هەمـان جێـگا، باشـە ئەوانـە چیـان لەگیانـی مـن گەرەکـە، پێـم بێـژە چیـان گەرەکـە؟

- چی بووە مەگەر، دڵمت تەقاند، چ نەنگیەکی تیایە ئەم جێگایە؟

+ مـەلا یوسـف، کاتـی خـۆی دڵـم پەیوەسـتی کەسـێ بـوو خەڵکـی هەمـان جێـگا بـوو، ئەمـە ئـەوی بیـر خسـتمەوە. لـەو شـەوانە لەخـەودا بینیـم، جلێکـی زبـرو چڵکنـی لەبەرابـوو، ڕوخسـارو کاکۆڵێکـی[٣٦٧] تـۆزاوی و زەرد هەڵگـەڕاو، وەکـو ئافرەتـێ کەتـازە هاوژینەکـەی لەدەسـت دابـێ، بـەدوای منـدا وێـڵ بـوو. سـەرەنجام منـی دۆزیـەوە و لەگەڵمـدا دوا، گەلـێ دوایـن، وەلـێ گوتەکانـم بیـر نایـە، ئەوەنـدەم بیـرە کـەزۆرم ڕێـز لێنـا، بەڵـێ زۆرم ڕێـز لێنـا.

مەولـەوی لەکاتـی گۆکردنـدا بەبـێ ئاگایـی خـۆی ئەسرینـی چاوانـی بەسـەر کوڵمیـدا گـوزەری دەکـردو مەحـوی ئاسـا دەیگـوت:

لەگەڵ دەستی مەلا ڕێ ناکەوێ زونناری زوڵفـی یـار
وەکو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چ بکـەم

- باشـە مەولـەوی گیـان، واز لـەم بێتاقەتیـە بێنـە. مـن چشـتێکی سـەیرم دەربـارەت بیسـتووە، گـەر بـۆم پشـت ڕاسـت کەیتـەوە خـراپ نابـێ.

+ بێژە بزانم چی یە؟

- ئاخر خۆ تووڕە نابی؟

+ نا بەخوا تووڕە نابم، بۆچی تووڕەبم.

- دەڵێـن گوایـە یـەک کتێبخانـەی قەبـەت بەدیـاری بـۆ حەمۆکـەی بـرای ئـەم کچـە بـردووە. باشـە مـن دیـەم دەرهـات بـۆ کتێبـێ پێـت نـەدام، تخـوا ئەمـە کارە دەیکـەی؟

مەولەوی ئەسرینی لەچاوان تۆرا و بەقاقاوە گوتی: ئەی خوا بتگرێ، بەخوا یەک دانە کتێبی بچووکم پێی دا، چۆن بوویە کتێبخانە لێم، دەتەوێ ئەمەش بکەیتە بەزمی کێک و شیرەکە. ئیدی هەردوو تریقانەوە[٣٦٨] لەخۆشیان و مەولەویش گریانەکەی لەیاد چوویەوە.

---

٣٦٧- کاکۆڵ: مووی درێژی پێشەسەر.

٣٦٨- تریقانەوە: پێکەنین بەدەنگی بەرز.



## بەرەو باڵابوون و کۆتایی

ڕۆژی هەینی مەولەوی بەرەو کۆڕی شێخ جەلالەدین هەنگاوی هەڵگرتەوە. ئەو دەمەی چوویە ژوورێ دەنگی دەف و شیعر خوێندنەوە ئەو ناوەی تەنی بوو. بازێ لەموریدەکان هاواریان لێ هەڵدەستا و بەکوڵ دەگریان، هێندێکی دی وەکو سەرمەستێ لەدەوری خۆیان دەچەرخان[٣٦٩] و ناوی مەولای حەقیان دێنا.

جەنابی شێخ نزیکی دەرگاکە لەسەر چۆک ڕوونیشتبوو، بەبێ دەنگی ئەسرینەکانی گلێنەی چاوانیان جێ دەهێڵاو بەردەمیان تەڕ دەکرد. مەولەوی لەبەر بێ جێگایی لەلای دەرگاکە وەستاو تێیان ڕامابوو.

دوای تەواو بوونی مەجلیسی سەماعەکەو هەندێ لەقورئان خوێندن، جەنابی شێخ سەری بەرزەوە کردو هاتە گۆ.

- لەدوای کۆچکردنی خۆشەویستمان ڕەهبەرو نێردراوێکی دیکە بوونی نییە، وەلێ دونیا هەرگیز خاڵی نابێ لەجێنشینانی ئەو. خودا لەهەموو سەردەمێکدا چەند جێنشینێک دادەنێ بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵک، ئەوان پیاوچاکان و دۆستانی خودان،

---

٣٦٩- چەرخان: سووڕان.

بیـان دۆزنـەوەو هاوەڵیـان بکـەن. ڕەحمـەت لەوانـەی گوتویانـە هەرکەسـێ مامۆسـتاو ڕێبەرێکـی نەبـێ ڕێبـەری ئـەو شـەیتانە.

هاوەڵـی شـێخێکی زانـا بکـەن تاوەکـو دەسـتتان بگـرێ و بـەرەو خوداتـان ببا. مەڵێ هچ هـۆکارێ ناگرمـە بـەر، خـودا دەیتوانـی بەبـێ پەیامبەرانیـش خەڵکـی ڕێنموونـی بـکا.

شـێخ و گـەورەی ئێمـە پێشـەوا غەزالـی دەفەرمـوێ (ئـەوەی بەبـێ شـارەزا ڕێـگای دەشـت و سـەحراکان بگرێتـە بـەر بێگومـان بـەرەو فەوتـان دەچـێ، وە ئـەو موریـدەی تەنـێ بەخۆیـەوە بـەسراوەو پەیوەنـدی لەگـەڵ هیـچ مورشـیدێک نییـە وەکـو درەختێکە بەخـۆی سـەوز بوویێـت و خێـرا بـەرەو وشـکی دەچـێ، باماوەیەکیـش بمێنێتـەوە و گـەڵاش بـکا، بەرهەمـی نابـێ ).

فێربوونـی هەمـوو زانسـتێک مامۆسـتای گەرەکـە، هیـچ دکتۆرێـک لەڕێـگای کتێـب خوێندنـەوە نەبۆتـە دکتـۆر. بەبـێ ڕێبـەر ناگەیتـە مـراز، هـەر دەبـێ کەسـێک هەبـێ نەخۆشـیەکانی دڵـت دیـاری بـکاو چارەسـەریان بـۆ دابنـێ و پاڵفتـەی بـکا.

وەلـێ ئاگاداربـە کـە کـێ دەکەیتـە ڕێبـەرو مورشـیدت، نەخوێنـدەوار ناتوانـێ دڵـت بخوێنێتـەوە، کوێریـش ناتوانـێ بتهێنێتـە سـەر ڕێـگا.

دەبێ ئەو شێخ و ڕێبەرە ئەهلی قورئان و سوننەت بێ و کردارەکانی موو بە موو ڕێک بێ لەگەڵ سەروەرمان و شارەزای دین بێ، چون تەسەوف بەبێ شەریعەت گومڕاییە.

هەروەهـا شـارەزای ئـەم ڕێـگای تەریقەتـە بـێ و لەلایەنـی کەسـێکی بـەرزەوە مۆڵەتـی درابـێ و دڵ و دەروونـی ڕوونـاک بوویێتـەوە و دکتـۆر بـێ بـۆ نەخۆشـیەکانی دڵـی موریـدو بزانـێ چـۆن چارەسـەریان دەکا.

گـەر کەسـێ ئەمانـەی تیـا نەبـوو ئـەوا شـێخی حەقیقی نییـە و ناتوانـێ پـەروەردەکارت بـێ و پێـت بگەیەنێ.

ئەوانـەی ئیمـڕۆ دەبینـی بـەدوای دونیـاو ئـارەزوون و لەبـەر دەرگای دەسـەڵات داران کەوتـوون، نـە خۆیـان پـەروەردە کـردووە و نـە کەسیشـیان پـێ پـەروەردە دەبـێ، شـێخ نییـن و فریـوت نـەدەن بەنێـوی تەسـەوف و عیرفـان.

گـەر کەسـێ ڕێبەرێکـی دەسـت نەکـەوت بـا زۆر سـەڵاوات بـداو بـە سـوننەتەکان خـۆی لەخـودا نزیـک بکاتـەوە تـا دەبێتـە خۆشەویسـتی خـودا. مەگـەر ئـەو فەرمـوودە

قودسـیەتان نەبیسـتووە کـە پێشـەوا بوخـاری گێڕاویەتیـەوە، خـودا دەفەرمـوێ ( بەندەی مـن ناتوانـێ خـۆی لەمـن نزیـک بکاتـەوە بەچشـتێک کـە خۆشەویسـت تربـێ لـەلام لـە واجبەکانـی. ئـەو بەندەیـە بـەردەوام دەبـێ و بـەرە بـەرە زیاتـر لەمـن نزیـک دەبێتـەوە بەکردنـی سـوننەتەکان هەتاوەکـو خۆشـم دەوێ. ئـەو کاتـەی خۆشـم ویسـت دەبمـە ئـەو گوێیـەی کەپێـی دەژنـەوێ، دەبمـە ئـەو چـاوەی پێـی دەڕوانـێ، ئـەو دەسـتەی هەڵمەتـی پـێ دەبـا، وە ئـەو قاچـەی کەپێـی دەڕوا ) واتـا گشـت هاتووچـوون و دەسـت بـردن و ڕوانیـن و گـوێ گرتنێکـی لەڕەزامەنـدی منـدا دەبـێ.

بەڵـێ ئـەو کاتـەی ئـەو بەندەیـە نزیکی بـارەگای خـودا بـوو، کەراماتـی پـێ دەبەخشرێ. شـتانێکی لەعـادەت بـەدەر لەسـەر دەسـتی ڕوودەدەن کـە خەڵکـی تێیـدا حەیـران و سەرسـام دەبـن.

ئەودەم هەرچی داوا بکا پێی دەبەخشرێ، چون داوای خۆشەویست ڕەت ناکرێتەوە.

خۆشەویسـتهان دەفەرمـوێ لـە سەرناسـی و بەرچـاو ڕوونـی بـاوەڕدار بترسـە، چـون ئـەو بەنـووری خـودا دەڕوانـێ.

گـەر دەتـەوێ وەهـا بـاڵا ببـی، واز لەخەڵـک بێنـەو بـەرەو خـودا بـڕۆ، باسیان مەکـەو چشـتێک مەڵێ کە پەیوەندی پێتەوە نییە. سـەعدی شـیرازی دەفەرموێ شـەوێک لەگەڵ باوکـم هەڵسـام بـۆ شـەونوێژ، بینیم هەمـوو خەڵکـی ڕووناکیەکانیـان خامۆش کـردووە و لەشـیرینی خـەودان. گوتـم باوکـە سـەیرکە چـۆن هەمـوو وەک مـردوو پـاڵ کەوتـوون و هەڵناسـنەوە، باوکـم گوتـی خۆزگـە تـۆش دەخەوتـی و باسـی کەسـت نەدەکرد.

حەزرەتـی بایەزیـد فەرمـووی خـودام لەخـەو بینـی و گوتـم ڕێگـە بـۆلای تـۆو گەیشـتن بەتـۆ چۆنـە؟ فەرمـووی نەفسـت واز لـێ بێنـەو وەرە بـۆ لام.

بە بڕوانامەی مرۆڤەکان هەڵمەخەڵەتێن، خودا فەرمووی ڕێزدارترینتان بەتەقواترینتانە[370].

لە مرۆی حیزبی و سیاسی ڕابکە وەک چۆن لەشێر ڕادەکەی.

لـەدوای ئـەم گوتانـە شـێخ لەکۆڕەکـە هەڵسـاو دەسـتی مەولـەوی گـرت و لەگـەڵ خۆیـدا بـردی بـەرەو ژوورێکـی داخـراو، کلیلەکـەی لەباخەڵـی دەرهێنـاو دەرگاکـەی واڵا کـرد.

٣٧٠- سوورەتی حوجورات ، ئایەتی ١٣.

مەولـەوی ڕوانـی هیـچ کەلوپەلێـک لـەم ژوورەدا بوونـی نییـە، وەلـێ پلیکانەیەکـی تیایـە بـەرەو ژێـر زەمینەکـە دەچـێ. شـێخ هەنـگاوی هەڵگـرت بـەرەو خـوارێ و ئامـاژەی بەمەولـەوی کـرد بـەدوای دابـێ. لەبـەر تاریکـی هیـچ چشـتێ دیـار نەبـوو، ئـەو دەمـەی فانۆسـەکەی داگیرسـاند مەولـەوی ژوورێکـی بچووکـی بـەدی کـرد کـە تاشـە بەردێکـی گـەورە لەناوەڕاسـتی دانرابـوو، لـەوە دەچـوو جێـگای نوێژکـردن بـێ. تەزبیحێکـی درێـژو تـۆزێ خورمـاش لەسـووچێکدا بـەدی دەکـرا.

شێخ دەستی مەولەوی گرت و لەسەر تاشە بەردەکە ڕوونیشاند و هاتە گۆ.

- ئێـرە جێـگای چلـە کێشـانە، سـاڵانە چـل ڕۆژ تیایـدا دەمێنمـەوە بـۆ پەرسـتش، دوور لەغەوغـای مرۆڤـەکان.

+ وەلـێ ئێـرە زۆر تەنگـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەسـت بەهەوایەکـی فێنـک و شـادی هێنـەر دەکـەم، ئەمـە زۆر سـەیرە !

- هیـچ چشـتێ سـەیر نییـە ئەگـەر خـودا بیـەوێ کـوڕم، تـۆ دیـاری پـێ بـدە ئەویـش دیـاری گەورەتـرت پـێ دەدا.

+ چۆن دیاری پێ بدەم؟

- دیـاری بـدەن خۆشەویسـت دەبـن. ئایـا ئـەو ڕۆژەی دیاریـەک بـۆ کەسـێکی خۆشەویسـت دەبـەی، هەسـت ناکـەی تـۆی لـەلا شـیرینتر دەبـێ؟

+ بێگومان وایە قوربان.

- دەی ئـەو دەمانـەی یـادی خـودا دەکـەی، ئـەو تـۆی لـەلا شـیرینتر و شـیرینتر دەبـێ. وەلـێ دەمـەوێ ئـەوەت پـێ بێـژم کـە هێنـدە بیـر مەکـەرەوە لەجـۆری دیاریـەکان، مەرج نییـە دیاریەکـەت زۆر گـەورەو بایەخـدار بـێ، واتـا ئەمـە ئەسـڵەکە نییـە، بەڵکو ئەسـڵ ئەوەیـە کەتـۆ ئـەوت لەیـاد بـووە، خـودی ئـەم لەیـاد بوونـە لەدیاریەکـە بەنـرخ تـرە.

هەنـدێ جـار شـکولاتەیەک لەگیرفانتایـە و چەنـد ڕۆژ دڵـت نایـە بیخـۆی، تـا دەگـەی بـەو کەسـەی کـە دەتهـەوێ پێـی بـدەی، خـودی شـکولاتەکە ئەسـڵ نییـە، خـودی ئـەم لەیـاد بـوون و خۆشەویسـتیە ئەسـڵە.

خەمبـارم کەدەبینـم کەسـانێک مناڵەکانیـان دەپارێـزن لەنەخۆشـی و برسـیەتی و تینوویەتـی، هەمـوو هۆکارێکـی مانەوەیـان بـۆ دابیـن دەکـەن، وەلـێ داخەکـەم نایـان

پارێـزن تـا تووشـی نەزانـی نەبـن !.

بـێ ئـاگان لـەوەی چەندیـن دەردی گەورەتـر پێیانـەوە لـکاوە. کەوتوونەتـە نێـو چاڵـی پـڕ لـە گـڕو ئەوانیـش بـۆ خامـۆش بوونـەوەی خەریکـن نەوتـی تـێ دەکـەن. شـوکری خـودا بکـە کـە وەکـو ئـەوان نییـت.

+ سوپاس بۆ خودا، شەرمەزاری ئەوم.

دڵـت تەنـگ مەکـە گـەر لـەلای هەندێـک ڕێـزت نەگیـراو گوتەکانـت قەبـووڵ نەکـرا، چـون مرۆڤـەکان تێڕوانیـن و ڕەوشـتیان جیایـە. دەکـرێ لای هێنـدێ تەقـوادار و لای هێنـدێ فاسـق بـی ، چ کێشـەی تیایـە، بـا بـازێ بەفریشـتە بتبینـن و بازێکیـش بـە ئیبلیـس، گرنـگ ڕازی بوونـی مەعشـوقە.

مرۆڤـەکان ئـەو دەم لـەلات ڕوودەنیشـن کـە چشـتێکیان لێـت دەسـت کـەوێ، بێنـە لای تـۆ چـی بکـەن؟

بـا ئـــەوان هـــێندێ بەفـــاسـق ، هێندێ بتبینن بـەبـــاش
گەر لەلای وی نەتبوو سەنگێ هەر هەمووی دەڕوا بەلاش

گـەر دەتهـەوێ گرنگـی کەسـێ بزانـی بڵـێ گـەر ئـەو لەژیانـم نەبووایـە چـی دەگـۆڕا؟ بزانـە هیـچ گۆڕانکاریـەک بەنەبوونـی ئـەو دێتـە دی؟

+ بۆچی ئەوانی دیکە لێمان حاڵی نابن قوربان بۆچی؟

- کـوڕی خـۆم، کاتـێ لەقـەوارەی[371] خـۆی پـتر خۆشەویسـتی بـە مرۆڤـەکان دەبەخشـی بـێ ئـاگای کـە لەخۆتیـان دوور دەخـەی. خـراپ دڵشـکاو دەبـی، چـون خۆشەویسـتی دەرمانێکـەو نابـێ لەئەنـدازە زێدەتـر بەنەخـۆش بـدرێ.

بزانـە کـە ئـەو چشـتانەی لای تـۆ بایەخـدار و جوانـن مـەرج نییـە لای ئەوانـی دی وابـن، بابەتـی ڕۆحـی مـرۆی ڕۆحـی لێـی حاڵیـە و لای ئەوانـی دی گیـزە گیـزە.

تەنانـەت عاشـقانیش هەمـوو لەیـەک ناگـەن. ئەوانـەی سـەرەتان ناتوانـن لەپلـە بـەرزەکان بگـەن، دکتـۆر سـەر دەرنـاکا لەکاروبـاری موهەندیس، بەپێچەوانـەوەش. تەنانـەت ئەگـەر هەردووکیـان دکتۆریـش بـن مـەرج نییـە لێـک حاڵـی بـن، لەوەیـە

٣٧١- قەوارە: قەبارە.

یەکێکیان دکتۆری ددان بێ و یەکێکیان هی چاو. تەنانەت ئەگەر هەردوو دکتۆری چاو بن، دیسان مەرج نییە لەیەک حاڵی بن، چون دەکرێ یەکێکیان پسپۆڕ تربێ لەوەکەی دی.

جا ئەو دەمەی حاڵی نابن بەناچاری لێت ڕادەکەن، کەسێک کەچشتی مەزنی نەدیوە هەمیشە بەکەم ڕازییە.

لەبیرمە ئەو کاتەی تازە لاو بووم لەماڵەوە دەیان گوت خۆزگە وەک فڵان بووایت، وەلێ ئەو دەمەی دەچوومە ماڵی فڵان، دایک و باوکی خۆزگەیان بەمن دەخواست.

شێخ جەلالەدین بۆ تاوێ بێدەنگ بوو، لەم ژێر زەمینە خامۆش و تاریکەدا هیچ چشتێ نەدەبیسترا. لەپڕدا چاوانی خستە سەر مەولەوی، هەستی کرد چاوە ڕەشەکانی وەکوتیشکی ڕۆژ جەستەی گەرم دادێنا و وێنەی چەخماخە[٣٧٢] دەیسووتاند. مەولەوی لەبەر بەهێزی تیشکەکەی چاوەکانی داگرتن و نووقاندی. وەلێ ئارەقە بەهەموو گیانیدا ڕێی دەکرد، وەکو ئەوەی کەسێ دەست لەنێو دڵت وەربدا و بەئارەزووی خۆی هەڵی سووڕێنێ، بەرگەی تیشکەکەی نەگرت و کەوت بەزەویدا.

بینی لەنێو باخێکی لێوانلێو لەگوڵی سپی و سوور، کۆمەڵێ مرۆی جەستە نوورین بەرەو ڕووی دەهاتن و پێشوازیان لێ دەکرد. هەموو تێکڕا دەیان گوت بەخێرهاتی مەولەوی، سوپاس بۆ خودا مردی تاوەکو ئەم ژینە ببینی، ئێستا واز لەچاوی دونیا بێنەو بەچاوی دڵ بڕوانە.

ئەو دەمەی چاوی بەرزەوە کرد لەیەکێ لەژوورەکان لەسەر چارپایەک[٣٧٣] ڕاکشابوو، وەلێ ئەوە لەدایک بوونێکی دیکە بوو، چون سیڕاج هیچ وجوودێکی نەما.

ژیانی کۆلێژ کۆتایی هات و لەیەکێک لەقوتابخانە ناوەندیەکانی شار دەستی بەگوتنەوەی وانەی عەڕەبی و ئاین کرد، لەهەمان کاتدا مامۆستا عومەر مێزەری ڕێزو شکۆی خستە سەری و مۆڵەتی مەلایەتی پێ بەخشی.

ئێستا مەولەوی خاوەنی سێ منداڵە بەنێوی (ئارا و ئانا و ئاریان )، خاتوو ڕویای خێزانیشی بەکاری درووماناەوە خەریکە. لەگەڕەکی ئاشنای شاری ئەختەر ژیان

٣٧٢- چەخماخە: بروسک.

٣٧٣- چارپا: قەرەوێڵە.

دەگوزەرێنن، بەم دواییانە مام سلێمان و خاتوو ڕەحمەی دایکیشی هێنابوویە شارو لەگەڵ خۆی دەیژیاندن، وەلێ دەردە پیری زوو ئەوانی بردەوە.

ڕۆژێک لەو دەمەی سیراجی مەولەوی لەنێو مزگەوت خەریکی شیکردنەوەی وانەیەک بوو بۆ فێرخوازانی، تازە لاوێک سەلامی کردو گوتەکانی پێ بڕی.

+ بفەرموو کوڕم، گەر پێت خۆشە ڕووبنیشە.

- قوربان لەڕاستیدا بۆ ئەوە هاتووم لەخزمەت جەنابت بخوێنم، ئەڵبەتە گەر وەرم گرن.

+ ناوت چی یە و لەپۆلی چەند دەخوێنی؟

- ناوم (ڕەنج) ە، پۆلی سێی ناوەندیم.

+ ئەوە چاوانت سەوزن؟

- بەڵێ ئوستاد گیان.

+ دەبێ ببووری، ئەمە یەکێکە لەو ڕەنگانەی تۆزێ دوژمنایەتی لەگەڵ مندا هەیە، خۆ دڵگران نابی؟

- ئاخر ئەمە خۆ دەستێکی منی تیا نییە ! ئایا تۆ لێی لە ڕقی یاخود ئەو؟

+ سەرەتا ئەو جەنگەکەی هەڵگیرساند، دەنا من چ کێشەیەکم لەگەڵیدا نەبوو.

- دەی قوربان ئەمە وێنەیەک نییە بەدڵی خۆم ڕەنگەکەی بگۆڕم، چارەسەر چی یە؟

+ چارەسەر ئەوەیە، هەرکاتێ هاتی بۆلام چاوەکانت بنووقێنی، دەیکەی؟

- گەر دەتهەوێ وەرم نەگری ڕاستەوخۆ پێم بێژە، خۆ ناتوانم بەچاو نووقاوی هیچ بخوێنم.

+ شۆخیم لەگەڵ کردی کوڕم، ڕووبنیشە، تۆ یەکێک دەبی لە قوتابیە هەرە باش و هاوڕێی کوڕە تاقانەکەم..... بەخێرهاتی.



## دۆزینەوەی نیوەکەی دی

ڕەنج کۆتایی بە یاداشتە خەمهێنەکە هێنا، وەلێ ئەم دیمەنەی دوایی خستیە زەردەکەنیەکی درێژ، لەگەڵ ئەوەشدا دۆزینەوەی پاژی[٣٧٤] سەرەتای یاداشتەکە لە کەڵکەڵەی دابوو[٣٧٥].

وەلێ دەبێ چۆن بتوانێ پاژی سەرەتای باسەکە دەست خا، خۆ ئەوەی پێی درابوو هەر ئەوەندە بوو، سەرەڕای ئەوەش مامۆستا لەژیان نەمابوو.

هێندێ جار خەیاڵی دەکرد ماڵی مامۆستا بدۆزێتەوەو دەربارەی یاداشتەکە لێیان بپرسێ، لێ ئەمەش بۆ ڕەنج کردەیەکی دژوار بوو، چون ئەو مرۆیەکی یەکجار شەرمن بوو.

ئەو شەوە سەرەڕای ماندوو بوونی خەو لە دیەی تۆرابوو. بیری لەمامۆستاو هەموو ئەو ڕۆژانەی لەگەڵی بوو دەکردەوە. ئەسرینەکانی جاری دەبوون و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: چی دەبوو هەموو ئەو چشتانەم پێشووتر زانیبا، ئەو دەمانەی

---

٣٧٤- پاژ: بەش ، جوزئێک.

٣٧٥- کەڵکەڵە: خولیا کەوتنە سەر بۆ شتێک.

مامۆستا لە ئاتەکم بوو هەستم بەمەزنی و شکۆی ئەو نەدەکرد، لێ ئێستا کەدەزانم ئەو کەسێکی چلۆنە بوونێکی نەماوە.

نا نا نەخێر مامۆستا نامرێ، ئەو وا لە ئاتەکمە، لەخەیاڵ و دڵم دایە، بۆ تاوێ لێم دانابڕێ، ئەوەتا یاداشتەکانی لەنێو دەستم دایەو دەیان خوێنمەوە.

گەر پێشووتر مامۆستا یەک کەس بووبێ ئێستا مرۆگەلێکە، چون دەیان کەس لەخزمەتی ئەودا پەروەردە بوون. گەر هەریەکێ لەوان خووخدەیەکی ئەوی هەڵگرتبێ کەواتە هەموو خووخدەکانی ئەو زیندوون، لێ لەبەرگ و جەستەی جودا جودادا.

چەند ڕۆژێ دوای خوێندنەوەی یاداشتەکە، خاتوو هاجەرە ڕەنجی نارده بازاڕ بۆ هەندێ پێویستی ماڵ. ئەو دەمەی پێویستیەکانی سەند هەستی بەماندووبوون کردو لەیەکێ لەساردەمەنیەکان ڕوونیشت و وازی لەساردی بوو.

لەم بەرەوە چاوی کەوتە سەر ئافرەتێ کە خەریکی کڕینی شتوومەک بوو، لێ گەنجێ لەدەوریدا هاتووچۆی بوو، دەتگوت نیازێکی خراپی هەیە، ئەمما ئافرەتەکە بێ ئاگابوو لێی.

ئافرەتەکە پشتی لەڕەنج بوو، وەلێ لەکەسێکی گەنج نەدەچوو کە ئەم کابرایە بەمەبەستی دڵداری تێی بڕوانێ.

هەر ئەوەندەی جانتاکەی لەشان کردەوە بابای گەنج هەڵمەتی بۆ بردو پڕی دایەو سرک و تیژ بۆی دەرچوو.

ڕەنج کەئەمەی بینی خۆی بۆ نەگیراو بەخێراییەکی لەڕادە بەدەر تێی تەقاند بەدوایدا. لە نێوەندی جادەکە لەدواوە ڕا خۆی بەدزەکە داداو بەری دایەوە، دەستی بۆ جانتاکە برد وەلێ بابای دز بەهێزەوە ڕای کێشاو هەڵسایەوە. دووبارە ڕەنج دوای کەوتەوە، لێ هەر ئەوەندەی زانی ئۆتۆمبێلێک بەهێزێکی زۆر خۆی پێدا کێشاو لەهۆشی خست.

چەند خێرۆمەندێک خێرا ڕەنجیان خستە نێو ئۆتۆمبێل و بەرەو نەخۆشخانە وەڕێ کەوتن.

دوای ئەوەی گیرفانی گەڕان مۆبایلێکی کۆنیان دۆزیەوە و خاتوو هاجەرەیان ئاگادار کردەوە لەم باسە.

دکتۆرەکان خێرا بەرەو ژووری نەشتەرگەری کێشیان کرد، یەکێ لەوان لەهارژنی دەدا[376] ئەم نەخۆشە سپڵی تەقیوەو خوێن بەربوونی هەیە، پێویستی بەسێ بوتڵ خوێنە، گەر خێرا بۆی نەهێندرێ لەوەیە ئەگەری خراپی هەبێ، جگە لەوەش دوو پەراسووی شکاوە.

خۆشبەختانە لەنەخۆشخانەکە دوو بوتڵیان لەم جۆرە خوێنەی ڕەنج دەست کەوت، وەلێ دانەیەکی دیکەشی گەرەک بوو.

ئارا لەبەردەم ژووری نەشتەرگەریەکە بەسەرسامیەوە وەستابوو، چون ئەم شوێنانەی نەدی بوو هێندێ جار هەستی بەدڵ تێکچوون دەکردو لەسەر کورسیەکان ڕوودەنیشت.

ئەو دەمەی گوێی لە ژاوە ژاوی دکتۆرەکان بوو کە نەخۆشەکە خوێنی گەرەکە، ترسەکەی وەلانا و خێرا چوو بۆ پشکنینی خوێنی.

کەیفی سازبوو ئەو دەمەی بۆی دەرکەوت خوێنەکەی بۆ ئەم لاوە نەخۆشە دەگونجێ و دەتوانێ کۆمەکی بکا.

لەو ساتەی ئارا خوێنی لێ وەردەگیرا هاوار هاواری ئافرەتێکی ژنەوت کە دەیگوت: هاوار خودایە چی بەسەر کوڕە تاقانەکەم دا هاتووە، چی بەسەر تازە خونچەی ماڵەکەمدا هاتووە، نازدارە چاو سەوزەکەم هەڵسەوە، با جارێکی دیکە دەست بەسەر قژە هەتاویەکەت دا بێنم، تاقە دیاری هاوسەری کۆچ کردووم تۆی، بەخوا یەک دەقەش ناتوانم بێ تۆ ژیان بگوزەرێنم ڕەنج.

گریانی ئەم ئافرەتە ئاگری لەجەرگی ئارا بەر دەدا، بەتایبەت کە زانی ئەم لاوەش وەکو ئەو تاقانەو بێ باوکە. وەلێ ئەو دەمەی ناوی ڕەنجی بیست لەشوێنی خۆی ڕاست بوویەوەو لە هارژنی دا ( ڕاااااااانج )، بەشێوازێک پەرستارەکان وایان زانی چشتێک ڕووی داوەو دوو سێ دانەیان خۆیان بەژوورەکەی ئارا دادا.

- چی بووە کاکە، ئەم هاوارەت لە چی یە، چشتێک ڕووی داوە؟

+ ڕەنج، ڕەنج، ڕەنجم دۆزیەوە، تکایە ئاگاداری بن، ئەو پێویستە بژی، ئەو نیوە تەواو نەکراوەکەی منی لایە، دڵنیام لای ئەوە، بەڵێ دڵنیام.

---

٣٧٦- هارژن: هاوار.

- هێـی بـرا، ئێـرە نەخۆشـخانەیە و نەخۆشـەکان بێـزار مەکـە تکایـە. گـەر حاڵەتێکـی نەخـوازراو ڕوویـدا، ئەینـا بـۆت نییـە ئـاوا لـە هـارژن بـدەی.

+ باشـە تکایە ببوورن، مەبەسـتم نەبوو کەس بێزار بکەم، وەلێ زۆر بەپەرۆشـم بۆی زۆر.

ئـەو دەمـەی خوێنەکـەی ئارایـان بـرد لەهەسـتێکی سـەیر دابـوو کـە بیـری دەکـردەوە خوێنـی ئـەو ئاوێتـەی[377] جەسـتەی چـاو سـەوزێک دەبـێ. لەبـەر خۆیـەوە دەیگـوت ئایـا تـۆ بلێـی ئەویـش ببێتـە پاژێـک لەمـن یاخـود نـا. دەی ئەگـەر ئەمـە هەمـان ئـەو ڕەنجـە بـێ کەباوکـم لێـی دەدوا کەواتـە هەمـوو چـاو سـەوزێک شـووم نییـن، بگـرە ئەویـش وەکـو چاوەکانـی دیکـە تەنیـا ڕەنگێکـەو بـەس.

هێنـدێ جاریـش هەسـتی بەسـەر سـووڕان دەکـردو لەسـەر چارپاکـەی بەبـێ دەنگـی ڕوودەنیشـت.

نەشـتەرگەریەکەی ڕەنـج بەسـەرکەوتوویی کۆتـا هـات و دوای ماوەیـەک وەهـۆش کەوتـەوە. دەم نـا دەمێکیـش خاتـوو ڕویـا تێلـی بـۆ ئـارا دەکـردو لێـی دەپرسـی، نەبـادا چشـتێکی گـەرەک بـێ.

ئـەو دەمـەی ڕەنـج دیـەی هەڵهێنـا دایکـی و سـاریای خوشـکی و خاڵـۆ کامـەران و تـازە لاوێکـی بەسـەر خۆیـەوە بینـی کـە نـەی دەناسـی، لـێ هیچـی بـۆ نەگوتـرا.

خاتـوو هاجـەرە لەخۆشـی وەخەبـەر هاتنـەوەی ڕەنـج، ئەسریـن لەچاوانـی قەراریـان نەدەگـرت، ئـاراش بەچـاوی تـەڕەوە کەوتـە گـۆ لەگەڵیـدا: سوپاسـت دەکـەم ڕەنـج، گەلـێ قەرزاربـاری تۆیـن کـە لەهەوڵـی یارمەتـی دانـی دایکـم کەوتوویتـە ئێرە. سـوێند بەخـوا لەبـەر خەمـی تـۆ جانتاکەمـان بیـر نەمـاوە، زوو هەڵسـەوە بـرا، زوو هەڵسـەوە، گەلـێ چشـت هـەن لەگـەڵ یـەک تاوتوێـی بکەیـن.

ئەمما ڕەنج چاوەکانی دەنووقاندن و لەبەر ئێشەکەی نەیدەویست هیچ بژنەوێ.

خاتـوو هاجـەرە کـە سەروسـەکوتی ئـارای بینـی زەرد هەڵگەڕاوە، بـەزۆر ناردیـەوە ماڵێ و گەلـێ سوپاسـی کـرد لەسـەر خوێـن بەخشـینەکە، وە گوتیشـی تـا ڕەنـج چاتـر دەبـێ و دێتـەوە گـۆ لازم نییـە بێیتـە لای، چـون تـۆش پێویسـتت بەپشـوویەکی بـاش هەیە.

---

٣٧٧- ئاوێتە: تێکەڵ.




ئـارا بەخەمباریــەوە گەڕایــەوە ماڵــێ، هێنــدە زەردو ژاکاو بــوو بــوو هــەر زوو خــۆی خزانــدە ژێــر جێگاکــەی، دەتگــوت چ خوێنــی لەلاشــەدا نەمــاوە.

خاتــوو ڕویـا بەبینینـی تاقانەکـەی لەکونجێکـی ناندینەکـە کـەوت و لەپڕمـەی گریانـی دا، وەلـێ نەیهێشـت مناڵـەکان چاویـان لـە ئەسرینەکانـی بـێ.

لەبــەر ئــەوەی بابــای دز لەکامێــرای چاودێــری وێنــەی گیرابــوو دوای چەنــد ڕۆژێ دەسـگیرکرا و جانتاکەیـان بـۆ گەڕێنرایـەوە، کەبـازێ پـارەو زێـڕی خاتوو ڕویـای تیابوو.

ئـارا جگـە لەهەڵسـانەوەی ڕەنـج چشـتێکی دیکـە لـە کەڵکەڵـەی دانەبـوو. نـاوە نـاوە تێلـی بـۆ دایکـی ڕەنـج دەکـردو ڕۆژەکانـی دەژمـارد بـۆ هەڵسـانەوەی ئـەم لاوە.

دوای مــوددێ لەگــەڵ دایکــی و خوشــکەکانی بــەرەو گەڕەکــی ســوورتاو، ماڵــی خاتــوو هاجــەرە هەنگاویــان هەڵگــرت وەکــو وەفایــەک بــۆ ئــەم لاوەی لەبــەر ئــەوان تووشــی ســەختی هاتــووە.

ڕەنـج حاڵـی چاتـر ببـوو، لەسـەر جێگاکـەی پشـتی دابوویـە سـەرینێک و قاچەکانـی درێــژ کردبــوو ، لەگــەڵ ئــارادا تێــک ڕامابــوون، لەپــڕدا ئــارا بەسەرسـامیەوە گوتــی:

+ ئەوە تۆ نەبووی ئەو ڕۆژە لە پاڕکەکەدا خۆت پیا کێشام؟

- ئــەوە تــۆی چــاوڕەش؟ خەریــک بــوو ئــەو ڕۆژە تووشــی هەڵەیەکــم بکــەی، لێــرەش شــەرم پــێ دەفرۆشــی؟

ئـارا بەپێکەنینــەوە: گــەر خوێنــی مــن لەنێــو دەمــارت نەبــا دەمزانــی چیــم دەکــرد، لــێ ئێســتا هیچــم لەگەڵــت پــێ ناکــرێ.

- گەر دەتوانی بیبەوە، مەگەر تۆ نەبووی ئەو ڕۆژە لەنەخۆشخانە بۆم دەگریای.

خاتــوو هاجــەرە بەخەنــدەوە هەڵــی دایــێ: کوڕینــە یەکــتر ناســین کــەی ئاوایــە، ئــەوە لەگــەڵ خاتــوو ڕویــا جێتــان دێڵیــن و دەچینــە ئــەو دیــو، وەلــێ شــەڕ نەکــەن تــا دێینــەوە.

+ ڕەنج، ئەرێ تۆ باوکی من دەناسی، پێم بێژە؟

- جـا مـن تـۆ دەناسـم تـا بزانـم باوکـت کێیـە، هـەر ئەوەنـدەی دەزانـم ئـەو ڕۆژە خەریک بــوو لێم بــدەی.

+ واز لەو ڕۆژە بێنە، من ئارام، کوڕی مامۆستا سیڕاج، گەر تۆ باوکی من بناسی لەوەیە پاژەکەی تری یاداشتەکە لای تۆ بێ.

ڕەنج کەئەمەی ژنەوت خەریک بوو نەخۆشیەکەی لەیاد بکاو لە هارژنێ بدا. وەلێ خێرا دەستی خستە سەر دەمی و ئەو ڕۆژەی مامۆستای بیر کەوتەوە کە پێی گوت تۆ یەکێک دەبی لەقوتابیە هەرە باش و هاوڕێی کوڕە تاقانەکەم.

بەگریانەوە هاتە گۆ: بەڕاست تۆ کوڕی مامۆستای ! ئای خودایە شانازیە بۆ من لەسەر خێزانی مامۆستا وام لێهاتووە و خوێنی کوڕە تاقانەکەی لەدەمارم دایە. یاڕەبی چۆن نەمزانی تۆ کوڕی ئەوی، کەواتە دەبێ پاژی سەرەتای یاداشتەکە لای تۆبێ وانییە؟

+ دەی دەبێ کۆتاییەکەشی لای تۆبێ ڕەنج، وەلێ تۆ چۆن باوکم دەناسی، بێژە؟

- ئەو فێرکارو دڵسۆزم بوو، مامۆستاو ڕێ نیشاندەرم بوو، ساڵێک پتر لەخزمەتی دابووم.

+ من بازێ لەقوتابیەکانی باوکمم دەناسی، لێ هەرگیز تۆم نەبینیوە !

- سەیرە کەمامۆستا هەرگیز باسی تۆی بۆ نەکردووم ! وەلێ دەیزانی ئێمە بەیەک دەگەین ، وادیارە هەردووکمانی بۆ ئەم دیدارەی ئێستا ئامادە کردووە.

+ لەیاداشتەکە ناوی تۆی هێناوەو ئاماژەی بە هاوڕێیەتیمان داوە ڕەنج. ئەو دوای مەرگیشی ئێمەی لە خەیاڵەو دەیهەوێ دوو هاوڕێی دڵسۆزی یەکتری بین.

- ئێستا دەزانم ئەو ڕۆژە بۆ هێندە قەڵس بووی لەچاوەکانم.

+ چاوی تۆ جوانترینە ڕەنج، هاوڕێ دڵسۆزەکەم. ئەو ڕۆژە ناڕەحەتی بابەتێکی دیکە بووم و شەرم بەتۆ فرۆشت، سەناریام دۆزیەوە، ئەو کەسەی باوکمی ئازار دابوو.

- ئێ چیت کرد، خۆ لەگەڵیدا نەکەوتیە دەمەقاڵێ؟

+ ئەو مامۆستامانە دەتوانم چی لەگەڵ بکەم. ئەو ڕۆژە سەیری پەڕاوی پرسیارەکانم کردو لەژێرەوە بەنێوی باوکی ناسیمەوە. لەژووری مامۆستاکان ڕوونیشتبوو، کەبانگم کرد هاتە دەرێ.

گوتم پرسیارێکم لێت هەیەو بەرەو باخەکە کێشم کرد، لەوێ هێندەی توانیم بە دڵ ڕەق و بێ بەزەیی ناوم برد، تا ئەسرین لەچاوەکانی هاتنە خوارێ.

لەڕاستیدا بەزەییم پێیدا هاتەوە ڕەنج، زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە. ئەو دەمەی زانی من کوڕی مامۆستام هیچی پێ نەگوتم، لەچاوەکانمی دەڕوانی و بە دیەی تەڕەوە دەیگوت: کاشکی[٣٧٨] تۆ کوڕی من بووایت، کاشکی کەسێ لەسەر منیش ئاوا بەدەنگ بووایە. من هیچ منالێکم نییە و هاوسەرەکەم لەبەر قومارو کردەی بەدڕەوشتی بێ ئاگایە لێم و ئازار دەچێژم بەدەستی.

ئەو کاتە داوای لێبوردنم لێ کردو بۆ تاوێ منیش لەگەڵیدا دەستم بەگریان کرد.

ئەو ئایەتەم بیر کەوتەوە کەباوکم هەموو جارێ دەیخوێندەوە ( لەوەیە شتێکتان پێ ناخۆش بێ کەچی خێر لەوە دابێ، وە لەوەیە شتێکتان پێ خۆش بێ کەچی شەڕ لەوە دابێ، خودا دەزانێ و ئێوە نازانن )[٣٧٩].

- منیش لەخوێندنەوەی یاداشتەکە شتێکی زۆر گرنگ فێربووم، کەمافی خۆیەتی بەئاوی زێڕ نەقشدار بکرێ.

+ بێژە هاوڕێ.

- عیشق شتێکە و ئارەزوو شتێکی دی، ئەویان بەرەو خودا کێشت دەکا و ئەویان بەرەو دونیا.

## تەواو.........

---

٣٧٨- کاشکی: خۆزگە.

٣٧٩- سوورەتی بەقەڕە ، ئایەتی ٢١٦.

